# مێژووی ئەدەبیاتی جیهان

## ئەدەبیاتی کۆن و سەدەکانی ناڤین

**بەرگی یەکەم**

**بوکنەر ب- تراویك**

ت: عربعلي رضائي

وەرگێڕانی لە فارسییەوە

حەمە کەریم عارف

**هەولێر - ۲۰۰۸**

● **مێژووی ئەدەبیاتی جیهان (بەرگی یەکەم)**

● نووسینی: بوکنەر ب- تراویك

● وەرگێڕانی: حەمە کەریم عارف

● نەخشەسازی ناوەوە: طـه حسین

● بەرگ: هۆگر صدیق

● ژمارەی سپاردن: (١٨٤٠)

● نرخ: ١٠٠٠٠ دینار (دوو بەرگ)

● چاپی یەکەم : ٢٠٠٨

● تیراژ: ١٠٠٠ دانە

● چاپخانە: چاپخانەی خانی (دهۆك)

زنجیرەی کتێب (٣١٠)





ماڵپەڕ: www.mukiryani.com

ئیمەیل: info@mukiryani.com

# پێرست

## بەرگی یەکەم:
## ئەدەبیاتی کۆن و سەدەکانی ناڤین

### بەشی یەکەم:

**بەشی چوارەم:**



**بەشی پێنجەم:**

# وتەیەک

**خوێنەری هێژا:**

ئەم کتێبە لە بنچینەدا کتێبێکی ئینگلیزی دوو بەرگییە بەناوی (ئەدەبیاتی جیهان) و لەلایەن بوکنەر ب- تراویك-ەوە نووسراوە، کە مامۆستای زمان و ئەدەبیاتی ئینگلیزییە لە زانکۆی ئالاباما‌ی ئەمریکا. جگە لەم کتێبە زۆر کتێبی دیکەی لە بواری ئەدەبیاتدا نووسیوە کە زۆریان لە شێوەی سەرچاوە و کتێبی دەرسیدان.

نووسەر لەم کتێبەدا پتر بایەخی بەو نووسەر و شاعیر و ئەدیبانە داوە کە زۆرترین و قوولترین کاریگەرییان بەسەر ئەدەبیاتی ولاتی خۆیان و جیهانەوە هەبووە و بەرهەمەکانیان بووەتە مایەی دەولەمەند کردنی کەلەپووری ئەدەبیات و کەلتووری جیهانی.

وەرگێڕی فارسیی ئەم کتێبە رێزدار (عربعلی رچائی) بەشی ئەدەبیاتی ئەمریکا و ئینگلیز، و براوەکانی خەلاتی نۆبلی ئەدەبیاتی سالانی (١٩٠١- ١٩٩٣)ی بۆ کتێبەکە زیاد کردووە. بەمجۆرە کتێبی ئەدەبیاتی جیهان بووە بە سێ کتێبی تەواوکەر و تەواوکراوی یەکتری:

کتێبی یەکەم لە ژێر سەر ناوی: مێژووی ئەدەبیاتی جیهان لە کۆنەوە تا سەدەکانی ناڤینە، کە ئەدەبیاتی رۆژهەلاتی کۆن، رۆمی کۆن، ئەدەبیاتی رۆژهەلات و رۆژئاوای سەدەکانی ناڤین تاوتوێ دەکات.

کتێبی دووەم لە ژێر سەر ناوی: مێژووی ئەدەبیاتی جیهان لە رۆژگاری رێنیسانسەوە تا رۆژگاری ئێستایە، کە لە بەشی یەکەمدا ئەدەبیاتی ئیتالیا و فەرەنسا و ئەسپانیا شرۆڤە دەکات. لە بەشی دووەمدا ئەدەبیاتی نوێی ئەلمان و رووسیا راڤە دەکات.

کتێبی سێیەم: لە ژێر سەر ناوی: مێژووی ئەدەبیاتی ئینگلیزی زمانە، کە ئەدەبیاتی ئەمریکا و ئینگلیز لە سەرەتاوە تا رۆژگاری ئەمرۆ راڤە و شرۆڤە دەکات.

**خوێنەری هێژا...**

وەختێ بەندە لە خوێندنەوەی ئەم کتێبە بوومەوە، سەیرم کرد گەشتێکی پێنج هەزار سالەیە بە دنیای ئەدەبیاتی جیهاندا، لە ئەدەبیاتی میسری کۆنەوە پێیدا هاتووە تا دەگاتە نیوەی دووەمی سەدەی بیستەم و ئەم ماوە دوور و درێژە بەسەر سێ قۆناغدا دابەش کراوە:

١- قۆناغی کۆن
٢- قۆناغی سەدەکانی ناڤین
٣- قۆناغی تازە...

هاماج و زەمینەی مێژوویی و کەلتووری و ژیان و بەرهەم و هەڵسەنگاندن و لێکدانەوە و شیکردنەوەی بەرهەمی نووسەران و شاعیران و شانۆ نامەنووسانی هەر قۆناغێك بە جوانی و پوختەیی باسکراوە، واتە ئەم کتێبە یەکێکە لە سەرچاوە هەرە دەوڵەمەندەکانی بواری خۆی و پێویستە و دەبێ لە کتێبخانەی هەر میللەتێکدا هەبێ... ما بیربکەوە، چۆنە بەندەش قولّی لێ هەڵماڵم و بییکەم بە کوردی و بییکەم بە سەرچاوەیەکی کتێبخانەی کەم سەرچاوەی کوردی و بیخەمە خزمەتی ئەهلی ئەدەب و ئەدەبدۆستانی کوردەوە! بۆ نەء ! ئەدی کوی چاپدەکەی هەی خۆڵی بسەر؟! روو لە کێ دەنەی.. بە هەر حاڵ لە دڵەوە بڕیاری خۆمدا. پەیوەندییەکم بە برای بەڕێزم مامۆستا (شوان بابە)وە کرد، کە ئەو زەحمەتی کێشابوو و دەقە فارسییەکەی بۆ پەیدا کردبووم، دەست لە کتێبەکە بشوات، چونکە بەندە لێبڕاوم بییکەم بە کوردی.. هەڵبەتە زۆر بەخۆشحاڵییەوە کتێبەکەی پێشکەش کردم و گەلەکی هاندام کە تا زووە وەری بگێڕم.. ئەوجا پەیوەندیم بە برای خۆشەویستم کاك (ئاسۆ کەریم)ەوە کرد بۆ چاپکردنی، ئەویش بێ چەندوچوون وەعدی دامێ و پشتیوانییەکی گەرمی لێکردم. تۆخەییی.. ئیدی دەست لە دەست و هێز لە خوا ملم بەم سەفەرە دژوار و درێژەوە نا و قۆناغی یەکەمی مێژووی ئەدەبیاتی جیهانم بڕی و وا (مێژووی ئەدەبیاتی کۆن و سەدەکانی ناڤین)م بە دیاری بۆ هێناون، دیارە دیاری شوانە، و دیاری شوانیش یاشنگە یا ئاڵەکۆك.. هەڵبەتە دوو کتێبەکەی دیکەش بەدەستەوەن و خوا یار بێ و تەمەن مەودا بدات بەو زووانە چاپ و بڵاودەبنەوە..

جا گەلۆ من هەر ئەوەندەم لێوەشاوەتەوە و ئیدی کورد گوتەنی رێ بەڕاست و بەد بەخوا..

لە کۆتایی دا وێرای سوپاسی بێ پایانم بۆ دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی موکریانی، لە ناخی دڵەوە رێز و سوپاسم بۆ هەردووك برای نێوبراو دووبارە دەکەمەوە و هەر بەخوردارین.

حەمە کەریم عارف
کەرکووك
٢٠٠٧/٣/١١

# بەشی یەکەم

## ئەدەبیاتی رۆژهەڵاتی کۆن

## ئەدەبیاتی میسری و ئاشووری- بابلی

### ئـ- ئەدەبیاتی میسری

کۆنترین ئەدەبیاتی جیهان دەدرێتە پاڵ خەڵکانێك کە لەدەڤەری بە پیت و بەرەکەتی کەنارەکانی نیل و دیجلە و فورات ئاکنجی بوون. میسرییەکان، ئاشوورییەکان، بابلییەکان و ئێرانییەکان، هەر هەموویان لە ئەدەبیاتی سەردەمی کۆندا بەشداریی بایەخداریان هەبووە.

**پێشینەیەکی مێژوویی:**

رەگی مەدەنییەت و شارستانییەتی میسری دەچێتەوەسەر رۆژگارانی کۆن، هەندێك کەس پێیانوایە ئەم شارستانییەتە کۆنترین شارستانییەتی جیهانە[1]، پێنج هەزارساڵ پێش زایین لە قۆناغێکی پێشکەوتوودا بووە.

بەپێی دۆزینەوەکانی ئارکولۆژی و سەدان بەردەنووس ئەوە دەردەکەوێت کە میسرییانی کۆن، تەرلاسازی، پەیکەرسازی، نیگارکێشی، بیرکاری، ئایین، حکوومەت و هونەری نووسەرایەتییان گەیاندبووە پلەیەکی بەرزی پێشکەوتن.

**روانینێکی گشتی:**

دۆزینەوەی بەردەنووسی رۆزیتا[2] لەساڵی ١٧٩٩و پاشان کەشفکردنی رەمزی ئەو بەردەنووسە لەلایەن (جان شامپولیون[3])ەوە، رێگەی بۆ ناسینی ئەدەبیاتی چوارهەزار ساڵەی میسری خۆشکرد کە بەرلەوە جیهان لێی غافڵ بوو، زۆربەی بەرهەمێن ئەدەبی میسری لەبەین چووە، بەڵام چەند نموونەیەکی گرنگی لەچەپۆکی رووداوەکانی رۆژگار رزگاربووە و ماوەتەوە.

گۆڕستانەکان، هەرەمەکان، ستونەکان، بەردەنووسەکان و گەلێك نووسراوی دیکە، سێ جۆر خەتی (هیرۆگلیف[٤]) و (هیراتیك[٥]) و (دیموتیك[٦])یان لەقاڵب و شێوەی بەرهەمی ئەدەبیدا لەخۆدا پاراستووە.

یەکەمین نووسین لەدەوروبەری ساڵی (٦٠٠٠) پێش زاییندا لەسەر بەرد نەخشێنراوە، بەڵام ئەوەی لەبەردەستدایە دەگەڕێتەوە بۆ ساڵانی (٣٧٠٠-٢٠٠٠) پێش زایین. زۆربەی ئەو نووسراوە میسرییانەی کە دەتوانرێت بەبەرهەمی ئەدەبی بژمێردرێت، بەسەر پێنج گرووپ یان جۆردا دابەش دەکرێت، ئەدەبیاتی پەند، ئەدەبیاتی مەزهەبی، چیرۆك و حیکایەتەکان، غەزەلیاتی ئەڤینی و شیعرێن حەماسی (ڕەزمی).

**ئەدەبیاتی پەند و ئامۆژگاری:**

(ئامۆژگارییەکانی پتاح حوتپ[*]): ئەمە لەسەر تۆمارێکی پاپیرۆسی (لە بان) کە دەگەڕێتەوە بۆ دەوروبەری (٢٥٠٠) ساڵی پێش زایین ماوەتەوە، ئەم بەرهەمە کە بە (کۆنترین کتێبی جیهان) دەزانرێت، بریتییە لەکۆمەڵێك بیر و ئەندێشەی ڕۆشنبیرانە و بێ پێچ و پەنا دەربارەی ژیان و بوونیادی ژیان و باسی مەسەلە باوەکانی ناو کۆمەڵگە، وەکو تەڵاق و پەیوەندیی عەمەلی، شێوە و شێوازی کتێبەکە قورسە و تێگەیشتنی بۆ خوێنەری ئاسایی دژوار و ئەستەمە.

**ئەدەبیاتی مەزهەبی:**

میسرییانی کۆن کە یەکجار مەزهەبی و سەوداسەری جاویدان و نەمریی بوون (ئەم سەودا و خولیایەی خۆیان لەڕێگەی دروستکردنی هەرەم و گۆڕستانان و مۆمیاکردنی جەستەکانەوە نیشاندەدا) ڕەنگە یەکەمین خەڵکانێك بووبن کە باوەڕی نەمریی بنیادەمیان دەربڕیبێت، خواوەندی سەرەکییان ئۆزیریس[٧]، خواوەندی نیل بوو (کەهەندێکجار لەگەڵ ڕەع[٨]-ی خوای خۆردا، بەیەك دادەنرێت). ئۆزیریس، چونکە لەنێو مردووانەوە ڕابیبوو، بۆیە بەنموونەی نەمری و خواوەندی ژیانی پاش مەرگ و داوەری جیهانی ژێرین دەژمێردرا.

کتێبی مردووەکان (مردوونامە) بەیەکێك لەگرنگترین دەقی میسرییانی کۆن دێتە ژماردن و لەسەرنزیکەی دووهەزار تۆماری پاپیرۆسی هاتۆتە نووسین و تۆمارکردن، ئەم کتێبە سەد و شەست و شەش بەشە و لەسەردەمی جیاوازدا، لەنزیکەی ساڵانی (٤٢٦٦)ەوە تا (٢٠٠٠)ی پێش زایین هاتۆتە نووسین. ئەم قەواڵەنامەیە بریتییە لەدوعا و وێرد و سروودی پاڕانەوە و ئیعتیرافنامە و ئەمجۆرە بابەتانە. ناوەڕۆکی سەرەکی کتێبەکە بریتییە لەدەربڕینی چۆنیەتی

گەیشتنی مرۆڤ بەژیانی هەتاهەتایی و نەمری. (سروودی رەع) و (بەیاننامەی بێ گوناهی) لەجوملەی بەشە بەناوبانگەکانی کتێبیْ نێوبراون.

**بەرهەمی هەمەجۆری مەزهەبی:**

جگە لەکتێبی مردووەکان (مردوونامە) زۆر سروودی ئایینی و وێرد و گۆرانی لەپاش میسرییانی کۆن ماوەتەوە کە مەشهورترینیان بریتین لە: (فیستیڤاڵی ئەنتیف) (کە لەدەوروبەری ساڵی دووهەزار و پێنج سەدی پێش زایین نووسراوە، لەتۆمارێکی پاپیرۆسی (لەبان) دەوروبەری ساڵی هەزار و پێنج سەدی پێش زایین تۆمارکراوە). ناوەڕۆکەکەی بریتییە لەوەی کە هەر گاڤ و دەمێکی ژیان غەنیمەت و دەستکەوتە و هەروەها (گۆرانی بۆ نیفیرهوتیپ) کە لەدەوروبەری ساڵی هەزار و شەش سەدی پێش زایین نووسراوە لەو گۆرانییەدا داوای بەرەکەت لە رەع دەکرێت.

(سروودێك بۆ یوزرتسانی سێیەم) کە لەدەوروبەری ساڵی سێ هەزار پێش زایین نووسراوە و بریتییە لەستایشی یەکێك لەفیرعەونەکان (کەنوێنەری خواوەندانە).

**چیرۆك و حیکایەکان:**

میسرییانی کۆن یەکەمین حیکایەتی میللییان لەپاش خۆ بۆ بەجێیهێشتووین، لەوانە چیرۆکێن رووحان و ئەفسانەێن جادوو و حیکایەتی پڕ شەڕ و شۆڕ و ئاشقێتی و نەقڵ، هەندێك لەو چیرۆك و حیکایەتانە بریتین لە: (گرتنی یافا، شازادەی مەحکوم، چیرۆکی جادووگەران، ئاغا و کۆیلە و دوورخستنەوەی سینۆهە (حیکایەتی دووبرا) یان ئانبو و باتا ئەم حیکایەتە لەدەوروبەری ساڵی سێ هەزار و دووسەدی پێش زایین نووسراوە و لەتۆماری نزیکەی ساڵی هەزار و سێ سەدی پێش زایین تۆمارکراوە.

رەنگە کۆنترین حیکایەت بێت لەڕووی ناوەڕۆکی (هاوسەری فوتیفار)ەوە. ئەم چیرۆکە ئاوێتەیەکە لەجادوو و دۆنایدۆن و رکابەری، دوو ژنی جەفاکار دەبنە مایەی بەدبەختی مێردەکانیان، بەڵام لەئەنجامدا بەسزای کار و کردەوەی خۆیان دەگەن و مێردەکانیان شاد دەبن (کەشتیوانی کەشتیی شکاو) دەگەڕێتەوە بۆ نزیکەی ساڵی دوو هەزار و پێنج سەدی پێش زایین، لەم حیکایەتەدا کەشتیوانێك کە تەنیا خۆی رزگاری بووە دەگاتە (دورگەی نیعمەتان)، مارێکی قسەوێژ پێشبینی رزگاری ئەو دەکات، پێشبینییەکە تەواو دەردەچێت و کابرای کەشتیوان بەدەست و دیاریی سەیرەوە بۆ دەرباری فیرعەون دەگەڕێتەوە.

(چیرۆکی ستنا) لەدەوروبەری ساڵی هەزار و سیّ سەدی پێش زایین نووسراوە و لەنوسخەی دەوروبەری ساڵی چوار سەدی پێش زایین تۆمارکراوە، ئەم چیرۆکە باسی دزینی کتێبێکی جادوویی دەکات کە قوتابییەك لەگۆڕێکدا دەیدزێت و پاشان ژێوان دەبێتەوە و کتێبەکە دەگەڕێنێتەوە بۆ شوێنی خۆی و تۆبە دەکات.

**شیعرێن ئاشقانە (غەزەلیات):**

میسرییانی کۆن ژمارەیەکی زۆری شیعری ئاشقانەیان لەسەردەمانی جیاوازدا گوتووە، ناوەرۆکی زۆربەیان باسی سەربووردەی ئاشقێنی خوشکان و برایانە (کە لەو رۆژگارەدا زەوجینی خوشك و برا باو بووە) ناسکی و زەریفی و جۆش و خرۆش، خەسڵەتی هەرە باوی ئەو شیعرانەیە.

**شیعرێن مەلحەمی:**

لەو بەیتە حەماسییانەی کە پڕ بەمانای وشە حەماسین تەنیا یەك پارچە ماوەتەوە، ئەویش حەماسەی (پەنتا-نور)ە و دەگەڕێتەوە بۆ دەوروبەری ساڵی هەزارو سیّ سەدو بیست و چواری پێش زایین. کە بابەتەکەی بریتییە لە سەرکەوتنی رامسیس[٩]ی دووەم بەسەر حیتییەکاندا[١٠].

# پەراوێز:

(١) هەندێك لە ئارکولوژیستەکان پێیانوایە کە شارستانییەتی چینی کۆنترە.

(٢) بەردەنووسی رۆزیتا: تابلۆیەکە بەسێ زمانی هیروگلوفی و یونانی و دیموتیك، کە لەشاری روزیتا (رەشید)ی نزیکی رێژگەی رەشیدی رووباری نیل دۆزراوەتەوە.

(٣) جان شامپولیون ١٧٩٠-١٨٣٢ میسرناسێکی فەرەنسییە کە لەئەنجامی کۆشش و هەولێکی بیست ساڵەدا توانی رەمزەکانی تابلۆی رۆزیتا کەشف بکات و چەمکی وشە هیروگلوفییەکان ئاشکرا بکات.

(٤) هیروگلیف: خەتی میسرییە کە یۆنانییەکان هیروگیلف-ی پێدەڵێن، ئەم خەتە لەخەتە وێنەییە سادەکانی سەدە سەرەتاییەکانەوە وەرگیراوە و لەئەسڵدا حەوت سەد عەلامەت (حەرف) بووە.

(٥) هیراتیك: ئەم خەتە شێوەیەکی سادەتری خەتی هیروگلیفی-یە بۆ خێرانووسین لەبارترە.

(٦) دیموتیك: خەتی دیموتیك لەئەنجامی گۆڕینی شێوەی خەتی هیراتیکەوە، لەسەدەی هەشتەمی پێش زایین هاتۆتە ئاراوە.

* پتاح حوتیپ: لەدەوروبەری ساڵی دوو هەزار و شەش سەد و پەنجای پێش زایین ژیاوە، بەڵام ناوبانگی (ئامۆژگارییەکانی) پتاح حوتیپ بۆ زۆر کۆنتر دەگەڕێتەوە، لەوەیە بۆ ساڵی سێ هەزار و هەشت سەدی پێش زایین بگەڕێتەوە.

(٧) Osiris

(٨) Ra

(٩) Ramses یەکێکە لە لەفیرعەونە کۆنەکانی میسر، کە لەهەزار و دووسەدو نەوەدو دوودوە تا هەزار و دووسەد و بیست و پێنجی پێش زایین حوکمڕانیی کردووە.

(١٠) حیتییەکان: قەومێکی کۆنە کە لەهەزارەی دووەمی پێش زایین فەرمانڕەوایی ئاسیای بچووك و سوریایان کردووە.

## ب- ئەدەبیاتی ئاشووری- بابلی

### پێشینەیەکی مێژوویی:

گومان لەوەدا نییە کە دانیشتووانی کەنارە بەپیت و بەرەکەتەکانی نێوان دیجلە و فورات تا نزیکەی ساڵی دووهەزاری پێش زایین، لەبارەی پێشکەوتنی هزری و مادییەوە گەییبوونە لوتکەی شکۆ و ناوبانگ، تیرە جۆراوجۆرەکانی سۆمەری، ئەکەدی، عیلامی، کلدانی و کاسی رۆڵی خۆیان لەبوونیادی مەدەنییەت و شارستانییەتی دەڤەرەکەدا گێڕاوە، ئاشوورییەکان لەنێوان ساڵانی هەزار و دووسەد تاشەش سەد و هەشتی پێش زایین قەومی حوکمڕان بوون و پاشان بابلییەکان تا نزیکەی هەفتا ساڵ دەسەڵاتییان گرتووەتە دەست، ناودارترین رابەرانیان بریتیبوون لە: (سینا خریب) کە لەساڵانی ٧٠٥-٦٨١ پێش زایین حوکمڕانیی کردووە (ئاشور بانی پاڵ) لە ساڵانی ٦٦٩-٦٢٤ پێش زایین فەرمانی رانیوە. (نەبوکەد نەسر) کە لەساڵانی ٦٠٥-٥٦٢ پێش زایین حوکمڕانیی کردووە.

### نۆڕینێکی گشتی:

قۆناغی زێڕینی ئەدەبیاتی ئاشووری-بابلی دەکەوێتە ناوەڕاستی سەدەی حەوتەمی پێش زایین. ئاشوور بانیپال زانست پەروەرێکی گەورە بووە و کتێبخانەیەکی گەورەی (بەشێوەی بەردەنووس بەخەتی بزماری) بونیادناوە کە ئەمڕۆ بەسەرچاوەی هەر هەموو بەرهەمی ئەدەبی کۆنی ئەو دەڤەرە دێتە ژماردن، ئەم کتێبخانەیە جگە لەهەواڵ و قەواڵەێن رەسمی و فەرمی، ئەفسانە، حیکایەت و نەقڵ، سروودی ئایینی، گۆرانی، وێرد، پەند و ئەفسانەی عامیانە و مێژووی جەنگەکانی لەخۆگرتبوو، بەلای کەمەوە نموونەیەك لەهەر یەکێك لەم بەرهەمانە ماوە، لەشیعردا شێوەی هاوسەنگی و کێش و قافیە باو بووە، واتە هەمان ئەو شێوە و شێوازانەی کە لەشیعری عیبریشدا باو بووە، (داستانی گیلگامێش) کە دەگەڕێتەوە بۆ دەوروبەری ساڵی دووهەزاری پێش زایین، هەڵبەتە بەگەورەترین نووسراوی ئاشووری-بابلی کۆن دەزانرێت، گێڕانەوەی کۆنی ئەم بەیتە دەگەڕێتەوە بۆ ناوەڕاستی سەدەی حەوتەمی پێش زایین و بریتیی بووە لە ٣٤٥٠ بەیت کە لەدوانزە تابلۆی گەورەدا لەکتێبخانەکەی ئاشوور بانیپاڵ-دا لەئەنینەوا پارێزراوە، ئەو داستانە ئەمڕۆکە تەنیا نزیکەی هەزار و پێنج سەد بەیتی بەتەواوی یان بەنوقستانی لێماوەتەوە، کە لە سێ هەزار تابلۆی جیاوازی ساغ یان شکاودا ماوەتەوە کە هەندێکی بەسۆمەرییە، هەندێکی بەبابلی کۆنە و تەنانەت چەند ژمارەیەکیشی بەئەکەدییە.

ئەمڕۆکە واباوە کە داستانی گیلگامێش بریتییە لەکۆمەڵە بابەتێك بەمەبەستی دانانی بەرهەمێکی بەشکۆ و کەم دابێژێك وەزن و کێشدار، لەکۆمەڵێك سەرچاوەی جیاواز و دوور لەیەکدییەوە کۆکراوەتەوە، هەندێك کەس رایان وایە کە هەندێك مەتنی کۆنتر هەبووە و بەچەند سەد ساڵێك بەر لەم بەیتە (منظومە) نووسراوە.

هەرچەندە کە زۆربەی سەرچاوەکانی ئەم داستانە ئەفسانەییە، بەڵام هەوڵدراوە تاقارەمانی داستانەکە لەگەڵ میرێکی یەکەمین خانەدانی پاشایەتی شاری ئوروك[١]دا بگونجێنن، ئەو میرەی کە دەیان ئەفسانە و حیکایەتی بەمێژوو و رەگ و ریشەی جۆراوجۆرەوە (بەتایبەتی سامی و سۆمەری) دەربارەی کۆکراوەتەوە.

ئەم پاڵەوانانامەیە، بریتییە لەباس و شرۆڤەی سەرکەوتنە گەورەکانی گیلگامێش، گیلگامێش قارەمانێکی نیمچە خوایە، فەرزەنی خواوەندێکە بەناوی نینسون[٢] و بوونەوەرێکی فانی کە کاهینێکی خەڵکی شاری ئوروکە.

ئیدی زوڵم و زۆری قارەمانی لاو و خۆپەسند، خەڵکی ئوروك ناچار دەکات کە لەپێناوی رزگاریدا، دەستی پاڕانەوە بۆ دەرگای خواوەند ئارورو[٣] درێژبکەن. و ئەویش ئینکیدۆ[٤] وەکو هەڤرکێکی گیلگامێش، دەنێرێتە یارمەتییان، ئینکیدۆ بوونەوەرێکی بەتوانایە، بەڵام دڕندەخووە، و کینایەیە لە مرۆڤی سەرەتایی، ئەم دووە، لەئەنجامی شەڕێکی سەختدا کە بەسەرکەوتنی گیلگامێش کۆتایی دێت، دەبن بە دوو دۆستی گیانی بەگیانی (لەتابلۆی ١ و ٢)دا تۆمار کراوە، رووداوی دواتر (لە تابلۆی ٣-٥) تۆمار کراوە، دەربارەی سەفەری ئەم دوو دۆستەیە بۆ رووبەڕووبوونەوەی خۆم بابا[٥]ی پاسەوانی ئەو بێشەیەی کە ئیرنینا[٦]ی تێیدا دەژی، خۆم بابا دەشکێ و دەکوژرێت، تابلۆی شەشەم باسی حەزکردنی عیشتارە لەگیلگامێش، بەڵام کاتێ گیلگامێش رووی ناداتێ، تووڕە دەبێت و کارێکی وەها دەکات کە (ئانو[٧]) باوکی کەڵەگایەك بۆ لەناوبردنی گیلگامێش بنێرێت، بەڵام گیلگامێش و ئینکید و کەڵەگاکە لەناودەبەن، و ئەم رووداوە وەکو ئوستوورە و ئەفسانەی تەبیعەت لێکدەدرێتەوە، گیلگامێش، نیشانەی خوای لاوی هەتاوی وەرزی بەهاران و عیشتار خواوەندی عیشق و بەرهەمهێنانە، لەتابلۆکانی (٧ و ٨)دا ئینکیدۆ تووشی نەخۆشییەکی قورس دەبێت و دەمرێت. جا گیلگامێش بۆئەوەی دووچاری هەمان چارەنووسی دۆستەکەی نەبێت، رێگەی دۆزینەوەی ئوتوناپیشتم[٨] دەگرێتەبەر، ئوتوناپیشتم نادەمیزادێکە کە چۆنییەتی خەلەسین لەمەرگ فێربووە، لەئەنجامی گەڕانی زۆر و رووداوی هەمەجۆرەوە دەیدۆزێتەوە (ئەمە لەتابلۆی ٩ و ١٠

تۆمارکراوە) ئوتوناپیشتم چیرۆکە بەناوبانگەکەی تۆفانی بابلی بۆ دەگێڕێتەوە (تابلۆی ١١) کە ئەمە تەواو لەسەربووری تۆفانەکەی نوح دەچێت، وەکو چۆن لەتەوراتدا باسکراوە، ئوتوناپیشتم حەزدەکات یارمەتیی گیلگامێش بدات و نیشانەی ئەو گیایە سەیرەی دەداتێ کە بەخواردنی مرۆڤ گەنج دەکاتەوە و گیایەکە لەبنکی دەریادایە. هەرچەندە گیلگامێش گیایەکە بەدەست دێنێ، بەلاّم مارێکی لێپەیدا دەبێت و گیایەکەی لێدەفرێنێت و دەیخوات، لەدوا تابلۆدا گیلگامێش سێبەرەکەی ئینکیدۆ دەبینێت و ئینکیدۆ لەچارەنووسی بێزەوەری مردووان ئاگاداری دەکاتەوە.

هەڵبەت بەیتی گیلگامێش تەنیا پاڵەواننامەیەکی (حماسە) سەرنجراکێش نییە دەربارەی پاڵەوانییەکی کۆن، بەڵکو بابەخێکی رەمزی و ئیستیعاری زۆری هەیە، لەم بەیتەدا باسی تەقەلای مرۆڤ بۆ دۆزینەوەی مانای ژیان و بێهودەیی هەوڵی راکردن لەمەرگ دەکرێت، ئەنجامگیری فەلسەفی بەیتی نێوبراو ئەمەیە کە مادامێکی مەرگ هیچ چارێکی نییە و ژیانی پاش مەرگیش خەمناك دێتەبەرچاوی خەیاڵ، بۆیە مرۆڤ دەبێت لەخەمی لەزەتدا بێت و ئەوپەڕی سوود لەژیانی دنیایی خۆی وەربگرێت.

(ئەفسانەی تیامەت) کە مێژووەکەی دیار نییە و بەم شێوە و فۆرمەی ئێستای، بۆ دەوروبەری ساڵی شەش سەدی پێش زایین دەگەڕێتەوە). بریتییە لەزنجیرە شیعرێك دەربارەی دروستکردنی جیهان، دەربارەی تیامەت-ی یەکەمین دایکی جیهان و ئاپسو[٩]ی یەکەمین باوکی گێتی، کە پێکەوە یەکەمین زنجیرەی خواوەندانیان پێکهێنا. ئەم ئەفسانەیە باسی جەنگەکانی نێوان خواوەندان دەکات. مەردوك[١٠]ی خواوەندی هەورەتریشقە بەسەر تیامەتدا سەردەکەوێت و دەیکوژێت. هەواڵێن پەیدا بوونی خواوەندان و جەنگی خواوندان، لەو هەواڵانە دەچێت کە لەسیفری پەیدابوون و لەئەفسانەکانی یونان و ئەسکەندیناوەدا باسکراون.

(ئاداپاو بای باشوور) کە دەگەڕێتەوە بۆ دەوروبەری ساڵی هەزار و پێنج سەدی پێش زایین، ئەفسانەیەکی عامیانەیە دەربارەی ماسیگرێك کە لەحاڵی تووڕەییدا باڵی بای باشوور دەشکێنێت، بۆ بارەگای خوای مەزن ئانۆ بانگ دەکرێ و سەرکەوتووانە دەکەوێتە داکۆکی و بەرەڤانی لەخۆی.

(سروود و وێردێن بابلی) (لەسەردەمێن جیاوازدا تۆمارکراون). ئەم بەرهەمانە لەباری فۆرم و بابەتەوە لەمزمارەکانی عیبری دەچن و بەشێوەیەکی گشتیی نزا، شیعرێن حەسرەتبار و سروودی ستایش لەخۆدەگرن. لەنێو ئەم بەرهەمانەدا ئەم شیعرانە شایانی باسن:

(رەحم بە من بکە)، (جگە لەتۆ هیچ خوایەك نییە تارێگەی راست نیشان بدات)، (نورێك لەبەهەشتەوە).

# پەراوێز:

(١) ئوروك uruk: شارێکی کۆنی سۆمەرییە، دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی دوو هەزار و سێسەدی پێش زایین. کە باشووری بابل بووە، بەگوێرەی تەورات ئوروك شارێکی مەملەکەتی نەمرود بووە، لەوڵاتی شنعار.

(٢) نینسون، Ninsun: دایکی گیلگامێشە، خواوەندێکە لەئوروکدا ئاکنجی بووە و بەناوەزو و زانایی بەناوبانگ بووە.

(٣) ئاروروArurul: خواوەندی ئەفراندن و خولقێنەری ئینکیدو بووە.

(٤) ئینکیدو Enkidu: گووڕاوێك بوو لەگڵ و گیانی یەزدانان کە تەبیعەتی مرۆڤانی هەبوو.

(٥) خوم بابا Khumbaba: بەباوەڕی خەلکی عیلام خواوەندێك بووە، ئیدی یا ئاناتولی بووە یا سورییە.

(٦) ئیرنینا Irnina: ناوە سومەرییەکەی ئیشتار بووە کە خواوەندی ئاسمان و پاسەوانی ئوروك بووە.

(٧) ئانو Anu: خواوەندی سۆمەری بووە، بابی خواوەندان و خوای ترۆپکی ئاسمانان بووە.

(٨) ئوتوناپیشتم utnapishtim: شای دانا و کاهینی گەورەی وڵاتی شوروپاك بووە، ئەو تاقە ئادەمیزادێك بووە کە لەسەر ڕووی زەوی ژیانی جاویدانی هەبووە.

(٩) ئاپسو Apsu: واتە ئوقیانووس کە لەسەرەتادا بابی هەموو شتەکان بووە.

(١٠) مەردوك Marduk: خواوەندی شاری بابل بووەو پاش دامەزرانی ئیمپراتۆریەتی کۆنی بابل، بووە بەسەرگەورەی هەموو خواوەندەکان.

# ئەدەبیاتی هیندی

**پێشینەیەکی مێژوویی:**

لەدەوروبەری ساڵی دوو هەزاری پێش زایینی، دەستەیەك لەقەومانی ئاریایی، واتە لقێك لەنەژادی سپی، لەباکووری خۆرئاواوە هێرش دەبەنەسەر هیند هەڵبەتە تا بەرلە سەرکەوتنی داریوش لەساڵی پێنج سەد و دوازدەی پێش زایینی، زانیارییەکی ئەوتۆ لەمەڕ واریقات و سەربهووردی وان لەبەردەستدا نییە، بەڵام وێڕای ئەمەش، دیارە کە لەسەردەمانی پێش مێژوودا، شارستانییەتێکی زۆر کۆنیان هەبووە، پێدەچێت ئایین و فەلسەفە و ئەخلاقییات و ئەدەبیاتیان زۆر پێشکەوتوو بووبێت، گاوتمە (گوتاما) بودا (٥٦٣-٤٨٣ پێش زایین) گۆڕانێکی قووڵی بەسەر باوەڕی ئایینی و دەستووری عیبادەتی ئەواندا هێناوە و پاشان ئامۆژگارییەکانی ئەو بووە بەبناغەی یەکێك لەپێنج ئایینە سەرەکییەکەی جیهان.

**نۆڕینێکی گشتی:**

بەشی هەرە سەرەکی و زۆربەی ئەدەبیاتی هیند بە سەنسکریتی، واتە بەکۆنترین زمانی ئاریایی نووسراوە. ژمارەیەکی کەمی شیعری لیریکی و دەقی مەزهەبیش بەزمانی پراکریت، واتە بەشێوەزاری ناوچەیی سەنسکریتی نووسراوە، مێژووی ئەدەبیاتی هیندی بەسەر دوو قۆناغدا دابەش دەبێت: ١-قۆناغی ڤیدایی کە لە دەوروبەری ساڵی ١٥٠٠--٢٠٠ پێش زایین بەردەوام دەبێت و بەرهەمهێنی ئەم قۆناغە بەزۆری لەشیعرێن مەزهەبی و لیریکی پێکدێن. ٢-قۆناغی سەنسکریتی کە لەدەوروبەری ساڵی دوو سەدی پێش زایینەوە دەستپێدەکات و تا دەگاتە سەدەکانی ناڤین و بگرە تا ڕۆژگاری ئەمڕۆش بەردەوام دەبێت.. لەقۆناغی سەنسکریتیدا شێوە و فۆرمی جۆراوجۆری وەك شیعری حەماسی (دلاوەری) و لیریکی و پەند و ئامۆژگاری، شانۆنامە، حیکایەتی جن و پەرییان، حیکایەت و سەبووری پەند ئامێز،

چیرۆکی ئەڤینداری و فەلسەفە جێگیر دەبێت، ساڵنامە و تەقویمی ئەدەبی تاوەکو پێش ساڵی پێنج سەدی پێش زایین، زیاتر لەسەر بنەمای مەزەندە و قەرساندن بووە.

## بەرهەمێن ئایینی

**شیعر:**

کۆنترین بەرهەمی ئەدەبی پیرۆزی هیندی لەچواربەشەکەی ڤیداکاندا (کتێبانی زانست) دەبینین:

١-ریگ ڤیدا:

ئەم کتێبە لەدەوروبەری ساڵی هەزار و چوار سەدی پێش زایین نووسراوە. ئەمە دەفتەرێکە هەزار و بیست و هەشت سروودی ئایینی سەبارەت بەستایشی خواوەندانی جۆراوجۆری تەبیعەتی لەخۆگرتووە و زۆربەی ئەم سروودانە ناسنامەی دیاریان نییە. مەزهەبی زاڵ لە(رێگ ڤیدا)دا ئایینی وەحدەتی وجودی هندۆسە، و بابەتی سەرەکییان پەرستنی براهمایە، واتە خواوەندی جاویدان، (سروودی ئافەرین) بەرجەستەترین شیعری دەفتەری (ریگ ڤیدا)یە.

٢-سامەڤیدا یا (کتێبی ئاهەنگان):

مێژووی تۆمارکردنی ئەم کتێبە دیار نییە، بەشێوەیەکی گشتیی بریتییە لەموناجات و ئادابی مەزهەبی و بەزۆری دووبارەکردنەوەی سروودەکانی ریگ ڤیدایە.

٣-یەجورڤیدا یا (کتێبی ستایشان):

مێژووی ئەم کتێبەش دیار نییە. ئەم کتێبەش بریتییە لەموناجات و ئادابی مەزهەبی و دووبارەکردنەوەی رێگ ڤیدا، بەڵام زۆر سیاق و مەتنی پەخشانیشی لەخۆ گرتووە.

٤-ئاتەرڤاڤیدا یا (کتێبی جادوو):

مێژووی ئەم کتێبە دیار نییە، بەڵام لەسێ ڤیداکەی دی تازەترە.

زۆر سرودی ئایینی، جادوو تەلیسم، وێرد و تیۆریانی دەربارەی گرتنی جنۆکان و جادووگەریی لەخۆ گرتووە.

**پەخشان:**

**براهماناس**، (مێژووەکەی دیار نییە، رەنگە بگەڕێتەوە بۆ دەوروبەری ساڵی هەزاری پێش زایین) ئەم بەرهەمە بریتییە لەشرۆڤەی سروودە ئایینییە ڤیداییەکان و سروودە مەزهەبییەکان کە رەنگە کۆنترین دەقی بەپەخشان نووسراوی هیندۆ ئەورووپایی بێت.

**ئوپانیشاد:** (مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ دەوروبەری ساڵانی ٨٠٠-٥٠٠ پێش زایین ئەم بەرهەمە بریتییە لەسەد و هەشت نامە دەربارەی ئایینی براهمەن. وێڕای ئەوەی کە ئوپانیشاد سیستەمێکی کۆکی هزری فەلسەفییە، زانیارییەکی زۆریشی لەمەڕ مایا (جیهانی وەهم) و نیرڤانا (فەنابوون لەرۆحی جیهان)دا لەخۆگرتووە، ئۆپانیشاد کاری کردووەتەسەر ئەمرسون و شوپنهاوەر.

سوتراکان: (دەگەڕێتەوە بۆ دەوروبەری ساڵانی ٥٠٠-٢٠٠ پێش زایین) بریتییە لەکۆمەڵێك پەیڤی یەجگار کورت، کە زیاتر شرۆڤەی نامەفهومن دەربارەی یاسا و ئەحکامی ئایینی.

## بەرهەمی نائایینی

· **بەیتە مەلحەمییەکان:**

هەرچەندە ئەم بەیتانە، بەبەرهەمی نائایینی دێنە ژماردن، بەڵام ئەم دوو بەرهەمە مەلحەمییە زۆر بابەتی ئەفسانەیی و ئایینی هیندیان لەخۆگرتووە.

**مەهابهاراتا:** (دەگەڕێتەوە بۆ دەوروبەری ساڵی پێنج —سەدی پێش زایین).

ئەم بەرهەمە درێژترین داستان (مەلحەمە)ی جیهانە و نزیکەی دووسەد هەزار بەیتە، نزیکەی هەشت ئەوەندەی هەردوو داستانی ئیلیادەو ئۆدیسەیە، و بریتییە لەهەژدە کتێب، هەوێنی رەمزی ئەم بەیتە (کە نزیکەی هەشتا هەزار بەیتە) دەربارەی جەنگی نێوان (کورو)وەکان و (کە نمایندەی هێزی خراپەن) و (پاندو) وەکانە، کە نمایندەی هێزی چاکەن. هەندێ بەشی دیکەی ئەم بەیتە بۆ ئەفسانان، شەرح و شرۆڤەی پەیڤان، و کۆمەڵێك نامەی ئایینی و فەلسەفە و بابەتی جەنگی و سوارچاکی تەرخان کراون، دیارە ئەم بەیتە دەسکاری زۆر کراوە و زۆر شتی بۆ زیادکراوە و ئەمەش وایکردووە کە هەندێجارتێگەیشتنی زۆرئەستەم و زەحمەت بێت هەڵبەتە دوو نموونەی زیادکراوی ئاشکرا بریتین لە:

١- **بهاگاڤادگیتا:** (سروودی خوایی) ئەمە شیعرێکی درێژ و پەند ئامێزە، کە لەو شیعرەدا کریشنا (کە دەکاتە نوێنەری مرۆڤانی، ویشنو کە یەکێکە لەخواوەندە مەزنەکانی هیند) لەگەڵ ئارجوانادا (کە نمایندەی هێزی چاکەیە) دەکەوێتە باسی فەلسەفە و ژیان.

٢- **نالاو دامایانتی:** ئەمە چیرۆکێکی دڵڕفێنە دەربارەی سەبر و وەفاداری لەزەوجیندا، ئەمرسونی نووسەری ئەمریکایی دڵبەندی بهاگاڤادگیتا بووە.

**٣- رامایانا:** (لەدەوروبەری ساڵی پێنج سەدی پێش زایین دەستی پێکراوە و لەدەوروبەری ساڵی دووسەدی پێش زایین تەواو کراوە). ئەم داستانە (مەلحەمە) نزیکەی نەوەد و شەش هەزار بەیتە و بریتییە لەحەوت کتێب یان بەش.

ئەم بەیتە بریتییە لەسەربهووردی ژیانی راماو (نموونەیەکی مرۆڤانی ویشنووە) سیتای هاوسەری، سەرگەردانی راما وەفاداری سیتا لەهەنبەر وەسوەسەی راڤانا (روحی شەڕانی) و سەرەنجام تۆپینی راڤانا بەدەستی راما ئەم بەیتە زۆر لەمەهابهاراتا کورتتر و خۆشترە بۆ خوێندنەوە.

**نمایشنامان**

زانیاری زۆر کەم لەمەڕ سەرچاوەو زێدی نمایشنامەی هێندی لەبەردەستدایە، مێژوونووسانی ئەدەبی دەربارەی رادەی کاریگەری یۆنانییەکان لەسەر شانۆی هیندی هاوڕەئی نین، واتە رای جیاوازیان لەو بارەیەوە هەیە. ئەوەی لەڕاستییەوە نزیکە ئەمەیە کە دەبێت لەخودی هینددا بۆ سەرچاوەی نمایشنامە و شانۆی هیندی بگەڕێی، چونکە یەکەمین شانۆی واقیعی لەڕێوڕەسمی پەرستنی ویشنو-کریشناوە وەرگیراوە و هەڵهێنجراوە. هەڵبەتە شانۆ بەمانا و چەمکی تەواوەتی شانۆ نەبووە، بەڵکو چیرۆکەکانی نمایشی و مەیلەو شانۆیی لەتەلاری میوانداری و یا تەلاری سەمای کۆشکی فەرمانڕەوایاندا جێبەجێدەکران، لەبارەی سەرنجی مێژووییشەوە ڕەوتی کاروانی شانۆنامە روون نییە، ئەوەی دیارە ئەو شەست و چەند شانۆنامەیەی کە گوایە لەنێوان ساڵانی سەدی پێش زایین و شەش سەدی زاییندا نووسراوە، زۆربەیان هی ساڵانی پاش چوار سەدی زایینین. شانۆنامەی هیندی ئاوێتەیەکە لەشادی و خەم، لێ هەموو شانۆنامەکان کۆتاییەکی خۆشیان هەیە، هەر شانۆنامەیەك بەپێشەکییەك دەستپێدەکات و بەسەر چەند دیمەن و پەردەیەکدا (یەك تا دە) دابەش دەبێت، زۆربەی شانۆنامەکان لەڕووی بابەت و ناوەڕۆکەوە هەندێ ئاڵۆزن و کاراکتەرەکانیان واقیعییە، دیالۆگیان ئاوێتەیەکە لەپەخشان و شیعری غەزەلی، ئەوەی بووە باعیسی لەناوبردنی شانۆی هیندی و لاوازکردنی، بەکارهێنانی هەردوو زمانی سەنسکریتی (بۆ چینە باڵاکانی کۆمەڵگە) و زمانی پراکریت (بۆ چینە میللییەکانی کۆمەڵگە) بوو لەشانۆنامەکاندا.

(**عەرەبانەی گڵ**) گوایە دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی سەردەمی پێش زایین، بەڵام بەم فۆرم و شێوەیەی ئێستا دەگەڕێتەوەبۆ دەوروبەری ساڵی چوارسەد و پەنجای زایینی) ئەم شانۆنامەیە دراوەتە پاڵ (شاسوودراکا) و بریتییە لە دە پەردە، قارەمانی ئەم شانۆنامەیە ژنێکی سۆزانییە

کە ژیانی بازرگانێك لەبەر میهرەبانی و دلاوایی رابردووی بازرگانەکە رزگار دەکات، لەم شانۆنامەیەدا هەستە واقیعییە مرۆڤانییەکان بەباشی وەسفکراون.

**(شکونتەلا، یا ئەلقەی تەقدیر)** دەگەڕێتەوە بۆ دەوروبەری سالی پێنج سەدی زایینی) شانۆنامەیەکی شیعرییە و دراوەتە پال (کالیداسا) کە بەشکسپیری هندوان ناسراوە، لەغیابی پاشایەکدا بەناوی دووشیانتا، حەکیمێکی براهمانی نەفرەت لەشکۆنتەلای هاوسەری دەکات، لەئەنجامی ئەم تووك و نەفرینە، کاتێ پاشا و هاوسەرەکەی دەگەنە یەکدی، دووشیانتا شەکونتەلا ناناسێتەوە، بەتایبەتی لەبەرئەوەی کە شەکونتەلا ئەو ئەلقەیەی کە دوشیانتا پێیدابوو، ونکردووە، شەکونتەلای نائومێد بەئاسمانانددا دەفڕێت، رۆژێ ماسیگرێك ئەنگوستیلەکە (ئەلقەکە) دەدۆزێتەوە و بۆ پاشای دەباتەوە ئیدی نەفرەینەکە بەتال دەبێتەوە و دوشیانتا دووبارە شەکونتەلای بیر دەکەوێتەوە، پاشای خەمگین سالانێکی زۆر عەودالی شەکونتەلا دەبێت و هەموو شوێنێکی بەدوودا دەگەڕێت تاسەرەنجام لەکێوێکی پیرۆزدا دەیدۆزێتەوە و ئیدی هەموو شتێ بەخێر و خۆشیی دەگەڕێت، ئەم شانۆنامەیە فۆرم و قالبێکی بتەوی هەیە، لەوەسفی کاراکتەرەکاندا، بەتایبەتی شەکونتەلا، یەجگار سەرکەوتووە.

## حیکایەت و چیرۆکەکان

هیندوانی کۆن لەحیکایەتخوانیدا بەتوانا و بەهرەدار بوونە، سەرچاوەی زۆربەی ئەو حیکایەتە میللییانەی کە لەسەرانسەری جیهاندا بەشێوە و قالبی جۆراوجۆر بلاوبوونەتەوە، حیکایەت و چیرۆکی هیندییە، هەندێك نموونە لەم چیرۆکانە، کە زۆربەیان بەمەبەستی ئامۆژگاری یان ئایینی نووسراون، بریتین لە:

**(جاتاکا-jataka)** (دەگەڕێتەوەبۆ دەوروبەری سالی سێ سەدی پێش زایین). ئەم بەرهەمە بریتییە لەپێنج سەد و پەنجا حیکایەتی خەیالی کە تایبەتن بەلەدایکبوونی بودا و سەرەتای ژیانی بوودا کە لەگینە خۆی ئەو بەسەرهاتانەی گێڕابێتەوە، گەلێك لەم حیکایەتانە چیرۆکی گیاندارانە (فابیل) و زۆربەشیان چیرۆکی میللی پەند و ئامۆژگارین.

**(پەنچەتەنترە) یان (پێنج کتێب)** ئەم بەرهەمە دەگەڕێتەوە بۆ دەوروبەری سالی سێ سەدی پێش زایین. ئەمە کۆمەلە حیکایەتێکە بەزمانی سەنسکریتی، کە لەوەیە وەکو کتێبێك بەمەبەستی فێرکردنی شازادان دانرابێت. هەموو حیکایەتەکان لەیەك چەشنە فۆرم و قالبدا هاتوونەتە گێڕانەوە: حەکیمێکی براهمانی بەمەبەستی فێرکردنی شەش شازادەی لاو، ئەم حیکایەتە پەندئامێزانە دەگێڕێتەوە.

ئەم کتێبە پێنج بابی هەیە: ١-دابڕانی دۆستان. ٢-گرتنی دۆستان. ٣-شەڕی کوندو قەلان. ٤-لەدەستدانی خوی وەرگیراو. ٥-ئەنجامدەری کاری خۆسەری، حیکایەتەکانی ئەم کتێبە لەزمانی گیانلەبەرانەوە دەگێڕدرێنەوە و بەسەرچاوەی گەلێك لەحیکایەتەکانی سەدەکانی ناڤین دەژمێردرێن.

(هیتو پاشا) یا (کتێبی پەندێن چاك) (مێژووی دانانی ئەم بەرهەمە نادیارە، دەکەوێتە دوای پەنجە تەنتەرە) ئەم بەرهەمە بریتییە لەچوار کتێب کە چل و سێ حیکایەتی لەخۆگرتووە و بیست و پێنج حیکایەتی لەکتێبی پەنجەتەنتەرەوە وەرگیراوە، حیکایەتەکانی ئەم کتێبە لەچاو حیکایەتە کۆنترەکانەوە، کورتتر و بەناوەرۆکترن.

**(شوکاساپتاتی) یا (هەفتا چیرۆکی توتی)** (مێژووی دانانەکەی نادیارە) ئەمە بریتییە لە کۆمەڵێك حیکایەتی پەرییان.

## هۆزانێن لیریکی

جگە لەبەرهەمی ئایینی و سروودێن ستایشی ئایینی، زۆربەی شاعیرانی هیندی کۆن لەسەدەی یەکەمی پێش زایین بەملاوە، زۆر شیعری لیریکییان گوتووە و لەزۆربەی ئەم شیعرانەدا جوانی و جۆش و خرۆش شەپۆل دەدات.

دیارە هەندێك لەڕابەرانی ئەم لیریکا بێژانە بریتیین لە:

**١- کالیداسا (٣٥٠-٥٠٠ زایین)** کە بەشیعری ناسك و پڕ سۆز و گوداز بەناوبانگە، لەوانە شیعری (مگادوتا) و (پەیکی هەور).

**٢- جایادیڤا (لەدەوروبەری ١٢٠٠ زایینیدا ژیاوە)** کە گرنگترین بەرهەمی بریتییە لە: (گیتا گوڤیندا) و (ئاوازی گاگەل) کە شیعرێکی لیرێکی مەیلەو درامییە لەبواری ئاشقینی کریشنادا.

# ئەدەبیاتی چینی

**پێشینەی مێژوویی:**

رەگ و ریشەی نەژاد و شارستانییەتی چینی بەتەواوەتی نەزانراوە. توێژینەوەکانی ئەم دواییانە ئەوە نیشاندەدەن کە نزیکەی بیست هەزار ساڵێك پێش زایین شارستانییەتێك لەمەغولستاندا هەبووبێت، لە حیکایەت و ئەفسانانەدا باسی حوکمڕانی و کاری کشتوکاڵی و بەرکاهێنانی عەرەبانەی پێچکەدار لەدەوروبەری ساڵی دوو هەزار و هەشت سەدی زاییندا کراوە، بەڵام بەدڵنیاییەوە لەو سەردەمانەدا کە ئەوروپا لەحاڵی نیمچە وەحشییەتدا بووە، شارستانییەتی چین لەقۆناغێکی پێشکەوتووی پرشنگداردابووە، دەربارەی مێژووی چین، تاوەکو سەدەی هەشتەمی پێش زایین قەواڵەیەکی ئیحتوباردار، لەبەردەستدا نییە، لەوەش بەدواوە تاسەرەتای خانەدانی تانگ (دەوروبەری ساڵی شەش سەدی زایین) مێژووی چین بەشێوەیەکی گشتیی مێژوویەکی پڕ ئاژاوە و بێ سەروبەر و مێژووی تاڵان و بڕۆ و وردە شەڕان بووە، دەتوانرێت ئەم سەردەمە بەسەر سێ قۆناغدا دابەشبکرێت:

١.قۆناغی فیودالی (٧٠٠-٢٠٠ پێش زایین).

٢.قۆناغی خانەدانی هان (٢٠٠ پێش زایین-٢٠٠زایین).

٣.قۆناغی خانەدانانی بچووك (٢٠٠-٦٠٠ زایین).

**نۆڕینێکی گشتی:**

مەودای ئەدەبیاتی چینی کۆن یەجگار فراوانە و هەموو فۆرمە ئەدەبییە زانراو و باوەکان لەخۆ دەگرێت، واتا مێژوو، فەلسەفە، لیریکا، چیرۆك، شانۆنامە و نامە، لەخۆدەگرێت، زۆربەی ئەدەبیاتی کۆنی چینی پەیوەستە بەسێ ئایین لەچوار ئایینە سەرەکییەکەی ئەو وڵاتە-ئایینی

کۆنفوسیوس، ئایینی تاوو، ئایینی بودا، و (ئایینی مەسیحییەت کە دواتر بۆ چین دزەی کردو و چوارەمین ئایینە)، ئێمە ئێستاکێ ناو و بەرهەمی زۆر لەفەیلەسووفان، شرۆڤەکاران، شاعیران، مێژوونووسان، فەرهەنگنووسان و پەیامبەرانی سەردەمانی کۆنی چینمان لەلایە.

## فەلسەفە

**لایۆتزو (٦٠٠-٥٣١ پێش زایین)** زانا و حەکیمێکی گەورەی چینییە، بەرهەمی تایو-د-جینگ واتە شێوە یا رێگەی ژیان دەدرێتە پاڵ ئەو (لەوەشە ئەمە هەڵەبێ)، ئەم بەرهەمە بونیادی تاویزم واتە ئایینی ئایدیالیستی چینییەکان پێکدێنێت.

**کونفوسیۆس: یا کونگ فو-تزو (٥٥١-١٧٩ پێش زایین)** فەیلەسووف، سیاسەتوان، مامۆستا و دامەزرێنەری ئەدەبیاتی چینییە، هەرچەندە بەگەورەترین رابەری ئایینی چین دەژمێردرێت، بەڵام بەخۆی پتر شەیداو سەوداسەری بنەمای کۆمەڵایەتی، ئەخلاقی و سیاسی بوو تا بابەتێن ئایینی، لەواری پراکتیکیدا شتێکی ئەوتوێ دەربارەی ماهیەتی خوا یا ژیانی پاش مەرگ، نەدەگوت و زیاتر دڵبەندی چۆنیەتی کار بوو لەزەمانی حازردا، یەجگار تامەزرۆی فێربوون بوو، هێندە مکوڕ بوو لەسەر فێربوونی زانستان، تا سەرەنجام بوو بەزاناترین زانایانی زەمان و رۆژگاری خۆی، پاراستن و بڵاوکردنەوەی دابونەریت و یاسا و رێسایانی بەئارمانجی هەرە دیاری خۆی دەزانی، بناغەی زانیاری و ئامۆژگارییەکانی ئەو بریتی بوو لەگەڕانەوە بۆ پەندی پێشینان و پەیڕەوکردنی زانستەکانی ئەوان.

**(پێنج کتێبی کلاسیك)** (لەدەوروبەری ساڵی پێنج سەدی پێش زایین نووسراوە) ئەم بەرهەمە بە(پێنج کتێبی کلاسیك) بەناوبانگە لەلایەن خودی کونفوسیۆس-ەوە لەدەوروبەری ساڵی پێنج سەدی پێش زایین کۆکراوەتەوە و رێکخراوە.

**کتێبـی گۆڕانکاری (یی کینگ):**

ئەم کتێبە دەدرێتە پاڵ وەنگ وەنگ (دەوروبەری ساڵی ١١٤٠ی پێش زایین) ئەم بەرهەمە لەپێکهاتەی ئەندازەیی شەش خەت پێکهاتووە، لەگەڵ شەست و چوار گوتاردا کە بریتین لەکۆمەڵێك روونکردنەوە دەربارەی پێکهاتەی کتێبی ناوبراو، چینییەکان ئەم کتێبەیان بۆ پێشبینی و غەیببێژی بەکاردەهێنا و هەندێکیان پێیان وابوو کە فەلسەفەیەکی نهێنی و قوڵی تێدایە، بەڵام کەس پەی بەو راز و نهێنییانە نەبردووە.

**ئادابنامە (لی کی):**

ئەمە کتێبێکی چەند بەرگییە دەربارەی ئاداب و نەریتی تێکەڵبوون و معاشەرەت کە لەلایەن دوو ئامۆزای تایی-یەوە (لەدەوروبەری سالّی سەدی پێش زایین) دووبارە نووسراوەتەوە، بنەما و هەوێنی کارەکەی ئەو جووتە ئامۆزایە کۆمەڵە بەڵگەنامە و قەواڵەیەك بووە کە تەسەور دەکرێت لەلایەن کونفوسیوسەوە نووسرابن، بەرهەمێکی کلاسیکی شەشەم بەناوی دەستووری خانەدانی چو، هەیە کە لەسەردەم و رۆژگارانێکدا بەهاوتای ئادابنامە دانراوە.

**کتێبــی مێژوو (شوکینگ):**

سەرچاوەکانی ئەم کتێبە دەگەڕێتەوە بۆ سالّانی ٢٤٠٠-٧٥٠ی پێش زایین، لەو کتێبەدا باسی یاساکانی ئارمانجی سیاسی و پرەنسیپی حکوومەتی دڵخواز دەکرێت.

**کتێبــی چامەکان (شی کینگ):**

ئەم کتێبە بریتییە لە ٣٠٥ شیعری هەڵبژاردە (واباوە کە ئەم شیعرانە لەدیوانێکی سێ هەزار شیعرییەوە کە لەسەدەکانی کۆندا نووسراوەتەوە، وەرگیراون).

کتێبی چامەکان رەنگدانەوەی پشکوتنی خەیاڵ و هەستی پێشینانە، شیعرەکانی ئەم کتێبە بریتیین لەو شیعرە لیریکی و چامانەی کە لەشوێن و بۆنەی جۆراوجۆردا گوتراون، هەڵبەتە کتێبی چامەکان لەو رووەوە کە رەنگدانەوەیەکی روونی ئاداب و رسوماتنامەی چینییانی کۆنە، بایەخێکی یەکجار فرەی هەیە.

**سالّنامەی بەهار و خەزان (چون چی یو):**

شەیدایانی ئەم بەرهەمە کلاسیکییە بۆیە ناویان ناوە سالّنامەی بەهار و خەزان، چونکە ستایشەکانی وەکو بەرهار دلگیر و تەرو تازەیە و رەخنەکانی وەکو خەزان سارد و خەمینە، لەم کتێبەدا بابەتی فەلسەفی ئەوتۆ بەدی ناکرێت، بەلّام لەباری نیشاندانی مێژووی زێدی کونفوسیوسەوە لەسالّانی ٧٢٢-٤٨٤ پێش زایین، زۆر بایەخدارە.

**گوتار و گفتوگۆکان (لون یو):**

ئەم بەرهەمە لەدەوروبەری سالّانی ٤٥٠-٣٧٥ی پێش زایین دانراوە. ئەم کتێبە لەبیست و چوار فەسڵ پێکهاتووە و بریتییە لەگوتەکانی کونفوسیوس، کە موریدەکانی کۆیانکردووەتەوە و بەباشترین سەرچاوەی ناسینی کونفوسیوس دەژمێردرێت.

**مینسیوس یا مینگ تزو (٣٧٢-٢٨٨ پێش زایین)**

سیاسەتوان و- فەیلەسووف و مامۆستا بووە و حەوت کتێبی فەلسەفی لەسەر بنەمای ئامۆژگارییەکانی کونفوسیوس داناوە، مینسیوس کە پایەیەکی ئەخلاقی کەمتری لەمامۆستاکەی هەبووە، زیاتر رموودەی ئابووریی سیاسی بووە.

**چوانگ-تزو (لەدەوروبەری ساڵی ٣٥٠ی پێش زایین ژیاوە:**

خاوەنی کتێبێکی گەورەی ئەفسانە و نەقڵ و حیکایەتان بووە، کە هەندێ بەشی فەوتاوە.. ئەم پیاوە هێرش دەکاتە سەر ئایینی کونفوسیوس و بەرەڤانی لەئایینی تاو دەکات، خاوەنی شێوازێکی دڵگیر و تەنز و توانجی زیرەکانە بووە.

## هۆزان

لەپاش مەرگی کونفوسیوس، قوتابخانەیەکی شیعری نۆباو هاتە ئاراوە کە لەڕووی دەربڕینی زیندوو، کێشی ئازاد و رەمز و ئیستیعارەوە مایەی سەرنجە، هۆزانێن کۆنی چینی قافیەدار بووە (بەر لەساڵی شەش سەدی زایینی)، درێژی بەیتەکان جیاواز بووە، بەڵام بەزۆری چوار یان پێنج هیجایی بووە، لەپاش ساڵی شەش سەدی زایینییەوە ئیدی بەیتی حەوت هیجایی باوی سەندووە، (بڕوانە کتێبی چامەکان، کونفوسیوس).

**چویوان (لەدەوروبەری ساڵی سێسەد و پەنجای پێش زایین ژیاوە):**

شاعیر و سیاسەتوان بووە، شیعرێکی درێژی هەیە بەناوی (گرفتاری و دەردیسەری) کە باسی ژیان و بەسەرهاتە سەیرەکانی خۆی دەکات، ئەم شیعرە پڕە لەڕووداوانی خەیاڵ ئەنگێزی وەکو سەفەر بەگالیسکەی ئەژدیها و سەردانی کاکێشان.

**می شنگ (لەساڵی ١٤٠ی پێش زایین مردووە):**

لەڕووی فۆرم و قاڵبی شیعرەوە لە (چویوان) کۆنەپارێز تر بووە، می شنگ کە لەبەر شیعرە پێنج هیجاییەکانی و غەزەلە ئاشقانەکانی بەنێو بانگە، بەتەواوەتی لەژێر کاریگەری کتێبی چامەکانی کونفوسیوسدا بووە.

**وانگ تسان (١٧٧-٢١٧ی زایین):**

شاعیرێکی هزرڤان بوو، کتێبێکی دەربارەی شیعر هەیە و گەلێك شیعری حەسرەتباری دەربارەی سەرگەردانی خۆی نووسیوە.

**لیولینگ (لەدەوروبەری سالآنی ۲٥۰ی زایین ژیاوە):**

شاعیر و یەکێك لەحەوت حەکیمانی (قوتابخانەی شاعیرانی بادەنۆش) بووە، ناو و شۆرەتی بۆ ئەو شیعرانە دەگەڕێتەوە کە لەستایشی شەراب و ئایینی تاودا نووسیونی.

**تایوچی ین یا تایویوان مینگ (۳٦٥-٤۲۷ی زایین):**

لەشاعیریدا وەستا بوو، زیاتر بەوە شۆرەتی پەیداکرد کە دەستی لەپۆستێکی گرنگی دەزگایەکی حکوومەتی کێشابووەوە، چونکە نەیدەتوانی (لەپێناوی پێنج پەیمانە برنجدا هەموو ڕۆژێك سەر بۆ ئەم و ئەو دابنەوێنێت). شیعرەکانی زیاتر ڕەمزی، سیاسی، فێرکاری و وەسفییە و هەندێکیانی ڕاستەوخۆ لەبەر گوتووە، گەلێك لەسروود و شیعرەکانی بەلگەی هەستی قولّ و ڕاستگۆیی و جۆش و خرۆش و کارامەیی ئەون لەواری شاعیریدا.

**وانگ چی (لەدەوروبەری سالّی ٦۰۰ی پێش زایین ژیاوە):**

گەلێك بەرهەمی جوانی بەشیعر و بەپەخشان نووسیوە و جوانترینیان (چیرۆکی سەردانی سەرزەمینی مەستان)ە.

## مێژوو

**سو- ماچی ین (۱٤٥-۸۷ی پێش زایین).**

باوکی مێژووی چینە، بەرهەمێکی زۆر گەورەی هەیە بەناوی بیرەوەریی مێژوویی (شی چی) کە مێژووی چینی لەسالآنی ۲٦۹۷ ەوە تا سالّی ۱۰۰ی پێش زایین لەخۆگرتووە، ئەم کتێبە کە بریتییە لە ۱۳۰ فەسلّ، پێنج بابی هەیە: ۱.سالّنامەی خاقانەکان. ۲.خشتە زەمەنییەکان. ۳.سروود، مۆسیقا، ئەستێرەناسی، قوربانیان، ئاو و ئاوەڕۆ، سیاسەتی ئابووری. ٤.سالّنامەی نەجیب زادانی تیولدارو. ٥.ژیاننامەی پیاوانی ناودار.

**پان پیایو، پان کو، پان چایوی خوشکیان (دەوروبەری سالّی پەنجای زایین).**

ئەم سێیانە کتێبێکی مێژوویییان هەیە دەربارەی خانەدانی هان، ئەم کتێبە ڕووداوەکانی سالآنی ۱۰۰ی پێش زایین)ی لەخۆگرتووە و بەرهەمێکی مەزنی ۱۲۰ بەرگییە.

## سەفەرنامە

**فاهسی ین یان فا - هی ین (لەسالآنی نێوان ۳۹۹-٤۱٤ی زایین ژیاوە):**

ئەم گەڕیدە حیکایەتخوانە لەساڵی ٤١٤ زایینی سەرفەرنامەی هیندی نووسیوە، کە هەواڵی سەفەری زەمینی خۆیەتی لەجەرگەی چینەوە تا وڵاتی هیند و ئەوجا درێژەی سەفەرەکەیەتی بەکەشتی بۆ سیلان و جاوە و گەڕانەوەی بۆ شانتونگ، شێوازی پەخشانەکەی کورت و دژوارە، بەڵام زانیارییەکانی دەربارەی چینی کۆن و هیند، و ئایینی بودا، بۆ توێژەران یەجگار بەنرخە.

# ئەدەبیاتی عیبری

**پێشینەیەکی مێژوویی:**

خەلکی فەلەستینی کۆن سامی نەژاد بوونە و پەیوەندی نزیکیان لەگەڵ عەرەب و ئاشوورییەکاندا هەبووە. بەگوێرەی کتێبی موقەددەس ئیبراهیم (باپیرە گەورە و دامەزرێنەری قەومی جولەکە) لە نەسڵدا کلدانی بووە. ئیدی قەومی بەنی ئیسرائیل بە هۆی قات و قڕی و وشکە ساڵییەوە لە فەلەستینەوە بۆ میسر کۆچ دەکەن و بۆ ماوەی ساڵانێکی زۆر لەوێ ئاکنجی دەبن. سەرەنجام بۆ فەلەستین دەگەڕێنەوە و دەکەونە ژێر رکێفی حکومەتی "داوەران"ەوە کە هەم رابەری سوپایی بوون و هەم رابەری ئایینی.

بە بەردەوامی شەڕ و شۆڕی بچووك لە نێوان عبرانییەکان و قەبیلە نەیارەکاندا روو دەدات، تا لە ئەنجامدا شاهان جێی داوەران دەگرنەوە. گەورەترین شاهانی ئەم قەومە داود (دەوروبەری ٩٩٠ی پێش ز)و سلێمانی (٩٦٠ی پێش ز) کوڕی داودن. کە لە سەردەمی ئەواندا بەنی ئیسرائیل توانا و شان و شەوکەتێکی زۆر بە دەست دێنن.

لە دوای پاشایەتی سلێمان ئیدی قەڵەمڕەوی حکوومەت تێکدەچێ و دابەش دەبێ —لە باکوور ئیسرائیل دروست دەبێ و لە باشوور یەهودییە دێتە ئاراوە، ئۆرشەلیم دەبێ بە پایتەختی یەهودییە. جەنگ لەگەڵ دەرودراوسێیاندا بەردەوام دەبێ.

لە ساڵی ٧٢١ ی پێش ز دا ئیسرائیلییەکان دەکەونە ژێر دەستی ئاشوورییەکان، و دانیشتوانی دەوڵەتی باشووریش لە ساڵی ٥٨٦ی پێش زدا دەکەونە ژێر دەستی بابلییەکان. لە ساڵی ٥٣٨ی پێش زدا، بە فرمانی کۆرشی شای پارس لە ئەسارەت رەها دەبن و بۆ فەلەستین دەگەڕێنەوە، شارەکانیان ئاوەدان دەکەنەوە و زنجیرە سەرکەوتنێکی بەرچاو بەدەست دێنن.

لەو سەردەمانەی کە یۆنانییەکان و رومییەکان بە نۆرە بوون بە زلهێزی جیهان، فەلەستینیان خستە ژێر چنگی خۆیانەوە. سەرەنجام تیتوس-ی ئیمپراتۆری روم لە سالّی هەفتای زایینیدا، ئۆرشەلیمی وێرانکرد و هەموو هیوا و ئومێدێکی خۆیبوونی سیاسی بەنی ئیسرائیلی بە بادا.

نۆرینێکی گشتی:

هەر هەموو ئەدەبیاتی کۆنی عیبری لە راستیدا ئاوێتەی مەزهەب و ئایینە، جولەکە لە کۆنی کۆنەوە ئاشقە مەزهەب و ئایین بوونە و هەردوو بەرهەمە مەزنە ئەدەبییەکەیان، واتە: - کتێبی موقەدەس و تەلمود- باسی ماهیەتی پەروەردگار و یاسا خواییەکان و حوکم و پێوەرە ئەخلاقییەکان دەکەن، قەومی یەهود (جولەکە) کە لە سەرەتادا ئانیمیست بوون و باوەڕیان بە فرە خوایی هەبوو بەرە بەرە پەرەیان بە یەکێك لە بەرزترین چەمکەکانی خواناسی بەخشی. لە رۆژگارانی سەرەتا و رابردوو باوەڕیان وابوو کە یەهڤە (خوای تیرەی ئیسرائیل) رووگرژ، رقن، هەوەسباز و خوێن رێژە. ئەم چەمکە بە درێژایی چەند سەدەیەك پەرەی سەند و گۆڕا، ئیدی دادپەروەری، رەحمەت، پیرۆزی، پارێزکاری و گەورەیشی درایە پالّ.

زۆربەی بەشەکانی (سەردەمی کۆن- Old testament) لە سەرەتادا بە زمانی عیبری بووە کە لقێکە لە بنەمالّەی زمانانی سامی باکووری رۆژئاوا و پەیوەندی بە زمانانی ئارامی و فینیقییەوە هەیە. ئەم زمانە هەر چەندە لەڕووی رێزمان و بونیادی رستەوە سادەیە، بەلاّم توانای ئەوەی هەبووە کە بە روونی و رەوانی دەرەقەتی دەربڕینی (سەردەمی کۆن) واتە (تەورات) بێت. چەند بابێکی تەورات بە ئارامی نووسراوە. (سەردەمی تازە) واتە ئینجیل پێدەچێ هەوەلّجار بە یۆنانی نووسرابێ.

ئەدەبیاتی عیبری کۆن هەر چەندە بە شێوەیەکی ناچاری ئاوێتەی مەزهەب و ئایین بووە، بەلاّم زۆر دەق و نووسینی دیکەی وەکو: مێژوو، سروود، ئەفسانەی میللی، حیکایەتی نمایشی، ژیننامە، نامە، چیرۆکی کۆن، و زۆر بابەتی دی لەخۆ گرتووە.

## کتێبی موقەدەس Bible

ئەم کتێبە پتر لە هەر کتێبێکی تر لە جیهاندا دەخوێنرێتەوە، پتر لە هەر کتێبێکی تر بۆ سەر زمانان و شێوە زارانی هەمەجۆر وەرگێڕدراوە. لە زمانی ئینگلیزیدا، ئەو تەرجەمەیەی کە بە تەرجەمە شاجیمز"[١]" (١٦١١) ناسراوە، وێڕای ئەو هەلاّنەی کە تیایدایە، بە رەسەنترین

وەرگێڕانی ئەدەبی کتێبی موقەددەس لە قەڵەم دراوە. ئەم کتێبە لەڕاستیدا بریتییە لە ٦٦ کتێب (بە کتێبە دەستکردەکانەوە دەگاتە هەشتا کتێب). کە مێژووی هەر یەکێکیان (بە گوێرەی ئەو شێوەیەی ئێستای) دەگەڕێتەوە بۆ نێوان سالانی ٧٥٠ی پێش ز و دەوروبەری سەدی زایینی. کتێبی موقەددەس بریتییە لە سێ بەش: تەورات، ئینجیل و ئاپوکریف (سفرە دەستکردەکان)، کە ئەم بەشەش لە وەرگێڕانە ئینگلیزییەکەی شاجیمزدا فەرامۆش نەکراوە.

## سەردەمی کۆن (تەورات):

ئەمە کۆنترین بەشی کتێبی موقەددەسە و بریتییە لە شەریعەتی موسا و هەندێ نووسینی جولەکەکانی دیکە، تەورات لە سی و نۆ سفر، واتە کتێب پێکهاتووە کە دابەش دەبێ بەسەر شەش دەستەدا: مێژووی رۆژگاران، کتێبی پەیامبەران، هۆزانین لیریکی، چیرۆکی نمایشی، ئەدەبیاتی پەندو ئامۆژگاری و چیرۆکان. هەڵبەتە هەندێ تەقسیمبەندی دیکەش هەن، لەوانە دابەشکردنی کتێبی موقەددەس بەسەر: قانون، مێژوو، شیعر، پەیامبەرانی ئولول عەزم و پەیامبەرانی (واتە پەیامبەرانی خاوەن کتێب) نە ئولولعەزم، هەڵبەتە ئەم دابەشکردنە نە لە باری ریزبەندی لوجیکییەوە دروستە و نە لەڕووی ریزبەندی مێژووییەوە.

## مێژووی رۆژگاران:

ئەم کتێبانە باسی مێژووی جولەکان (وێڕای چەند بۆشاییەك) لە سەرەتای دروستبوونی جیهانەوە تا نۆژەن کردنەوە و ئاوەدانکردنەوەی ئورشەلیم پاش گەڕانەوەیان لە تاراوگە و ئەسارەت بە دەستی بابلییەکان، دەکات.

شەش کتێبەکەی مێژووی رۆژگاران، واتە سفری پەیدا بوون، سفری دەرچوون، سفری لاویان، سفری ژماران، سفری دوانی و سەحیفەی (کتێبی) یوشع، کە بە کۆی شەش کتێبان ناسراون یەکەمین تەورات پێکدێنن. لەم شەش کتێبە، پێنج کتێبی یەکەمیان (تەورات یا شەریعەتی موسا، تا سالانێکی زۆر بە هەڵە دەدرانە پاڵ موسا، مێژووی شەش کتێبی یەکەمین تەورات بەم شێوەیەی ئێستای دەگەڕێتەوە بۆ دەوروبەری سالی ٣٥٠ی پێش ز، لەوەیە هەندێ بەشی لە سەرەتاکانی سالی ٩٥٠ی پێش ز نووسرابێ.

## کتێبی پەیدا بوون (دروست بوون):

یەکەمین یازدە بابی کتێبی پەیدا بوون شرۆڤەیەکە دەربارەی خولقاندن: خولقانی جیهان و مرۆڤ (١-٢)، دابەزینی ئادەم و حەوا (٣) کوشتنی هابیل بە دەستی قابیل (٤)، تۆفانی نوح (٥-١٠)، بورجی بابل (١١). بابەکانی دیکە بریتیین لە چوار چیرۆك دەربارەی ئیبراهیم (١٢- ٢٣).

ئیسحاق (٢٤- ٢٦)، یەعقوب (٢٦- ٣٦)، و یوسف (٣٧- ٥٠) .

لە بابەکانی دیکەدا زۆر چیرۆکی بەناوبانگ تۆمارکراوە لەوانە: چۆنیەتی بەئەکبوونی ژنەکەی لوت (١٩)، قوربانی بوونی ئیسحاق بە دەستی ئیبراهیم (٢٢). زەماوەندی یاقوب لەگەڵ لییە و راحیل (٢٩). پەیژەی یاقوب (٢٨)، فرۆشتنی یوسف لە میسر (٣٧)، سەربهوردی ژنەکەی فوتیفار و یوسف (٣٩)، خەونی فیرعەون (٤١)، و سەفەری یاقوب بۆ میسر.

**کتێبــی دەرچوون:**

ئەم سفرە (کتێب) باسی هیجرەت و کۆچی ئیسرائیلییان لە میسرەوە بۆ فەلەستین بەرابەرایەتی موسا دەکات. هەندێ لە رووداوە گرنگەکانی دیکەی ناو ئەم کتێبە بریتین لە: دۆزینەوەی موسا لە سەبەتەی حەسیردا (٢)، بەڵاکانی میسر (٧-١١)، بناغەی دروستبوونی جەژنی نانی فەتیر (١٢)، سروودی موسا (١٥)، دە فرمان (٢٠). بەشی دووەمی ئەم کتێبە زیاتر تەرخانە بۆ یاساو راڤە و شروڤە و سروود و رێ و رەسمان.

**کتێبــی لاویان:**

ئەم کتێبە سیستەمی حقوقی و ئایینی دەگرێتەخۆ و ئەو داب و نەریتانە دەردەبڕێ کە پەیوەستن بە عیبادەت، قوربانی، پاکبوونەوە و رەفتار و هەڵسوکەوتی نادەمیزادان. سەرچاوەی یاسا و حوکمەکانی بەشێك لەم کتێبە (حوکمە پیرۆزەکان، بابی ١٧- ٢٦) بریتییە لە سەردەمی بندەستی و ئەسارەتی جولەکە (٧٢١- ٥٣٨ی پێش ز). لەم بابانەدا زیاتر تەئکید لەسەر دروستکاری و نیازچاکی کراوە تا رەچاوکردنی وردەکاری سروود و رێورەسمی پەرستنکاری.

**کتێبــی ژماران:**

لەم کتێبەدا باسی سەرژمێری ئیسرائیلییان و یاسا و فەرمانانی ئایینی و، کۆمەڵێك حیکایەت دەربارەی موسا کراوە. دیارترین حیکایەتی ناو ئەم کتێبە بریتییە لە دەرهاتنی ناو[٢] لەو تاوێرەی کە موسا دارعاساکەی پێدا کێشا (٢٠)، هەروەها هاتنە زمانی کەرەکەی بەلعام-ی پەیامبەری سەرزەمینی دۆڵی دوو رووبار[٣] .

**کتێبــی دووانی:**

هەوێنی ئەم کتێبە نووسراوێکە بە نێوی (کتێبی قانون) کە لە ساڵی ٦٢١ی پێش ز، لە پەرستگەی ئۆرشەلیم دۆزراوەتەوە، کتێبی دووانی زیاتر دووبارە کردنەوەی کتێبی لاویان ــە، بەڵام کۆمەڵێ حیکایەتی تازەشی تێیدایە کە تایبەتە بە سەرگەردانی عیبرانیان لە ساراو بیاباندا. ئەم کتێبە بە مردنی موسا (بابی ٣٤) کۆتایی دێت.

**کتێبی یوشع:**

کتێبێکی مێژوویییە بریتییە لەسەربهووردی یوشع کە لە پاش مەرگی موسا، رێبەرایەتی عیبرانیان لە ئەستۆ دەگرێ. لەم کتێبەدا چیرۆکی چوونە کەنعان و جەنگ لەگەڵ تیرە و قەبیلە نەیارەکاندا بە جۆرێ باسی کراوە، پێدەچێت مەبەست لەوە دروستکردنی قارەمانێکی جەنگاوەری میللی بووبێ. هەندێ لە فەسڵە بەرجەستەکانی کتێبی یوشع بریتین لە: کەوتنی ئابلوقەی شاری ئەریحا (٦)و کوژانەوە و ئاوا بوونی مانگ و هەتاو.

**کتێبی داوەران:**

(کۆنترین شێوەی ئەم کتێبە دەگەرێتەوە بۆ دەوروبەری ساڵی ٨٥٠ی پێش ز... ئەم شێوەیەی ئێستای دەگەرێتەوە بۆ ٥٥٠ی پێش ز):

لەم کتێبەدا مێژووی بەنی ئیسرائیل لە دوای مەرگی یوشع-ەوە دەگێردرێتەوە و ژیان و جەنگەکانی جولەکان لە سایەی رێبەرایەتی داوەراندا باس دەکرێ. بەشە گرنگەکانی ئەم کتێبە بریتین لە: سەرکەوتن و سروودی دەبور (٤-٥) کە لەگینە لە ساڵی ١١٠٠ی پێش ز نووسرابێ. جەنگەکانی جیدعون (٦-٨)، حیکایەتی ئابیملك (٩)، چیرۆکی کیژی یەفتاح (١١)و چیرۆکی شەمشون (١٣-١٦).

**کتێبی یەکەمی سموئیل (دەوروبەری ٥٥٠ی پێش ز):**

درێژەی مێژووی ئیسرائیلیان لە سەردەمی داوەران و شائول-ی یەکەمین پاشای ئیسرائیل، لەم کتێبەدا تۆمار و شەرح کراوە. لەنێو جوانترین حیکایەتین ئەم کتێبەدا دەکرێ ئاماژە بۆ ئەمانەیان بکرێ: بانگکردنی سمۆئیل (٣)، پیرۆزاندن و چەورکردنی شائۆل (٩-١٠)، جەنگی داود لەگەڵ جولیات دا (١٧)، پەیمانی داود لەگەڵ یوناتان دا(١٨-١٩). قەستی گیانی داود لەلایەن شائول ٥٠٠ وە (٢٠-٢٧).

**کتێبی دووەمی سمۆئیل (دەوروبەری٥٥٠ی پێش ز):**

ئەم کتێبە زیاتر باسی دەسەلات و پاشایەتی داود دەکات. زەماوەندی داود لەگەڵ بتشبع دا (١١-١٢) و هەرای ئابشالوم (١٣-١٨) لە فەسڵە جوانەکانی ئەم کتێبەن .

**کتێبی یەکەمی پاشایان (دەور وبەری ٥٥٠ی پێش ز ):**

ئەم کتێبە باسی مێژووی سەردەمێك دەگێرێتەوە کە لە مەرگی داودەوە تا هاتنەسەر تەختی ئەحازیا (تەختی پاشایەتی ئیسرائیل) لەخۆ دەگرێت. مەبەست و ئامانجی ئەم کتێبە سەلماندنی ئەم خاڵەیە کە خوا دۆستانی خۆی رزگار دەکات و دوژمنان بە سزای خۆیان دەگەیەنێ.

گرینگترین بەشی ئەم کتێبە دەربارەی: بینای پەرستگەی سلێمان (٦)، سەردانی شابانۆی سەبەء بۆ ئۆرشەلیم (١٠)، دابەشکردنی قەڵەمڕەوی حکوومەت (١٢)، وپێشبینی و موعیزاتەکانی ئیلیا-یە (١٧-٢٢).

**کتێبی دووەمی پاشایان (دەوروبەری ٥٥٠ی پێش ز):**

لەم کتێبەدا باسی رووخانی قەڵەمڕەوی دەسەڵاتی ئیسرائیل (٧٢١ی پێش ز) و مەملەکەتی یەهودا (٥٨٦ی پێش ز) بە دوور و درێژی دەگێڕێتەوە مەبەست لە نووسینی ئەم کتێبە هەمان مەبەست و ئارمانجی کتێبی یەکەمی پاشایانە، بەنێوبانگترین بابەکانی ئەم کتێبە دەربارەی موعیزاتی ئەلیەشع (بابی ١-٨)، رووخانی ئیسرائیل (١٧)، هێرشی سەنحاریب (١٨-١٩)، ریفۆرمەکانی یوشیا (٢٢- ٢٣) و رووخانی مەملەکەتی یەهودایە (٢٥).

**نەحمیا (دەوروبەری ٣٠٠ی پێش ز):**

ئەم کتێبە بریتییە لە بیرەوەرییە شەخسییەکانی نەحمیای رابەر و پێشەوای سیاسی جولەکان، لە سەردەمی گەڕانەوەیان لە ئەسارەتی بابل، کتێبەکە باسی نۆژەنکردنەوە و ئاوەدانکردنەوەی قەڵات و شوراکانی ئۆرشەلیم و ریفۆرمە ئایینییەکانی نەحمیا دەکات.

**کتێبی پەیامبەران:**

پەیامبەری سەردەمی کۆن کاری بە کەهانەت و پێشگۆییەوە نەبوو، بەڵکو بەپێشەوای ریفۆرمی کۆمەڵایەتی و مەزهەبی دەژمێردرا، قسەکانی خوای دەگوتەوە، خەڵکی لە کردارە ناپەسن و نابەجێیەکانیان هۆشیار دەکردەودو هەڕەشەی فەوتان و بەڵایان لەوانە دەکرد کە لە کاری خۆیان ژێوان نەدەبوونەوە. ئیلیا و ئەلیەشع بە یەکەمین دوو پەیامبەر دێنە ژماردن، بەڵام هیچ نووسراوێکیان نەدراوەتە پاڵ. واتە هیچ نووسینێکیان لە پاش بەجێ نەماوە. گۆڕانکارییەکی زۆر لە رێباز و گۆشە نیگای جێگرانی ئەوان هاتە ئاراوە —عاموس هەڕەشەکانی بە دەنگی زۆر بەرز دەکرد و هوشع بە دەنگی ئارام و هێمن داوای لە خەڵکی دەکرد کە رێگەی خوا بگرنە بەر، ئیرمیا خەمبار و رەشبین بوو، و پەیامبەری گومناو (ئەشعیای دووەم) زۆر گەشبین و یەزدان پەنا بوو، وێڕای ئەمەش، هەموویان خەڵکیان بۆ دروستکاری هاندەدا، و هەندێ جاری ئەوەندە پڕ خەیاڵ و زمان پاراو بوون کە شیعری زۆر درێژیان دەهۆنیەوە. لێرەدا کورتەیەك لەمەڕ مەنشورترین کتێبی پەیامبەران باس دەکەین. کتێبەکانی دیکە (کە تەنیا ناویان دەبرێ) بریتین لە: سەفەنیا، ناحوم، عوبەیدیا، زەکەریا، یوئیل و ملاکی.

**عاموس:**

(دەگەڕێتەوە بۆ دەوروبەری نێوان ساڵانی ٧٦٥- ٧٥٠ی پێش ز، کۆنترین کتێبی تەواوە لە کتێبی موقەدەسدا).

عاموس بە زمانێکی توندو بنجبڕ حکوومەتی ئیسرائیلییان هوشیار دەکاتەوە و ئاگاداریان دەکاتەوە کە ئەگەر بەپەلە و بێ دواکەوتن نەکەونە ریفۆرمی کۆمەڵایەتی، ئەوا دەوڵەت بە تەواوەتی لە نێو دەچێت. عاموس زیاتر وەکو یەکەمین پەیامبەرێك کە پشتیووانی لە دادپەروەری خوا دەکات، ڕێزی لێدەگیرێ.

**هوشع (دەوروبەری ٧٤٠ی پێش ز):**

زمانی ئەم کتێبە زۆر لە زمانی کتێبی عاموس نەرمترە. هوشع تەئکید لەسەر عەفو و بەخششی خوا دەکات نەك لەسەر دادپەروەری خوا، قسەکانی پاڕانەوەئامێزن نەك هەڕەشەئامێز. عەشقی خوا بە گەورە دەزانێ و چاوی لە عەفوی خوایە.

**میکاء (دەوروبەری ٧٢٠ی پێش ز):**

ئەم کتێبە بۆچوونەکانی عاموس و هوشع-ی ئاوێتەی یەکدی کردووە: میکاء نەك هەر سزادانی بەدکاران، بەڵکو هاتنی سەردەمی ئازادی و شادمانیش پێشبینی و پێشگۆیی دەکات. ڕەنگە یەکەمین دانراوێك بێ کە هیوای ئاشتی گشتی دەربڕی بێ.

**ئەشعیاء (٧٤٠- ٧٠١ی پێش ز):**

ئەم کتێبە بریتییە لە ٣٩ باب ئەشعیاء کە بەشێوەیەکی گشتی بەگەورەترین پەیامبەری دەزانن، جگە لەوەی پێشەوایەکی ئایینییە، بە ئەهلی سیاسەتیش لە قەڵەم دەدرا. یەکێك بوو لە هەوادارانی هاوکاری لەگەڵ ئاشوورییەکاندا. دەگێڕنەوە دەڵێن کە لە سەردەمی پاشایەتی مەنەسادا شای تاوانکاری یەهود، ئەشعیاءیان بە هەڕە دوولەت کردووە، ئەشعیاء ڕۆشنبینییەکی ئەوتۆی دەربارەی پەروەردەی تەواوی ئەخلاقی خەڵکی نەبوو. بەڵام ئومێدی بە فریاد ڕەسێك هەبوو کە بتوانێ برایەتی و ئاشتی لە سەرانسەری جیهاندا بەرپا بکات و پەرەی پێ بدات.

**حەبەقوق(دەوروبەری ٦٠٠ی پێش ز):**

ڕەنگە کۆنترین باسی عیبری دەربارەی مەسەلەی خراپە لەم کتێبەدا هاتبێ. حەبەقوق بەپێشبینی ئەمەی کە لە دوای زوڵمی ئاشور، زوڵم و ستەمی بابل دێت، لە بیری ئەوەدایە کە

ئایا ڕۆژێ دێ کە بەدکاران بەڕاستی بە سزای خۆیگەن و دروستکاران پاداشت وەربگرن، بەڵام زۆر زوو و بە دڵنیاییەوە وەڵامی ئەرێ دەداتەوە: هەر چەند لەوەیە ئەنجامدانی عەدالەت و دادپەروەری تا ماوەیەکی زۆر دوا بکەوێ و کۆسپی بێتە رێ. حەبەقوق بە زمانێکی راستگۆیانە، و نە توند، خراپە کۆمەڵایەتی و ئایینییەکان مەحکوم دەکات و هێرشان دەکاتە سەر.

**ئیرمیاء (٦٠٠-٥٨٦ی پێش ز) :**

کتێبێکە دەربارەی پێشبینی و پێشگۆییە خەمهێنەکان. ئیرمیاء، دژی راپەڕینی خەڵکی لە بابلییەکان وەستا و پاشان لە کاتی رووخانی ئورشەلیمدا لە ساڵی ٥٨٦ی پێش ز ئەسیر بوو، یەخسیری کۆمەڵە پەناهەندەیەك کە بۆ وڵاتی میسر هەڵاتن. هیچ ئومێدێکی بە بوژانەوە و تازە بوونەوەی ژیانی قەومەکەی خۆی نەبوو، بەڵام پشتی بە دروستکاری و راستگۆیی خۆی قایم بوو.

**شیننامە (دەوروبەری ٥٨٦ی پێش ز):**

بە هەڵە ئەم بەرهەمە دراوەتە پاڵ ئیرمیای پەیامبەر، ئەم بەیتە کە تەنیا لەڕووی روحی پەیڤەوە پەیامبەرانەیە، بۆ رووخانی ئورشەلیم دەلاوێنێتەوە. لەڕووی فۆرمەوە یەجگار هونەرمەندانەیە، بە عیبری رەسەن نووسراوە و شیعرێکە کە هەر بەیتێکی بە پیتێکی جیاواز دەست پێدەکا.

بەیتەکانی بە شێوەی سێ بەند یا دوو بەند هۆنراونەتەوە و رێکخراون و کۆی قەسیدەکە بە جۆرێ دابەش کراوە کە یەك زنجیرە لاوانەوە لە ناو یەك شیننامەدا پێکدێنێ.

**حزقیال (٥٨٥ی پێش ز):**

ئەمە کتێبێکە کە لە بابیلدا و بە دەستی خاخامێکی دوورخراوە نووسراوە. ئەم کتێبە زۆر تەئکید لەسەر بایەخی ئەنجامدانی رێوڕەسمی ئایینی دەکات و ئەمەش بووەتە مایەی بەرز کردنەوە و بەهێزکردنی ورەی قەومی جولەکە.

بە هەر حاڵ ئەم دانراوە ئەو باوەڕە رەت دەکاتەوە کە کوڕ گوناح و خەتای باوك هەڵدەگرێ. مرۆڤ تەنیا لە خودی خۆی بەرپرسە و خوا دەرهەق بە هەر کەسێك بە گوێرەی کردار و رەفتاری ئەو کەسە داوەری دەکات. کتێبی حزقیال کارێکی فرەی کردۆتە سەر سمۆئیل دانیال، دانتە، میلتن، ویلیام بلیك و زۆر کەسی دی.

پەیامبەرانی نەناسراو (بابەکانی ٤٠- ٦٦ی کتێبی ئەشعیاء، بەو شێوەی کە لە وەرگێڕانەکەی شاجیمزدا باس کراوە، دەگەڕێتەوە بۆ دەوروبەری ساڵی ٥٤٠ی پێش ز):

ئەم کتێبە کە دەدرێتە پاڵ دانەرێکی یەخسیر، بەرهەمێکی پڕجەزەبە و وەجدە. نووسەر تەفسیرێکی تازە بۆ مێژووی جولەکە دەکات: دەرد و ڕەنجی مرۆڤ سزایەکی خوایی گوناح و تاوانەکانی مرۆڤ نییە، بەڵکو هۆیەکە بۆ فێربوون و ڕزگاری تیرەی بەشەر. نموونەی مەسیحی ئاشتی -نموونەی قەومی تیرەی ئیسرائیلییان- دێنێتەوە کە بە دەرد و ئازارەکانی خۆی کەفارەی هەموو مرۆڤان دەدات. واتە لە جیاتی هەموو تیرەی بەشەر ڕەنجدەدا و ئازار دەکێشێت. بیتس، نووسەری ئەم کتێبە بە (یەکەمین مەسیحی، پێنج سەدەی پێش عیسا) دەژمێرێ. ئەو باوەڕی بە خوا هەیە و قدوسییەتی خوا دووپات دەکاتەوە. نووسەر لە نووسینەکەیدا وێنەی سەردەمێکی زێڕینی تازە دەگرێت.

## هۆزانێن لیریکی

شیعری عیبری کۆن، هەندێك لە هەمان ئەو فۆرم و شێوانە بەکاردێنێ کە لە شیعری ئەڵمانیدا بەرچاو دەکەوێ. وەکو هاوئاهەنگی بونیاد و خەیاڵ و دووبارە کردنەوە، هاوسەنگی. شیعرەکان نە قافیە و سەروایان هەیە و نە کێشی تەواو، بەڵام ڕیتمی دیار و تایبەتیان هەیە.

هەڵبەتە هەندێ پارچە و کۆپلە شیعری لیریکی، بە پەرش و بڵاوی لەناو زۆربەی کتێبانی پەخشاندا دەبینرێ، وەکو: ئاوازی دەبورە، هەروەها لە کتێبی داوەران و هەندێ کتێبی پەیامبەرانیشدا وێنەی شیعری تەواو هەیە، بەڵام کتێبی مزمارەکان خۆی لە خۆیدا بریتییە لە کۆ شیعرێکی گەورەی شیعری لیریکی.

**مەزامیر (مزمارەکان):**

ئەمە کەشکۆڵێکە سەد و پەنجا سروودی لەخۆگرتووە و لە دەوروبەری ساڵی ١٥٠ی پێش ز نووسراوە. لەگینە چەند سروودێك لەو سروودانە هی داود بن (دەوروبەری ساڵی هەزار پێش ز)، هەندێکیان لە سەردەمی حکوومەتی شاهان و لە کاتی ئەسارەتدا نووسراون، و ئەوانی دیکە هەر هەمووی دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی پاش یەخسیری و ئەسارەت. مزمارەکان لەڕووی تۆن و ناوەڕۆك و شێوازەوە زۆر هەمە جۆرن، هەندێ لەو شیعرانە لایەنی شەخسی تێیدا زاڵە (٢٣- ١٢١) و برێ لە سروودەکان دەربارەی دەستوور و یاسای نوێژە (٢٤)، هەندێکیان توند و ڕەخنەئامێزە (١٣٧)، ژمارەیەکیشیان درێژن (١٩- ٤٢)، بێگومان تا ئێستا هیچ کەشکۆڵێك بەو ڕاستگۆیی و بێگەردی و جۆش و خرۆش و گەرم و گوڕییەی مزمارەکان نەهاتۆتە ئاراوە.

## شانۆنامە

ئەگەرچی لە فەلەستیندا هیچ شانۆیەك نەبووە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دوو نموونە لە بەرهەمی شانۆیی ماوەتەوە:

**کتێبی ئەیوب (دەگەڕێتەوە بۆ دەوروبەری ساڵی ٣٥٠ی پێش ز):**

ئەم کتێبە شانۆنامەیەکی فەلسەفی و مەیلەو شیعرییە کە پێدەچێت لەڕووی فۆرم و ناوەڕۆکەوە لە ژێر کاریگەری تراژیدیای یونانیدا بووبێ. ئەم کتێبە بەمەبەستی نواندن و نمایش نەنووسراوە بەڵکو تەرخانکراوە بۆ مەسەلەی بەدی و بەدکاری.

شەیتان (ئەهریمەن) مۆڵەت لە خوا وەردەگرێ کە ئەیوبی دروستکار و شادمان، بە گەڕی و گولی، بە مەرگی منداڵەکانی، بە نەهێشتنی سەروەت و سامانەکەی تاقی بکاتەوە. سێ دۆستی ئەیوب، واتە سوفر، ئیلفاز، و بلدەد (کە بە تەوسەوە تەسەلاکارانی ئەیوبیان پێ گوتراوە) لەو باوەڕەدان کە ئەم بەڵا و نسیبەتانە یا سزای تاوانکارییە یا خوا ویستوویەتی ئەشق و ئەمەکی ئەیوب تاقی بکاتەوە. ئەیوب ئیعتراز دەگرێ و دەڵێ کە راستگۆ و دروستکارە، ئەشق و مەحەبەتی بۆ خوای پەروەردگار پایەدار و بەرقەرارە، بەڵام لە چۆنیەتی سزای خوایی دوو دڵە، و سەر لەوە دەرناکات کە بۆچی بێ گوناحان ئازار دەدات. ئەنجامی فەلسەفی ئەم کتێبە بەوە دەشکێتەوە کە دەنگێك لە نێو گەردەلوولەوە هاوار دەکات (٣٨- ٤١): چۆنیەتی سزای خوایی لە سنووری تێگەیشتنی ئادەمیزاد بەدەرە و مرۆڤی خۆپەرست ناتوانێ پەی بە مەبەستەکانی خوا ببات. ئیدی ئەیوب سەری تەسلیم بوون و ملکەچی دادەنوێنێ.

هەڵبەتە دوو بەش بۆ ئەم شانۆنامەیە زیادکراوە. بەشی یەکەم (٣٢- ٣٧) گوتاری تاقەتبەری ئیلیەهۆی چوارەمین تەسەلاکار، لەخۆ دەگرێ، کە نەك هیچ بابەتێکی تازە ناخاتە سەر باسی فەلسەفی کتێبەکە، بەڵکو لایەنی دراماتێکی شانۆنامەکەش لەنگ دەکات. بەشی دووەم (٤٢) لەگەڵ ئەو ئەنجامگیرییەی کە لە ئایەتانی ٣٨- ٤١ وە هەڵدەهێنجرێ ناکۆکە: ئەیوب چاك دەبێتەوە و سەروەت و سامان و شادمانی خۆی بە دەست دێنێتەوە.

**غەزەلی غەزەلان یا غەزەلەکانی سلێمان (٣٥٠ی پێش ز):**

بریتییە لە کۆمەڵە شیعرێکی ئاشقانە و نیمچە شانۆیی، کە بۆ ئەوە دانراوە تا لە ئاهەنگەکانی شایی و زەماوەندا بە گۆرانی بگوترێتەوە. پێدەچێ ئەم شیعرە جوان و پڕسۆز و ئەشقامێزانە بە زمانی زاوا (لە دەوری سلێمان‌اندا)و بووك (لە دەوری شمولیتدا) لەلایەن شایەر و ئاشقانەوە گوترابنەوە، تا ئەمڕۆکەش هەندێ لە تۆژەران وەکو پێشینان پێیان وایە کە ئەم

کتێبە نموونەیەکە لە ئەشقی مەسیح بۆ کڵێسا، شیعرەکان هی سلێمان خوێن و ئەو ئەشقەی کە باسکراوە ئەشقی مەعنەوییە.

## ئەدەبیاتی پەند و ئامۆژگاری

ئەم کتێبە لە دەوروبەری ساڵی ۳۰۰ی پێش ز دانراوە و پڕە لە پەند و ئامۆژگاری بەنرخ و بە هەڵە دراوەتە پاڵ سلێمان. هەندێ لەم پەندانە لایەنی ئەخلاقییان هەیە، بەڵام زۆربەیان شەرح و شرۆڤەی کاروباری شەخسین.

<u>کتێبی کۆمەڵگە: (دەوروبەری ساڵی ۱٥۰ی پێش ز):</u>

ئەم کتێبە کە بە هەڵە بە هی سلێمان زانراوە، کۆمەڵە گوتارێکە پڕ لە نائومێدی، جەبر و ئختیار، و گومان و دوو دڵی (جگە لە هەندێ پەند سەبارەت بە ستایشی حیکمەت کە دواتر خراوەتە سەر کتێبی ناوبراو) زمان و تۆنی کتێبەکە زمانی پیرەمێردێکی ڕەشبینە کە بوون بەشتێکی بێهودە و بێ مانا دەزانێ "هەموو شتێك ڕەوتەنی و بێهودەیە".

## حیکایەت و چیرۆکان

چەندین چیرۆك (کە ڕۆژگارێك بە چیرۆکی واقیعی زانراون و ئەمێستا بەگشتی بە دەستکرد دەژمێردرێن) لە تەوراتدا هاتوون کە هەر یەکێکیان ئامانج یا پەیامی تایبەتی خۆی هەیە.

<u>کتێبی روت (دەوروبەری ۳٥۰ی پێش ز):</u>

چیرۆکێکی کورتە، لەڕووی ناوەڕۆکەوە نارەزاییەکی زیرەکانەیە سەبارەت بە حەرامکردنی زەوجین لە نێوان ئەندامانی یەك خێزاندا.

شۆرەتی ئەم چیرۆکە لەوەدایە کە روت ئاشقێنی لەگەڵ زڕدایکی خۆیدا دەکات. "داوام لێ بکە کە تۆ بەجێ نەهێڵم".

<u>کتێبی یونس (دەوروبەری ۲۷٥ی پێش ز):</u>

ئەم کتێبە کە لێکدانەوەی نادروستی زۆری بۆ کراوە، دەربارەی حەزرەتی یونسە کە خوا رای دەسپێرێ بچێ بۆ نەینەوا و پەیامی خۆی لەوێ رابگەیەنێ و ئەنجامی بدات. یونس سەرپێچی دەکات، بەڵام پاشان ژێوان دەبێتەوە و پەیامی خۆی ئەنجام دەدا. یونس بۆ جاری دووەم، کاتێ کە خوا لە نەینەوا لێی خۆش دەبێ و دەیبەخشێ، سەرپێچی لە ئەنجامدانی فەرمانی خوا دەکات. زۆربەی خاڵە ئەخلاقی و مەزهەبییەکانی وەکو: ناشیرینی یاخیبوون و خۆسەری و

خۆپەرستی یونس، ئامادەیی خوا و ڕەحمەتی خوا لە هەموو جیهاندا، چاکی تۆبە، و زەرورەتی سەبری مەزهەبی و نەژادی، لە چاو ئەم باسە بێ کۆتاییەدا کە چۆن دەشێت ئادەمیزادێك بۆ ماوەی سێ ڕۆژ لە ناو سکی ماسییەکدا هەڵبکا، ناکەنە هیچ و نایەنە بەر تەسەور.

**کتێبـی دانیال: (لە دەوروبەری ساڵی ١٥٠ی پێش ز دانراوە):**

ئەمە چیرۆکێکی ڕەمزییە کە لەسەر بناغەی حیکایەت و ئەفسانانی کۆن ڕۆنراوە و دەربارەی یەخسیری دانیالە. مەبەست لەم کتێبە هان دان و دنەدانی جولەکەکان بووە لە ماوەی جەنگی مەکابیونەکاندا، و کتێبەکە بە پێشبینی کردنی ئایندە کۆتایی دێت. بەناوبانگترین پاژەکانی ئەم کتێبە بریتییە لە: چیرۆکی خستنە ناو گوڵخەنی شدرك، مێشك و عەبدنعو "٤" (٣)، میوانداری بەلشسەر (٥)و توڕدانی دانیال بۆ ناو بیری شێران (٦).

**کتێبـی ئیستیر (دەگەڕێتەوە بۆ دەوروبەری ١٥٠ی پێش ز):**

ئەم کتێبە زۆر دوای کتێبەکانی دیکەی تەورات هاتووە و لەڕووی ئەخلاقییەوە لە هەموویان لاوازترە. مەبەستی ئەم کتێبە خۆشکردنی زەمینەی مێژوویی بووە بۆ جەژنی فوزیم-ی جولەکەکان "٥".

ڕاستە ئەم چیرۆکە شەقڵێکی خوێنڕێژی و کینەجۆیی هەیە، بەڵام هونەرمەندانە و دڵگیرانە نووسراوە. ئیستیر، شابانۆی ئاخشوروش (خەشایار شا) بە کەشفکردن و لە قاودانی پیلانێك کە هامان-ی تاوانکار بۆ قەتڵوعامی جولەکەکانی نابووەوە، موردەخای مامی و جولەکەکان ڕزگار دەکا.

**سەردەمی نوێ (ئینجیل):**

بریتییە لە چیرۆکی سەرهەڵدان و پێشکەوتنەکانی سەرەتای مەسیحییەت. ئەم کتێبە چوار ژیننامەی عیسا (چوار ئینجیلەکە)، کاری پەیامبەران، بیست و یەك نامەی ئایینی و موکاشەفەی یوحەنای لەخۆ گرتووە کە هەموویان بەسەر یەکەوە دەکەنە ٢٧ کتێب. زۆربەی ئەم کتێبانە یا هەموویان لە بنەڕەتدا بە یۆنانی دانراون، بەڵام ڕەنگە چوار ئینجیلەکە لە سەرەتادا بە ئارامی بووبن. هەموو ئەم کتێبانە لە ساڵانی ٤٠ بۆ ١٢٥ی ز نووسراون.

**ئینجیلەکان**

یەکەم چوار کتێبی سەردەمی تازە (ئینجیلی مورقس، ئینجیلی مەتی، ئینجیلی لوقا، و ئینجیلی یوحەننا) ژیان و مەرگ و رابوونەوەی عیسا مەسیح دەگێڕنەوە. ئەم چوار ئینجیلە لەڕووی پرەنسیپ و ناوەڕۆکەوە وەکو یەکن، بەڵام لە وردەکاری و پاژەکاندا جیاوازن.

**ئینجیلی مورقس:**

وەرگێڕانە یونانییەکە دەگەڕێتەوە بۆ دەوروبەری ساڵانی ٧٠-١٠٠ی ز، و وەرگێڕانی نوسخە گوم بووە ئارامییەکەی رەنگە بۆ دەوروبەری ساڵانی ٤٠- ٧٠ی ز بگەڕێتەوە).

ئەم ئینجیلە لە هەموو ئینجیلەکانی دیکە کۆنتر و کورتترە و لەوەیە لە هەمووشیان پڕ ئیحتویارتر بێ. مورقس بە سەرچاوەی ئینجیلەکانی مەتی و لوقا دەژمێردرێ، و ئەم سێیانە بە ئینجیلانی هاوتا ناسراون. خەڵکی کتێبی مورقس بە هی یوحنا مورقس دەزانن، کە یەکێك بووە لە هاورێیانی پوترسی یاوەر لە روم. ئەم ئینجیلە تەنیا سێ ساڵی کۆتایی ژیانی عیسا — پەند و ئامۆژگارییەکانی، و هەستانەوەی لە دوای مەرگ- لەخۆ دەگرێت، نووسەر ئەم چیرۆکەی، کە زۆر زوو بە هەموو شوێنێکدا بڵاوبووەوە، لەبەر ئەو لەزەت و دڵگیری و موعیزاتەی کە چیرۆکەکە پێی بەخشیوە، داناوە. نووسەر هیچ کاتێك دەربەستی جوانی پەیڤ نەبووە، سڕینەوە و دووبارە بوونەوە و پەلە پروزێیەکی زۆر بە کارەکەیەوە دیارە. بۆچوونی گشتی لەسەر ئەم کتێبە ئەمەیە کە بەشی کۆتایی کتێبەکە (بابی ١٦: ئایەتەکانی ٩- ٢٠) دواتر نووسراوە و خراوەتە سەری.

**ئینجیلی مەتی (وەرگێڕانە یۆنانییەکەی بۆ ساڵی ٨٠ی ز دەگەڕێتەوە، نوسخە ئارامییەکەشی لەوەیە بۆ ساڵی ٥٥ی ز بگەڕێتەوە)**

ئەم ئینجیلە دەدرێتە پاڵ مەتی یاوەڕی مەسیح و تاڕادەیەکی زۆر لە ژێر کاریگەری ئینجیلەکەی مورقسدا نووسراوەتەوە. لەم کتێبەدا رووی دەم لە بەنی ئیسرائیلە و دوو مەبەستی سەرەکی لەبەر چاو گیراوە:

١- سەلماندنی ئەم خاڵە بۆ جولەکەکان کە عیسا ئامانجی هەموو پێشبینییەکانی پەیامبەرانی کۆنە، واتە مەسیح حەقیقییە.

٢- تۆمارکردنی ئامۆژگارییە ئەخلاقییەکانی عیسا.

ئەم کتێبە بە سەرجەلەنامەی یوسف، مێردی دایکی عیسا دەست پێدەکات، و چیرۆکی لەدایکبوون، ژیان، لەخاچدان، رابوونەوە، و هەڵکشانی عیسا بۆ ئاسمانان دەگێڕێتەوە. هەروەها سەربهووردی پیاوانی زانا و کۆچی یوسف و مریەم و عیسا بو میسر لەم ئینجیلەدا باس کراوە. ئینجیلی مەتی لە چاو ئینجیلی مورقسدا بە شێوەیەکی زۆر وردتر هاتۆتە دانان و نووسین.

**ئینجیلی لوقا (وەرگێڕانە یۆنانییەکەی دەگەڕێتەوە بۆ دەوروبەری ساڵی ٩٠ی ز، وەرگێڕانی نوسخە ئارامییەکەی دەگەڕێتەوە بۆ دەوروبەری ساڵی ٦٥ی ز):**

ئەم ئینجیلە لەلایەن لوقاوە نووسراوە. لوقا پزیشك و هاوڕێی پۆلس بووە لە سەفەرە بانگەشەییەکاندا، لوقا ئەم کتێبەی بۆ یونانی و رومییەکان نووسیوە و سەرچاوەی ئەم کارەشی هەردوو ئینجیلی مورقس و مەتی بووە. لەم ئینجیلەدا لایەنی بەشەری عیسا دووپات کراوەتەوە. لوقا کەسێکی شیعر دۆستە. تۆن و زمانی ئینجیلەکەی لۆقا هێمن و بەشەردۆستانەیە. لەم کتێبەدا باسی ژیانی عیسا و واریقاتی لەدایکبوونەکەی دەکات (بابی دووەم: ئایەتی ١- ٢٠).

**ئینجیلی یوحەنا (ئەم شێوەیەی ئێستای دەگەڕێتەوە بۆ ساڵانی ١٠٠- ١٢٥ی ز):**

رەنگە بە هەڵە ئەم ئینجیلە درابێتە پاڵ یوحەنای یاوەر، چونکە وەکو دیارە دەبێ بە ماوەیەکی زۆر، پاش ئەو دانرابێ، کاریگەری فەلسەفەی یۆنانی و ئەسکەندەرانی، بە تایبەتی لە باسی پەیڤدا، لەم کتێبەدا دیار و ئاشکرایە. ئەم کتێبە ئولوهیەت و خوایەتی عیسا دووپات دەکاتەوە، عیسا بە نیشاندەر و رەمزی پەیڤ دەزانێ، هەروەها باسی ئیمان و باوەڕ، بەرجەستەبوونی عەشقی خوا لە ئەشقی ئادەمیزادا، یەکێتی سۆفیانە لەگەڵ هەقدا دەکات. ئەم کتێبە دوای پێشەکییەك، بە یەحیای تەعمیدکار دەست پێ دەکات کە عیسا دەشوا و تەعمیدی دەکات، ئەوجا دێتە سەر باسی پەیام و مەرگ و رابوونەوەی پاش مەرگ، بەڵام هیچ باسێکی چوونە ئاسمانی عیسای تێیدا نییە.

## مێژووی کڵێسا

نامەی کرداری پەیامبەران (دەگەڕێتەوە بۆ ساڵانی ٦٠- ٩٠ی ز):

ئەم کتێبە لەلایەن لۆقای دانەری سێیەمین ئینجیلەوە نووسراوە. و بریتییە لە گێڕانەوەیەکی مێژوویی زیندووی پەرەسەندن و بڵاوبوونەوەی مەسیحییەت لە ئاسیای بچووك، دوڕگەکانی میدیترانە، یۆنان و روم. بابەتەکانی بریتیین لە: بەردباران کردنی ئستیفانوسی یەکەمین شەهیدی مەسیحی، گەلێك پەرچووی کۆن، هەوڵەکانی کڵێسای لاو، بە مەسیحی بوونی پۆلس و سەفەرە تەبلیغییەکانی، هەروەها هاتنە خوارەوەی روحل قودس و جەژنی پەنجامین.

**نامەکانی پۆڵسی پەیامبەر (مێژووی دانانی هەموو ئەم نامانە دەگەڕێتەوە بۆ نێوان ساڵانی ٥٠- ٦٥ی ز):**

لە ناو ئەو سیازدە نامەیەی کە دراونەتە پاڵ پۆڵس، شەش دانەیان بایەخ و بەهای تایبەتیان هەیە. ئەم نامانە هەر چەندە گرووپ یا خەڵکانێکی تایبەتی دەدوێنێ، و لەڕووی جوگرافییەوە سنووردارن، بەڵام بە شاکاری ئەدەبیاتی جیهان دەژمێردرێن و لە ریزی هەرە پێشەوەی ئەو نامانەن کە تا ئێستا نووسراون. ئەم نامانە سەرچاوەی گەلێك لە باوەڕ و نامۆژگارییەکانی دواتری مەسیحییەتن. تۆن و زمان و شێوازی ئەم نامانە بە گوێری پێگە و هەستی دانەر لە دەمی جۆراوجۆردا دەگۆڕێ، هەندێکیان وشك و راستەوخۆ و بەڵگە نامێزە، و برێکی تریان توندو دڵگیر و تەنانەت پرسۆز و گودازە. ئەو باسە لۆجێکی و وردانەی کە هەندێ جار لەم نامانەدا هاتووە، تێگەیشتنیانی قورس و زەحمەت کردووە.

**دوونامە بۆ تسالونیکیان:**

ئەم دوو نامەیە پۆڵسی یاوەر لە ئەسینا بۆ کڵێسای لاوی تسالونیکیان-ی نووسیوە. پۆڵس لەم نامانەدا باوەڕی خۆی سەبارەت بە هاتنەوەی سەرلەنوێی مەسیح دەر دەبڕێ و خەڵکی رادەسپێرێ و هاندەدا کە تا زووە روو بکەنەوە دینداری و پارێزکاری تا بەڵکو بتوانن هاوڕێ لەگەڵ مەسیحدا رابین و ژیانی ئەبەدی بە دەست بێنن.

**نامە بۆ غەلازیان:**

ناونیشانی نامەیەکە کە پۆڵس لە روم، بۆ مەسیحییانی ئاسیای بچووکی نووسیوە. لەم نامەیەدا کە بە بەیاننامەی ئازادی مەزهەبدا دەنرێ و ناو دەبرێ، تاکید و ئارەزووی کڵێسای غەلازیان لەسەر پەیرەوی کردنی شەریعەتی موسا و توندڕەوی لە واری رەچاوکردن و جێبەجێکردنی رێوڕەسمی ئایینیدا مەحکووم دەکات. نامەی غەلازیان نیشاندەری باوەڕی پۆڵس بەو ئازادی و چەمکەیە کە ئەو مەسیحییەت بە ئایینێکی جیهانی دەزانێ نەك ئایینێکی ناوچەیی.

**نامەی یەکەمی پۆڵس بۆ قرنتیان لە (فیلیپی دانراوە):**

پۆڵس لەم نامەیەدا وەڵامی گەلێك لەو پرسیارانە دەداتەوە کە کڵێسای کورنت-یان هێنا بووە گیر و گاز. لەو نامەیەدا بە توندی رەخنە لە خۆپەسندی و مەقام و پایەخوازی دەگرێ و هەر چاکە و فەزڵ و بەخششێك-یش ئەگەر هەڵقوڵاوی (مەحەبەت) نەبێ بە بێهودە دەزانێ (بابی ١٣- فەسڵی مەحەبەت).

پۆڵس باوەڕی بتەوی بە زیندوو بوونەوەی مەسیح هەیە، بۆیە پێشنیاز دەکات کە خەڵکی بە سەڵتی بێننەوە تا بتوانن بایەخێکی زۆرتر بە کاروباوری ئایینی بدەن. پۆڵسی پەیامبەر لەم نامەیەدا کە یەکێکە لە درێژترین نامەکانی سەردەمی نوێ و لە دەوروبەری ساڵی ٥٥ی ز نووسراوە، جۆری هەڵسوکەوت و رەفتاری مەسیحییان روون دەکاتەوە و ئاگاداریان دەکاتەوە کە زینا لەگەڵ مەحرەمان دا نەکەن. و باوەڕی بتەوی خۆی بە هەستانەوەی عیسا دووپات دەکاتەوە (بابی ١٥)و باوەڕی خۆی بە فەنا نەبوونی ئادەمیزاد نیشان دەدات: "ئەی مەرگ چزی تۆ لە کوێ و ئەی گۆڕ نینۆکی تۆ لە کوێ؟" (بابی ١٥: ٥٥).

**نامەی دووەمی پۆڵس بۆ قرنتیان:**

ئەم نامەیەش وەکو نامەکەی یەکەمی پۆڵس، لە فیلیپی و بە یۆنانی نووسراوە. ئەم نامەیە لەڕووی بەرەڤانی مەیلەو تاڵی دانەر لە خۆی، مایەی سەرنجە (بابی ١٠- ١٣) ئەو بەرەڤانییەی کە زاهیری ئەنجامی یاخی بوونی گرووپی هەوادارانی کڵێسای قرنتیان بووە دژی رێبەرایەتی پۆڵس. ئەم بەرەڤانی نامەیە سەرکەوتوو بووە و نۆ بابی یەکەمی نامەکە دەربارەی ئاشتی و ئاشتبوونەوەیە.

**نامەی پۆڵس بۆ رومیان:**

پۆڵس ئەم نامەیەی پێش دوا سەفەری خۆی بۆ ئۆرشەلیم، لە کورنتدا بۆ مەسیحییانی روم نووسیوە. لەم نامەیەدا پۆڵس بە تەواوەتی راوبۆچوونی خۆی دەربڕیوە. پێی وایە کە ئیمان و باوەڕ مایە و هەوێنی رزگارییە. بەم پێیە خوا پشتیوانی لە کەسانێك دەکات کە باوەڕی تەواویان بەو خوایە هەبێ کە مەسیح بانگەوازی بۆ دەکات. ئەم باوەڕە لەڕاستیدا تەواوکەری ئەو را و بۆچوونانەیە کە لەمەڕ مەحەبەت، لە نامەی یەکەمی پۆڵسدا بۆ قرنتیان پیشان دراون. ئەم نامەیە درێژترین و قووڵترین و تیۆریترین نووسراوی پۆڵسە. بە شێوەیەکی گشتی، ئەم نامەیە روح و جەوهەری پەیڤە دەربارەی حیکمەتی خوایی — "هەموو رێگاکان دەچنەوە روم".

**نامەیێن نووسەرانی دی:**

جگە لە نامەکانی پۆڵس، هەشت نامەی دیکە لە ئینجیلدا تۆمار کراون کە تەنیا سیانیان بایەخی تایبەتیان هەیە (پێنج نامەکەی دی بریتین لە : نامەی یەکەم و دووەمی پەتروس، نامەی دووەم و سێیەمی یوحەنا و، نامەی یەهودا).

**نامە بۆ عیبرانیان (سالآنی ٧٠- ٨٠ی ز):**

ئەم نووسراوە پەندنامەیەکە کە دانەرەکەی نادیارە. سەردەمانێك بە هەڵە بەهی پۆڵس لە قەڵەم دەدرا، ئەم نامەیە لەسەر شێوە و شێوازی نامەکانی پۆڵس نووسراوە، بەڵام زۆر سوارتر و رەوانتر و خۆشترە.

رووی ئەم نامەیە لە مەسیحییانی عیبرانی (جولەکە)یە. باسەکانی ئەم نامەیە بریتییە لە: فەزڵی عیسەوییەت بەسەر یەهودییەتدا، و دووپاتکردنەوەی بۆچوونەکەی پۆڵسە سەبارەت بە پاکبوونەوە لە رێگەی ئیمان و باوەڕەوە.

**نامەی یەعقوب (سالآنی ٤٠- ٩٠ی ز):**

ئەمە دراوەتە پاڵ یاقوبی برای عیسا (رەنگە بە هەڵەش درابێتە پاڵ ئەو). ئەم نووسراوە نامەیەکی کراوەیە یا پەندنامەیەکە بۆ دوانزە قەبیلە پەراگەندەکەی بەنی ئیسرائیل. وا پێدەچێت ئەم نامەیە زادەی کاردانەوەی یاقوب بێ بەرانبەر بەو باوەڕەی پۆڵس کە باوەڕ و ئیمانی بەمایە و هەوێنی رزگاری دەزانی. یاقوب تاکید لەسەر ئەوە دەکات کە کار و کردەوەی چاك مایەی رزگاری مرۆڤە: "کار بە قسان بکەن نەك هەر گوێی لێبگرن" (بابی یەکەم، ئایەتی ٢٣). هەروەها یەعقوب بە روونی و راشکاوی رەخنە لە بێدادی کۆمەلآیەتی دەگرێت.

**نامەی یەکەمی یوحەنا (سالآنی ١٠٠- ١٢٥ز):**

ئەم نووسراوە دراوەتە پاڵ قەشە یوحەنا، کە "بۆ خاتوونێکی دیندار" نووسراوە. لەم نامەیەدا وەڵامی بیدعەتەکانی مەزهەبی غنوسی"[٦] دەربارەی ماهیەتی عیسا دراوەتەوە. یوحەنا بێ دوو دڵی لە بوونی مەسیح دا، یەکێتیی عارمانەی مرۆڤ و خوا دەبینێ.

**موکاشەفەی یوحەنای پەیامبەر (دەوروبەری ساڵی ٩٠ی ز):**

ئەم کتێبە کە بە هەڵە دراوەتە پاڵ یوحەنا، بە ئەگەری نزیك لە یەقین، لەلایەن سۆفییەکی گومناوی ئیفیسوسییەوە دانراوە. ئەم کتێبە نامە ئاسایە، پتر رووی دەمی لە هەوت کڵێساکەی ئاسیای بچووکە، وێڕای ئەوەی کە ئەم نامەیە بە رواڵەت موکاشەفەی عیسا مەسیحە، بەڵام لەرووی فۆرمی پەیڤ و زمانەوە پتر عیبرییە تا مەسیحی، رەنگدانەوەی ئارەزووی هەمیشەیی یەهودییانە بۆ رزگاربوون لە کۆت و بەندی ستەم و زۆرداری. ئەو حەز و ئارەزووەی کە لە گەلێك لە کتێبانی پەیامبەرانی سەردەمی کۆن و لە کتێبەکەی دانیاڵ-یشدا باسکراوە. موکاشەفەکەی یوحەنا یەکسەر لە پاش توند بوونی چەوسانەوە و ئازاردانی مەسیحییان کە بە فەرمانی دوومیتیان"[٧] دەستی پێکرد، دانراوە. ئەم موکاشەفەیە پێشبینی

رووخانی روم، هەستانەوەی عیسا، رابوونی پەیامبەران یەخسیرکردنی ئیبلیس، حوکمڕانی هەزار ساڵەی مەسیح، شەڕی کۆتایی نێوان هێزی خوایی و ئیبلیس (بە سەرکەوتنی هێزێن خوایی)، رۆژی پەسلان، و بونیادنانەوەی تازەی ئۆرشەلیم، دەکات.

هەر چەندە موکاشەفەکەی یوحەنا، لە باری سەرنجی ئەخلاقییاتەوە لە هەموو کتێبەکانی دیکەی سەردەمی نوێ (ئینجیل) نزمترە، بەڵام بە شاکارێکی ئەدەبی گەورە و گران دەژمێردرێ. رەمزییەتی عارفانە و وەسفی گەش و زیندووی نەبەردی نێوان خێر و شەڕ، و وێنەی سامناکی کۆتایی دنیا بابەتی زاڵی ئەم بەرهەمەن و کردویانەتە کارێك کە بە گەورەترین بەرهەمی وەسفی بژمێردرێ.

**ئاپۆکریف (کتێبە دەستکردەکان):**

ئەمە ناونیشانی پاشکۆکانی هەموو کتێبەکانی هەردوو سەردەمی کۆن و نوێیە (تەورات و ئینجیل).

ئاپۆ کریف-ی سەردەمی کۆن بریتییە لە چواردە کتێب کە لە هەردووك وەرگێڕانی هەفتا"[٨]" کەسە و ڤولگات"[٩]"دا ناویان هاتووە. بەڵام جولەکانی فەلەستین ئەم کتێبانە بە وەحی و سروشی تەواو نازانن. و لە دەقە ئەسڵییە عیبرییەکەشدا داخڵ نەکراون. پرۆتستانەکان لە قۆناغی ریفۆرمی ئایینیدا ئاپۆکریف-یان لە کتێبی موقەدەس دەرهاویشتووە و ئیعترافیان پێنەکردووە، بەڵام لە ریوایەتێکی بەناوبانگدا دراوەتە پاڵ شاجیمز و خراوەتە نێوان هەردوو سەردەمی کۆن و سەردەمی نوێوە. کاتولیکەکان جگە لە دوعای منسی و ئیسدراسی یەکەم و دووەم، هەموو کتێبەکانی دیکەی ئاپۆکریف بە قانونی دەزانن.

کتێبەکانی ئاپوکریف بریتییە لە چوار کتێبی مێژوویی، پێنج چیرۆك، دوو کتێبی پەند، یەك نامە، یەك کتێبی قەولان و یەك کتێبی دوعا و نزا. کتێبەکانی دی بریتین لە: پاشماوەی فەسڵەکانی ئیستیر، باروخ (لەگەڵ نامەکەی ئیرمیا)، هاوڕێیانی دانیل، بەغعل و ئەژدیها و، دوعای مەنسی"[١٠]".

## مێژوو

**ئیسدراسی یەکەم (دەوروبەری ٣٩٠ی ز):**

شەرحی چۆنیەتی گەڕانەوەی جولەکەکانە لە ئەسارەتی بابلییەکانەوە بۆ فەلەستین. ئەم کتێبە لە بنەڕەتدا نووسینەوە و داڕشتنەوەی کتێبانی دووەمی مێژووی رۆژگاران، عەزرا، و نەحمیا. لەبەر ئەمە لە روانگەی رەسەنایەتی ئەدەبییەوە بایەخێکی ئەوتۆی نییە، لەگەڵ

ئەمەشدا چیرۆکە شیرینەکەی زۆر بابل"١١" دەگێڕێتەوە کە بە یارمەتی داریوش (٥٥٠- ٤٨٦ی پێش ز) پاشای ئێران، دەکەوێتە نوێکردنەوەی پەرستگەکەی بەیتول مەقدیس هاوکاری و پشتیوانییەکەی داریوش کاتێ دەبێ بە راستی کە زور بابل لە مونازەرەیەك دا دەربارەی (زانینی بەهێزترین دەسەڵاتی جیهان) سەردەکەوێ. لەم مونازەرەیەدا رەقیبەکانی ئەو یەك لە دوای یەك ناوی شەراب و شا دەبەن، زور بابل ژن لە شەراب و شا بە دەسەڵاتتر دەزانێ، بەڵام لە هەمان کاتدا رایدەگەیەنێ کە حەقیقەت لە هەموو ئەوانە بەهێزترو بە دەسەڵات ترە.

## ئیسدراسی دووەم (دەوروبەری ٣٨٠ی پێش ز):

ئەم بەرهەمە کە بە درێژەی ئیسدراسی یەکەم دەژمێردرێ، لەڕووی مێژووییەوە لاوازە و لە باری ئەدەبییەوە یەجگار بەرزە. گرنگترین فەسڵێن ئەم کتێبە بریتییە لە: خەونەکان، موکاشەفە ئاسمانییەکان، و پێشبینیانی پەیوەست بە کەوتنی تاوانباران و رزگاری دروستکاران.

## مەکابیانی یەکەم و دووەم (دەوروبەری ساڵی ٣٨٠ی پێش ز):

ئەم دوو کتێبە، مێژووی جولەکەکانی فەلەستین لە ساڵانی ناوەڕاستی سەدەی دووەمی پێش زاییندا لەخۆ دەگرن. کتێبی دووەم ساڵانی ١٨٥ تا ١٦٨ی پێش ز دەگرێتەوە- واتە سەردەمی پێش یاخی بوونی جولەکەکان دژی ئانیتوخوس ئەپیفانسی (١٦٣ی پێش ز) شاسلوکی سوریە، کە هەوڵی دەدا یەهودییەت لە نێو بەرێ، و ئەمەش بووە هۆی یاخیبوونی مەکابیان. کتێبی یەکەم خودی یاخی بوونەکەی (١٦٨- ١٣٥ی پێش ز) شەرح و شرۆڤە دەکات. یەهودای مەکابیی رابەری یەهودییان، لەم یاخی بوون و راپەڕینەدا سەر دەکەوێ، جولەکەکان ئازادی ئایینی و سیاسی خۆیان وەدەست دێننەوە و لە ساڵی ١٤٢ی پێش ز ماڵباتی کاهینانی جولەکە دادەمەزرێنن کە تا ساڵی ٤٠ی پێش ز بەردەوام دەبێ.

هەر چەندە ئەم مێژووە لە کاریگەری توندی خەیاڵات و ئارەزووە ئایینییەکانی نووسەر بەدەر نییە، بەڵام لێوان لێویشە لە رووداوی سەیر و وێنەی دڵبزوێن. یەهودای مەکابی بە قارەمانێك لە قەڵەم دەدرێ کە سەرکەوتن، نەك لە سایەی هێز و بوێری زاتی، بەڵکو لەبەر رۆشنایی ستایشی پڕ بە دڵی یەهود بە دەست دێنێ.

## چیرۆکەکانی

**یەهودییەت (دەگەڕێتەوە بۆ دەوروبەری ساڵی ١٥٠ی پێش ز):**

چیرۆکێکی خەیاڵییە دەربارەی ژنێکی جولەکەی خواناس، کە کاتێ بتولیای زێدی لەلایەن هێزەکانی بەختنەسرەوە گەمارۆ دەدرێ (بە زەبری جوانی و زانایی و زیرەکی خۆی) خۆی دەگەیەنێتە ناو چادرەکەی هالوفرەنسی فەرماندەی هێزی هێرشکەری ئاسوورییەکان، بە رواڵەت وا خۆی دەنوێنێ کە تەسلیمی هەوا و هەوەسی فەرماندەکە دەبێت و متمانەی ئەو بەدەست دێنێ، و ئەنجام دەتوانێ لە غورابی خەوی مەستیدا سەری لەلاشە جیا بکاتەوە.

یەهودییەت، بە قارەمانی خۆشەویستی جولەکەکان لە قەڵەم دەدرێ و سەربهووردی ئەو بووە بە هەوێن و نێوەڕۆکی زۆر شیعری دڵگیر و تابلۆ و نیگاری جوان.

**شوشنا و پیران (دەگەڕێتەوە بۆ دەوروبەری ١٣٠ی پێش ز):**

چیرۆکێکی کورتی دڵگیرە دەربارەی شوشنا. کە ژنێکی جوان و داوێنپاکە و دوو پیری تاوانباری سەر بە تیرەکەی خۆی دەچنە بن کلێشەی تا فریوی بدەن و لە رێ دەریبکەن. پیرەکان کە دەبینن شوشنا زۆر سەرسەختە و بۆیان نایەتە رەدا، بوختانی داوێن پیسی بۆ هەڵدەبەستن. شوشنا لە سەرەتادا حوکمی مەرگ دەدرێ. بەڵام دانیاڵ کە پیرەکان دەدوێنێ بۆی دەردەکەوێ کە بوختان دەکەن، ئیدی شوشنا تەبرێ دەبێ و پیرەکان بە مەرگ مەحکوم دەکات. ئەم چیرۆکە لەڕووی زمانەوە هەوڵی داوە کەمترین وشە بەکار بێنێ و تەژییە لە رەگەزی چاوەڕوانی.

**توبیت (مێژووی ئەو چیرۆکە دیار نییە، بە مەزەندە دەگەڕێتەوە بۆ نێوان ساڵانی ٣٥٠ی پێش ز ٧٥ی ز):**

ئەم چیرۆکە خەیاڵئەنگێزە، کە نیشاندەری دەسەڵات و ئیحتوباری میسرییان و پارسییانە، باسی جولەکەیەکی ئیمانداری دوورخراوە بەناوی توبیت، و کوڕە لاوەکەی بە ناوی توبیاس دەکات. توبیت کە بینایی و دارایی خۆی لە دەست داوە، توبیاس بۆ وڵاتی ماد دەنێرێ تا ئەو زیوانەی بۆ بێنێتەوە کە لەوێندەر هەیەتی. بە درێژایی سەفەرەکە روفائیلی فریشتە لە شێوەی هاووڵاتییەکی توبیاسدا دەردەکەوێ و رێنوێنی توبیاس دەکات. ئەم دووە تووشی سارا دەبن، سارا کیژێکی جولەکەیە و جنۆکان دەستیان لێوەشاندووە و لە رۆژی زەماوەندەکەیدا هەر حەوت شووەکەیان کوشتووە. توبیاس بە رێنوێنی رۆفائیل جنوکەکان لە لەشی سارا وەدەردەنێ و زەماوەندی لەگەڵدا دەکات. توبیاس و سارا بە نیوەی دارایی بابی ساراوە بۆلای توبیت

دەگەڕێنەوە و بەزەردەاوی ((زراو)) ی ماسی چاری نابینابیەکەی دەکەن. ڕۆفائیل-ش پاش هێنانەوەی زیوەکان لەوڵاتی ماد، خۆی ئاشکرا دەکات و کاراکتەرەکانی دیکەی ناوچیرۆکەکە هاندەدا کە سوپاسگوزار و شوکرانە بژێری چاکییەکانی خودابن.

## ئەدەبیاتی پەند و حیکمەت:

### حیکمەتی یەسوع (١٥٠ی پێش ز)

**(کۆمەڵە کتێبێکی ئاپۆکریفە لەمەڕ سوپاس و ستایشی حیکمەتی خوا):**

ئەم کتێبە بریتییە لە کۆمەڵێك پەندی شاعیرانەی کورت. بنەمای حیکمەت و ئامۆژگاری ئەم کتێبە، وەکو کتێبی ((پەندان)) لە قانوونی موقەدەس دا زیاتر سادە و سەرەتاییە تا قووڵ و مەنگ بێ، ئەمە دووپات دەکاتەوە کە تاعەتی خوا مایەی شادی و کامەرانییە:

واتە هەمان ئامۆژگارییەکانی تەوراتە. هەڵبەتە ئەم کتێبە هەندێ پەندی بەرز و باڵاشی تێیدایە.

**حیکمەتی سلێمان (ساڵی ٥٠ی پێش ز، شوێن ئەسکەندەرییە):**

کۆمەڵە پەند و ئامۆژگارییەکی دیکەیە. زمان و تۆنی ئەخلاقی ئەم کتێبە بە هۆی کاریگەری ڕۆشنبیریی یۆنانییەوە، تا ئەندازەیەك لە کتێبی پەندان یا کتێبی کۆمەڵگە باڵاترە و لە باری پراکتیکییەوە لە ڕەسەنایەتی ئەخلاقی مەسیحییەت نزیك دەبێتەوە.

## تەلمود

تەلمود تۆماری کۆی یاسا مەدەنی و شەرعییەکانی جولەکەیە. ئەم وشەیە لە بنەڕەتدا بەو بەشە دەگوترا کە بە گمارا بەناوبانگ بوو.

تەلمود چوار بەشە:

١- **میشنا (لە دەوروبەری ساڵی ٢٠٠ی ز نووسراوە):**

کۆمەڵە پەند و ئامۆژگارییەکی ڕەبەنیانی جولەکەیە بە زمانی عیبری کە زیاتر لە تەوراتەوە وەرگیراون.

٢- **گمارا:**

ئەمە بە زمانی ئارامییە، کە شرۆڤە و تەفسیر و پەراوێز و پاشکۆی میشنایە.

٣- **هەلاخا:**

کۆمەڵە یاسا و ڕێسا و سروودێکە کە پڕە لە وردەکاری.

٤- هەگادا:

گەلێك چیرۆك، پەند، نوكتە، و نەقڵ و حیكایەتی لەخۆ گرتووە كە بەدەم روونكردنەوەی هەندێ خاڵی قانونییەوە وەكو نموونە هێنراونەتەوە. (ئەم كتێبە كاریگەرییەكی زۆری لەسەر رۆمانی تازەی ئەوروپا و سەدەكانی ناڤین هەبووە).

دوو دەقی چاك كراوی تەلمود هەیە، یەكەمیان تەلمودی فەلەستینییە، كە لە دەوروبەری ساڵی ٤٠٨ی ز لەلایەن هەندێ زانای فەلەستینییەوە ئامادە و كۆكراوەتەوە و دووەمیان تەلمودی بابلییە، لە ساڵی ٥٠٠ی ز نووسراوەتەوە.

## كاریگەریی ئەدەبیاتی عیبری

هەر جۆرە هەوڵێك بۆ نیشاندان و دەست نیشانكردنی كاریگەری گەورەی ئەدەبیاتی عیبری —بەتایبەتی كتێبی موقەدەس- و تەنانەت سووكە ئاشناییش لەگەڵ ئەو كاریگەرییەدا، بەداخەوە لە كەم و كوڕی و كێماسی بەدەر نابێ. ئەگەر بمانەوێ لیستێك بەناوی ئەو نووسەرانە بكەین كە بە تەواوی كاریگەری ئەدەبیاتی عیبرییان بەسەرەوە بووە، ئەوا دەبێ لیستێك بە ناوی هەموو نووسەرانی ئەوروپاییەوە، لە سەردەمی ئوگوستینو"١٢" سەدە تا ئەمرۆكە دروست بكەین، كاریگەری گەورەی كتێبی موقەدەس بەسەر واروكایە بەربڵاوەكانی ئەدەبیاتی ئەوروپاییەوە، وەكو وارێن فەلسەفە، ئایین، فۆرم، بابەت و ناوەرۆك، و رەوانبێژی بە زەقی و ئاشكرا دیارە. بۆ نموونە لە واری رەخنەی ئەدەبیی ئینگلیزیدا، دەتوانرێ ناوی زۆر بەرهەم ببرێ كە لە سایەی كاریگەری و ئیلهامی كتێبی موقەدەسدا نووسراون و دانراون. كاریگەری كتێبی موقەدەس لەسەر ئەدەبیاتی ئینگلیز ئەوەندە زۆر و قووڵ و سەیرە كە بە تاقی تەنیا هاوتای كاریگەری هەر هەموو فاكتەرەكانی دیكە دەكاتەوە. لە ئەدەبیاتی ئینگلیزدا، كتێبی موقەدەس سەرچاوەی ئیلهام و سەرۆی زۆر كتێبی دیكەیە. وەرگێڕانی كتێبی موقەدەس بۆ سەر زمانی ئینگلیزی داوێكی قایمە كە لقە جۆراوجۆرەكانی نەژادی ئینگلیزی پێكەوە گرێ دەدات. بە كورتی كتێبی موقەدەس بە مایەی یەكێتی و بەردەوامی ئەدەبیات و شارستانییەتی ئینگلیز دەژمێردرێ، چونكە پرتەوو پرشنگی ئەم كتێبە ئاسمانییە سەرانسەری قۆناغەكانی ئەدەب و رۆشنبیری ئینگلستان رووناك دەكاتەوە، شارەزابوون لە كتێبی موقەدەس باشترین شێوەی هەڵسەنگاندن و نرخاندنی ئەدەبیاتی ئینگلیزییە.

# پەراوێز:

١- شاجیمز (١٥٦٦- ١٦٢٥) لە سالآنی ١٦٠٣- ١٦٢٥ شای ئینگلیستان بووە. گەورەترین وەرگێرانی ئینگلیزی کتێبی موقەددەس لە زەمانی ئەودا، بە دەستی تاقمێك لە ئەهلی کلێسا ئەنجام دراوە کە بە دەقی شاجمیز ناسراوە.

٢- دارعاساکەی موسا: موسا دەستی هەلبڕی و دوو کەرەت دار عاساکەی بە تاوێرەکەدا کێشا و ئاوێکی زۆری لێهاتە دەرێ کە جەماعەت و حەیواناتەکانیان لێیان خواردەوە.

٣- کەرەکەی بەلعام: ئەوسا خوا زمانی کەرەکەی بەلعامی پژاند، کە بە بەلعامی گوت ئەرێ من چم لە تۆ کردووە کە سێ جاران لێت دام.

٤- شدرك و میشك و عبدنعو، سێ ناوی بابلین، بە عیبری عەزریا و خنیا و میشائیل-یان پێ دەلێن، ئەمانە هاورێی دانیال بوونە.

٥- فوریم یا پووریم:

یەکێکە لە جەژنەکانی جولەکە کە رێکەوتی رۆژانی چواردە و پازدەی ئازار دەکات (مانگی شەشەمی تەقویمی ئایینیی جولەکەیە)و بەوپەڕی خۆشی و شادییەوە بەرپا دەکرێ. بەریوایەتی کتێبی ئیستێر ئەم جەژنە یادکرنەوەی رزگاری یەهودییانی ئێرانە لە قەتلّ و عام.

٦- غنوسی:

ناوی کۆمەلێك گرووپی ئایینی پێش مەسیحییەت و سەدەکانی هەوەلّی زایینییە، لەناو ئەم گرووپانەدا جۆرە مەعریفەتێکی روحانی بە مایەی رزگاری مرۆڤ هاتۆتە ژماردن، یەکێك لە پرەنسیپە گرنگەکانیان باوەڕ بوون بە دوالیزمە، واتە جووتە پرەنسیپی خێر و شەڕ.

٧- دومیتیان (٥١- ٩٦م):

ئیمپراتۆری روم بوو کە بە دەسیسەی ژنەکەی کوژرا.

٨- وەرگێڕانی هەفتا کەسە:

کۆنترین وەرگێڕانی یونانی تەوراتە. ئەم وەرگێڕانە لە زەمانی بەتلیموسی دووەمی پاشای میسر (٢٨٥-٢٤٦ی پێش ز) بەهیمەتی ٧٢ کەسی ناو ١٢ تیرەکەی جولەکە، لە ئەسکەندەریە ئەنجام دراوە.

٩- ڤولگات:

وەرگێڕانی لاتینی کتێبی موقەددەسە لە سەدەی چوارەمی زایینی دا کە بە دەستی قەشە هیرونوموس (٣٤٠- ٤٢١ی ز) ئەنجام دراوە.

١٠- ئاپوکریف: دوانزە کتێبی ئاپۆکریف-یش رۆژگارێك لە خانەی کتێبەکانی ئینجیلدا دانراون، کە بریتیین لە: کتێبی یەعقوب، ئینجیلی نیقودیموس، بەرزبوونەوەی یەعقوب، کارەکانی پۆڵس و توکلا، نامەکانی ئابگار بۆ مەسیح، نامەکانی پۆڵس بۆ خەڵکی لائودکیە و ئەسکەندەرییە، نامەی سێیەمی پۆڵس بۆ قرنتیان، ئامۆژگاری پەیامبەران، سێ کتێبی هرماس شوان، و گوتەکانی عیسا مەسیح.

١١- زوربابیل (لەساڵی ٥٢٠ی پێش ز ژیاوە):

شازادەیەکی خانەدانی داودی، حاکمی ئورشەلیمە.

١٢- ئوگوستینوس (٣٥٤- ٤٢٠ی ز)

ئیجتیهادکاری کڵێسا و نووسەر بوو، خەڵکی تاگاشتەیە (لە ئەفریقای باکوور).

# بەشی دووەم

## ئەدەبیاتی یونانی کۆن

## سەردەمی هۆزانی مەلحەمی

## (٩٠٠- ٧٠٠ی پێش ز)

<u>پێشینەیەکی مێژوویی:</u>

خەڵکی یونان تەنیا لە دەڤەری باشووری نیمچە دورگەی بالکان (هیلاس) ئاکنجی نەبوونە، بەڵکو لە ناوچەکانی کەنارێن ئاسیای بچووك، بەشێك لە ئیتالیا و دورگەکانی دەریای ناوەڕاست و ئیجە)ی وەکو کریت و سیسیل-یش. ئاکنجی بوونە. لە خاك و سەرزەمینی بالکاندا شاخ و کێوی زۆر هەبوو و ئەمەش ئەو وڵاتەی تەواو پارچە پارچە کردبوو، و زەمینەیەکی لەباری بۆ دروست بوونی دەڤەرێن بچووك خۆشکردبوو. ئەم دەڤەرانە کە لەڕێگەی دەریاوە پەیوەندییان بە هەندەرانەوە هەبوو، دایەن لە شەڕا بوون لەگەڵ یەکترا.

**دانیشتووانی هەوەڵی نیمچە دورگەی بالکان بریتی بوون لە سێ قەوم:**

١- پلاسگییەکان یا هیلادییەکان:

(ئەمانە دانیشتووانی ئەسڵی نایونانی بوون) کە بە کۆنترین دانیشتووانی سەرزەمینی یونان دەژمێردرێن، و لە گینە پەیوەندییان بە دانیشتووانی ئاسیای بچووکەوە هەبوو بێ و لە نەژادی هیند و ئەورووپایی نەبوونە. سەرچاوەی ئەو زانیارییانەی دەربارەی ئەوان لەبەر دەستدایە بریتییە لە حیکایەت و ئەفسانانی کۆن و لێکۆڵینەوە ئارکولۆژییەکانی شلیمان "١" و ئیڤانز "٢"

٢- ئیجەییەکان- کریتییەکان:

رەنگە لە بنەڕەتدا میدیترانەیی بووبن و لە دەوروبەری ساڵانی ١٨٠٠-١٤٠٠ی پێش ز لەگەڵ پلاسیگییەکاندا تێکەڵ بووبن.

٣- هیند و ئەوروپاییەکانی باکوور:

ئەمانە بە ئاخاییان، دانانیان و هیلنیان بەناوبانگن، پێدەچێت ئەم قەومە لە ساڵانی دوو هەزار- هەزاری پێش ز لە باکووری یونانەوە کۆچیان کردبێ.

لە ساڵی ١١٥٠ی پێش ز بە دواوە سێ گرووپە نەژادی تاڕادەیەکی دیار، واتە دورینەکان، ئایولییەکان و یونییەکان لە وڵاتی یونداندا ئاکنجی دەبن:

١- دورینەکان:

ئەمانە لە پلوپونز، گەلی کورنت، باشووری ئاسیای بچووك، کریت، سیسیل، و هەندێ ناوچەی ئیتاڵیادا دەژیان و شارە گەورەکانیان بریتی بوو لە ئەسپارتە و کورنت و سیراکۆز. ئەم قەومە خەڵکێکی جەنگاوەر و شەڕکەر و پارێزکار و دیندار بوون و زمانێکی سادە و زبریان هەبوو.

٢- ئایولییەکان:

ئەمانە لە بوتیا، لسبوس و باکووری رۆژئاوای ئاسیای بچووکدا دەژیان. ئەم قەومە خەڵکێکی کراوە و جوانی پەرست و خەیاڵپەروەر بوون و بە زمانێکی ئاسك و خۆش دەپەیڤین. ئەمانە کارێکی زۆریان کردە سەر شیعری جۆشدار و پڕسۆز و گوداز.

٣- یونییەکان:

ئەمانە لە ئاتیك و یوبیا و ناوچەکانی ناوەندی ئاسیای بچووك ئاکنجی بوون، ئاتین و خیوس گرنگترین شاریان بوون. یونییەکان خۆش تەبیعەت و بەسەلیقە و خەیاڵ پەروەر بوونە، زمانەکەیان رەوان و دڵگیر و خۆش بوو، کاریگەری ئەوان لە واری ئەدەبیاتدا دەگەڕێتەوە بۆ زمانەکەیان کە بوو بە زمانی هەموو یونانییان و زمانی ئەدەبی کلاسیکی یونان لە مەلحەمەوە بیگرە و بە شانۆنامەدا پێیدا وەرە تا دەگاتە شیعری لیریکی و پەخشانی هەمە جۆر.

**میژووی یونان بەسەر چوار بەشدا دابەش دەبێ:**

١- سەردەمی پلاسیگییەکان یا هیلادییەکان:

(٣٠٠٠- ١٨٠٠ی پێش ز). زانیارییەکی زۆر کەم لەمەڕ میژووی یونانی پێش ساڵی ١٨٠٠ی پێش ز لەبەردەستدایە. لەوەیە ئەم سەردەمە سەردەمی یەکێك لە شارستانییەتەکانی

چاخی بەرد یا چاخی برونز بووبێ، رەنگە هەر لەم سەردەمەدا دانیشتووانی ئەسڵی کەوتبنە بەر هێرشی قەومانی هیند و ئەوروپایی باکوور، یا کەوتبنە بەر هێرش و پەلامار و تالآن و برۆی کریت.

٢- سەردەمی کریتی- مینوسی (١٨٠٠- ١٤٠٠ی پێش ز):

کریت کە هێزێکی دەریایی گەورەی هەبوو، لەم سەردەمەدا بە زلهێز دەژمێردرا. رۆشنبیری و شارستانییەتی کریتی (کە هەندێ سێبەری شارستانییەت و رۆشنبیری میسری پێوە دیار بوو) رۆشنبیری و شارستانییەتی زاڵ بوو. گەلانی ئەم سەردەمە لە دەوروبەری ساڵی ١٤٠٠ی پێش زدا دەکەونە ژێر دەسەڵاتی هیند و ئەوروپییە باکوورییەکان.

٣- سەردەمی موکەنایییەکان (دەوروبەری ساڵانی ١٤٠٠-١١٠٠ی پێش ز):

فەرهەنگ و مەدەنییەتی ئەم سەردەمە درێژەی فەرهەنگ ومەدەنییەتی سەردەمی کریتی- مینوسییە. سەرهەڵدانی حکوومەتێن بچووك، شەڕ و نەبەردان، و هێرشی باکوورییەکان، لە تایبەتمەندییەکانی ئەم سەردەمەن.

٤- سەردەمی دورینەکان (١١٠٠-٩٠٠ی پێش ز):

بە سەردەمی شەڕی گەورە و کۆچ و کۆچبەری دەژمێردرێ (چاخی ئاسن). هیند و ئەوروپاییەکان لەم سەردەمەدا دەبن بەسێ گرووپەوە، واتە دورینەکان و یونییەکان و ئایولییەکان. لەم سەردەمەدا زۆربەی هەرە زۆری شوێنەواری شارستانییەت و فەرهەنگی ئیجەیی لەناوچوو. لە دەوروبەری ساڵانی ١٠٠٠-٨٠٠ی پێش ز ئەلفبای فینیقی جێی ئەلفبای ئیجەیی دەگرێتەوە.

لە سەدەکانی هەشتەم و نۆیەمی پێش ز یۆنان لە هەلومەرجێکی پڕ ئاژاوە و ناسەقامگیردا دەژیا. لەلایەکەوە گیرۆدەی تالآن و برۆ لە باکوورەوە، لەلایەکی دیکەوە گرفتاری کۆچ و کۆچبەری بوو لە دەڤەرێن جیاوازەوە. هەر چەندە لەم قۆناغەدا هێشتا شتێك لە ئارادا نەبوو بە ناوی یەکێتیی نەتەوەییەوە، بەڵام تیرەکان لە حاڵی یەکێتی و خۆناسیدا بوون، ئەم تیرانە لە هەلومەرجی فیۆداڵیدا لە هەوڵ و کۆششی ئەوەدا بوون کە پەرە بەو داب و نەریت و رێورەسمانە بدەن کە مایەی شانازی و فەخری ماڵبات و تیرە و تایفە بوو.

بە ویراسەت یا بازیل سەرکردایەتی تیرەکان دەکرا، کە ئەم سەرکردایەتییە دەسەڵاتی رەهای سیاسیی هەبوو، ئەمە جگە لەوەی ئەرکی فەرماندە، قازی و کاهینیشی دەگرتە دەست. بازیل لەلایەن شورای ئەشرافەوە، کە دەوری راوێژکاریی هەبوو، پشتیوانی دەکرا، شورایەکی

(ئەنجوومەن) دیکەش هەبوو کە گۆڕ یا ئەنجوومەنی خەڵکی (ئاگورا) پێی دەگوترا. ئەندامانی ئەم ئەنجوومەنە دەسەڵاتی سیاسییان نەبوو، بەڵام لە هەندێ حاڵەتی تایبەتیدا کە پرسیان پێدەکرا، هەقی رای پۆزەتیف یا نێگەتیفیان هەبوو. ئیدی ئەشراف لە ماوەی سەدەی هەشتەمدا دەسەڵاتی ئەو سەرکردایەتییەیان کەم کردەوە و سیستەمی دەوڵەتی شار -کە پاشان بایەخێکی فراوانی پەیدا کرد- هاتە سەرکار.

چینە کۆمەڵایەتییەکانی ئەم سەردەمە بریتی بوون لە ئەشراف (فیودال)و هاوشارییانی ئازاد و کۆیلە، ئەشراف بەشی هەرە سەرەکی سەروەت و سامانیان لەدەستدا بوو، زۆربەی مەسرەفی شەڕ لە ئەستۆی ئەوان بوو. هاوشارییانی ئازاد زیاتر بە کاری کشتوکاڵی و ئامادەکردنی بژێوی و دروست کردنی ئەوزارێن سادە و ساکارەوە خەریك بوون، کۆیلەکانیش هەمان کارەکانی هاوشارییانی ئازادیان ئەنجام دەدا و بە شێوەیەکی مرۆڤانی مامەڵەیان لەگەڵدا دەکرا. سیستەمی کۆمەڵایەتی ئەم سەردەمە باب سالاری بوو، بەڵام دایکانیش زۆر حورمەت دەگیران و تارادەیەکی زۆریش سەربەخۆ بوون، ژیانی خێزانداری پیرۆز بوو، میوانپەروەر و ئانبدەیی دەرهەق بە بێگانان ئەرکی سەرشان بوو.

کاری سەرەکی خەڵکی بریتی بوو لە کشتوکاڵ، مالآت بە خێوکردن، ئامادەکردنی سەنعەتی سادە و ئەوزاری جەنگی، میوانداری و خۆشگوزەرانی، سروود و گۆرانی، شانۆی سوار چاکی و پێشبڕکێ و فیستیڤاڵ لە ناویاندا باو بوو، زۆریان بایەخی بە وەرزش دەدا و پەروەردەکردن و مەشقدادانی وەرزشکاران لە جوملەی چالاکییە دیارەکانی ژیانی رۆژانەیان بوو، ئەوە بوو لە ئەنجامدا چوار جۆرە گەمەی میللی هاتە ئاراوە کە بریتین لە: پێشبڕکێی ئۆلومپیك لە ئیلیس، پوتیایی لە دیلفی، ئیستمی لە کورنت، و نەمەیی لە نەمە، یەکەمین ئولومپیاد لە ساڵی ٧٧٦ی پێش ز بەرپا بوو.

ئایین و مەزهەب ئاوێتەی ژیانی یونانیان بوو، خودا یانی ئەوان وەکو مرۆڤ وابوون و تۆزێ لە مرۆڤ باڵاتر بوون. ئەم خواوەندانە هەوەسباز، بێ ئەخلاق، و هەندێ جار بەدکرداریش بوون، زۆر هەستی مرۆڤایەتی وەکو حەسودی و تووڕەیی و هەوەسبازی و تۆڵەئەستێنیان تێیدا بوو. ئەوان نیازی خۆیان لە رێگەی پێشگۆیان و غەیبگۆیانی پەرستگاکانەوە (کە دوو گرووپی بەناوبانگیان بریتی بوون لە غەیبگۆیانی پەرستگەی زیوس لە دۆدۆن، پەرستگەی ئاپۆلون لە دلفی) جێبەجێ دەکرد. خەڵکی یۆنان باوەڕیان بە ژیانی ئەو دنیا هەبوو- ژیانێکی ئاڵۆز لە

هادیسدا بۆ خەڵکی ئاسایی، سزا لە تارتارۆس (بەشێکی تایبەتییە لە هادیس) بۆ تاوانکاران، و رەحمەتی بێ سنوور لە ئیلیسۆم بۆ پاڵەوانان.

**نۆڕینێکی گشتی:**

سەرکردەی تایفەکان لە سەدەی هەشتەم و نۆیەمی پێش زایینیدا بە گوێرەی گۆڕانکارییەکان روویان کردە ئەفسانەکانی سەدەکانی پێشوو، واتە روویان کردە سەردەمی پڕ رەونەق و شکۆداری قارەمانێتی و پاڵەوانێتی. ئەم سەرکردانە پشت و پەنای داستان بێژانێك بوون کە سەربهوورد و ئەفسانەی سەیریان دەرهەق بە سەرکەوتنەکانی گەورەپیاوان دەهۆنییەوە، گەورە پیاوانێ کە خۆیان بە نەژادی خوایان و هاونشین و هاوشانی خودایان دەزانی. ئەم ئەفسانە و بەیتانە پشتاوپشت لە نەوەیەکەوە دەگەییە نەوەیەکی دیکە و سەرچاوەی ئیلهام و سروشی هۆمەر بوون لە ئەفراندنی ئەدەبیاتی سەردەمی مەلحەمیدا.

## هۆمەر:

هەڵبەتە زانیارییەکی زۆر کەم لەمەڕ ژیانی هۆمەری (لە دەوروبەری ٨٥٠ی پێش ز دا ژیاوە):

گەورە مەلحەمە بێژی یونان بە ئێمە گەییوە. هومەر بە زمانی یۆنیایی شیعری گوتووە، بۆیە لە گینە لە دەڤەری یونیادا ژیا بێ. بە قسەی پێشینان هۆمەر کەسێکی نابینا بووە و خەڵکی ئەزمیر یان خیوس بووە (هەروەها شارانی کولوفن، سالامیس، رودس، ئارگوس، و ئاتینیش بە زێدی وی ناوبراون)، بەڵام لەوە دەچێ لە ناوچەی یونیا، لە ئاسیای بچووك هاتبێتە دنیاوە.

دەربارەی هۆمەر و ئیلیادە و ئودیسە هەمیشە دوو پرسیار لەگۆڕێ بووە:

١- ئایا ئەم دوو بەیتە هەردووکیان لەلایەن هۆمەرەوە دانراون؟

٢- ئایا هۆمەر هەندێك لە بەشەکانی ئیلیادە و ئۆدیسەی داناوە؟

ئەم دوو پرسیارە هەوەڵجار کسنون[٣] و هلانیکوس[٤] خستویانە روو، و تا ئێستا بە دەقی خۆیانەوە ماون. تۆژینەوەی هەڵوەشانەوە گەرایان لەسەر بنەما و بناغەی جیاوازی ئەم دوو بەیتە لەرووی شێوازی دەربڕین، پوختەیی، تۆن، مەیلی ئایینی، و چۆنیەتی هونەری رۆنراوە. نەیارانی ئەم تیۆرییە (کە یەکەم کەسیان ئاریستارخوس[٥] ٢٢٢- ١٥٠ی پێش ز بوو) مەسەلەکەیان بەو جۆرە شیدەکردەوە کە گوایە ئودیسە بە ماوەیەکی زۆر پاش ئیلیادە نووسراوە و ئەمە جگە لەوەی کە لێکچوونی نێوان ئەم دوو بەیتە زۆر لە جیاوازییەکانیان بەرجەستە تر و دیارترە.

مەسەلەی دانانی ئەم دوو بەیتە لەلایەن شاعیرانی جیاوازەوە، بۆ یەکەم جار لەلایەن فردریك ولف-ی ئەڵمانییەوە لە ساڵی ١٧٩٥دا لە کتێبی پێشەکی هۆمەردا خرایەڕوو، بەڵگەی ولف ئەمە بوو کە:

١- زمانی یۆنانی تا بەر لە ساڵی ٧٠٠ی پێش ز زمانی نووسین نەبووە.

٢- هۆمەر لە دەوروبەری ساڵانی ٨٥٠ی پێش ز ژیاوە.

٣- ئەم دوو بەیتە لەوە درێژترو ئاڵۆزترن تا بشێت بخرێنە خانەی بەرهەمە ئەدەبییەکانی سەرەتاوە.

٤- لەوە درێژترن کە دەماودەم لە نەوەیەکەوە بگاتە نەوەیەك و "گوێگری خۆیان هەبێ".

٥- بەیتەکان پڕن لە ناکۆکی. ولف پێی وایە کە بە دەستووری پیسیستراتوس (حوکمڕانی دیکتاتۆری ئاتین، کە لە ساڵی ٥٢٧ی پێش ز مردووە) هەر پارچەیەکی لە شوێنێ کۆکراوەتەوە، و پاشان لەلایەن شاعیرانی جۆراوجۆرەوە خراونەتە قاڵبی دوو بەیتی تەواوە، واتە ئیلیادە و ئۆدیسەیان لێ دروست کراوە. هیرمان"٦" بەشی سەرەکی هەردوو بەیتەکە بە دانراوەی هۆمەر دەزانێ و باقیەکەشیان بەهی شاعیرانی دی دەزانێ. لاکمان"٧" ئیلیاد بە هەژدە بەیت دەزانێ و هەر بەیتێکی بەهی شاعیرێك دەزانێ.

ئەو بۆچوونەی کە بەلای هەمووانەوە پەسندە ئەمەیە کە هۆمەر سەرچاوەی زۆری بەکار هێناوە، هەمووی رێك خستووە و مشتوماڵی داوە و ئەوجا لە شێوەی دوو بەیتدا رێکی خستوونەتەوە و هۆنیویەتێوە. دەشێت دواتر دەستکاری کرابن. جیاوازی ریتمی زمان و شتەکانی دیکەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە ئۆدیسە زۆر پاش ئیلیاد هۆنراوەتەوە.

دەماودەم کردنی ئەم دوو بەیتە (مەلحەمە) گەورەیە ئەگەرچی بۆ ئەمڕۆ بە دوور دەزانرێ بەڵام مەحاڵ نییە. بەهەرحاڵ رەنگە ئیلیاد و ئۆدیسە پاش ساڵانی ناوەڕاستی سەدەی شەشەم دانرابن.

## بەیتەکانی هۆمەر

### ئیلیاد:

#### پێشینەیەکی مێژوویی:

لێکۆڵینەوەکانی هنریش شلیمان لە ساڵی ١٨٧٠دا ئەوەیان ساغ کردەوە کە شاری مێژوویی ئیلیون (تروا) کەوتۆتە سێ میلی باشووری رۆژئاوای تەنگەی دەردە نیلەوە لە ئاسیای بچووك، ئەم شارە لە ساڵی ١١٨٤ی پێش ز لەلایەن ئاخییەکانەوە داگیرکراوە.

**پێشینەیەکی ئەفسانەیی:**

پلیوس-ی شای تسالی، وتیتیس "٨"، هەموو خواوەندان و بانۆ خودایان جگە لە ئیریس "٩" (دیسکورد) بۆ ئاهەنگی زەماوەندەکەی خۆیان دەعوەت دەکەن. ئیریس لەم رەفتارە تورە دەبێ، بەهەرحاڵ خۆی دەگەیەنێتە دەعوەتەکە و سێوێکی زێرین، کە دەستەواژەی ((پێشکەشە بە جوانترین ژنان ))ی لەسەر هەڵکەندرابوو بۆ ناو میوانەکان غل دەکاتەوە. هیرا "١٠"، ئاتینە "١١"، و ئافرۆ دیتە "١٢" هەر سێکیان سێوەکە بە هی خۆیان دەزانن و داوا لە زیوس دەکەن بکەوێتە بەینیانەوە و حوکم بدا کە سێوەکە بە نەسیبی کامیان دەبێ. زیوس بە زیرەکی خۆی لەم داوەرییە رزگار دەکات و ئەم ئەرکە بە پاریس-ی کوڕی پریام-ی شای تەروا (تەروادە) دەسپێرێ. هیرا، بۆ دەم چەور کردنی پاریس، بەڵێنی پایە و سەروەت و سامانی دەداتێ. ئاتینە بەڵێنی دەداتێ کە لە جەنگدا سەری بخات، بەلام ئافرۆدیتە قەولی دەداتێ کە هیلین-ی جوانترین ژنی جیهانی بکات بە هاوسەر. پاریس-ی گەنج و میهرەبان، سێوەکە پێشکەش بە ئافرۆدیتە دەکات، و بە هاوکاری ئەو (ئافرۆدیتە)، هیلینی ژنی مینلایوس-ی شای ئەسپارتە دەرفێنێ و لەگەڵ خۆیدا بۆ تەروای دەبات. بە گوێرەی پەیمانێکی کۆن، سەرکردەی تایفەکانی یونان کۆبوونەوەیەك دەکەن تا یارمەتی مینلایوس بدەن و دووبارە ژنەکەی بە دەست بێنێتەوە. سوپایەك بە فەرماندەیی ئاگا مەمنوون-ی حوکمڕانی موکەناو برایەکەی مینلایوس بەرێدەکەوێ. ئەم سوپایە پاش گێرمە و کێشەی زۆر، ئەنجام دەگاتە کەنارەکانی تەروا و شار و دەڤەرەکانی دەوروبەری گەمارۆ دەدات، ئەم گەمارۆیە پتر لە نۆ ساڵان دەخایەنێ، کە سەرگوزەشتەکانی ئیلیاد لەو زەمانەوە دەست پێدەکات.

**حیکایەتەکە: (واتە حیکایەتی ئیلیاد):**

ئاگامەمنون، کروزییس-ی یەخسیری تەروادەیی وەکو دەستکەوتێك لەلای خۆی گل دەداتەوە. هەر چەندە کروزس-ی بابی کروزییس و کاهینی پەرستگەی ئاپۆلون پێشنیازی ئەوە دەکات کە باج بدات، بەلام ئاگامەمنون رازی نابێ و کیژەکە ئازاد ناکات، لەسەر داوای کروزس، ئاپۆلون سزای یونانییەکان دەدات و تووشی تاعونیان دەکات. ئەنجام ئاگامەمنون دەست لە کەللەڕەقی و خۆسەری هەڵدەگرێت و کروزییس ئازاد دەکات، بەلام لە جیاتی وی بریزییس-ی ماشوقەی ئاخیلوس (کوڕی پلیوسو توتیس و باشترین جەنگاوەری یونانی) یەخسیر دەکات. ئاخیلوس تورە دەبێ و نایەوێ بەشداری شەڕ بکات. شەڕ بەرە بەرە توند دەبێ، تا پاترۆکلوس-ی دۆستی نزیکی ئاخیلوس، بە ئەمانەت زرێیەکەی لێ وەردەگرێ و لە جەنگدا بە

دەستی هیکتۆر-ی سەرکردەی جەنگی تەروا و کوڕی پریام دەکوژرێ. ئاخیلوس لەم رووداوە تووڕە دەبێ و لەگەڵ ئاخیلوسدا ئاشت دەبێتەوە، دووبارە دێتەوە مەیدانی شەڕ و لە شەڕێکی تەن بەتەندا هیکتۆر دەکوژێت (و دەست بەسەر تەرمەکەیدا دەگرێ). ئەنجام، لەبەر شەفاعەتی پریام و بە وەرگرتنی غەرامەت تەرمەکە دەداتەوە. بەیتی ئیلیاد بە رێورەسمی ناشتنی جەنازەکەی هیکتۆر و پاشماوەی ئێسکە پەیکەرەکەی کۆتایی دێت.

## ئودیسە:

**زەمینەی میژوویی:**

ئەم بەیتە زەمینەی میژوویی نییە.

**پێشینەی ئەفسانەیی:**

پاش مەرگی هیکتۆر، ئاخیلوس بە دەستی پاریس دەکوژرێ. یونانییەکان لەسەر پێشنیازی ئودیسیوس یا ئودیسە (ئولیس"١٣") ئەسپە دارینەیەکی ناوبەتاڵی گەورە ئامادە دەکەن، پڕی دەکەن لە جەنگاوەران و وا دەنوێنن کە لە گەمارۆی شار ماندووبوون و دەیانەوێ بگەڕێنەوە، سینون-ی جاسوسی یۆنانی، کە وەکو سەربازێکی هەڵاتوو خۆی نیشان دەدات، خەڵکی تەروا فریو دەدات تا ئەسپەکە بۆ ناو شار ببات. شەوێ جەنگاوەرەکان بە کۆمەکی سینون لە ناو ئەسپەکەوە دێنە دەرێ و دەروازەکانی شار دەکەنەوە.

سەربازانی یونانی کە گەڕاونەتەوە، دێنە ناو شارەوە، تەروا وێران دەکەن و هیلین لەگەڵ خۆدا هەڵدەگرن و بەرەو وڵاتی خۆ دەگەڕێنەوە.

**حیکایەتی ئودیسە:**

کۆمەڵێك رووداو و واریقاتی سەرەکی تان و پۆی حیکایەتی ئودیسە پێك دەهێنن لەوانە:

١- گەڕانی تلماخوس بە دوای ئودیسیوسدا.

٢- سەرگەردانییەکانی ئودیسیوس

٣- کێشمانەکێشی پنلوپە لەگەڵ خوازبێنیکەرەکانیان.

٤- کۆتایی بەیتەکە، لێرەدا رووداوەکان بە شێوەیەکی هونەرییانە یەك دەگرنەوە و دەچنرێن.

١- تلماخوس، بە دوای دۆزینەوەی ئودیسیوس-ی بابی دا لە ئیتاکاوە بۆ پیلاس، و ئەسپارتە دەڕوات، بەڵام گەڕانەکانی بێهودە دەبێ.

٢- ئودیسیوس لەگەڵ کەسوکار و دەست و پێوەندەکانیا بەرەو ئیتاکای قەڵەمڕەوی حکومەتەکەی خۆی دەکەوێتە رێ و لە رێگەدا تووشی زۆر "١٤" رووداوان دەبێ، لەوانە: شەڕ لەگەڵ سیکون-ەکاندا، دیتنی کونار خۆرەکان، شەڕ لەگەڵ پولوفموس "١٥"-ی سیکلوپ "١٦" دا، تێکشکانی کەشتییەکەی بە هۆی خاڵی بوونی موشەدەمەکەیان "١٧" لە با، دیداری سیرسە "١٨"، ئەو ژنە جادووگەرەی کە هاوڕێیانی ئودیسیوسی دەکرد بە بەراز، بەڵام بە هۆی ئەو گیایە جادوییەوە کە هیرمیس "١٩" ئامادەی دەکرد دەبنەوە بە ئادەمیزاد: گفتوگۆ لەگەڵ روحی مردوواندا، هەڵاتن لە دەستی سیرنەکان "٢٠"، ئەو پەرییە جوانانەی کە بە ئاوازی دلڕفێن دەبنە باعیسی مەرگی دەریاوانان، رزگار بوون لە چنگی سکیلاو "٢١" کار بیدس "٢٢"، ئەو دێوە دەریاییانەی کە لە گەلی نێوان سیسیل و ئیتالیادا بۆ شکار خۆیان لە بۆسە دەدا، کوشتنی ئەو کەڵەگا پیرۆزانەی کە هی هەتاو بوون، و لە تۆڵە و سزای ئەوەدا کەشتییەکەیان گیرۆدەی تۆفان و لافاوێکی ترسناك دەبێ و دەشکێ، مانەوەی حەوت ساڵەیان لە دوورگەی ئوگوگیا لەلای کالیپسو "٢٣" شکانی کەشتییەکەیان بە دەستی پوزیدون "٢٤" و لەسەر داوای پولوفموس، دیدار لەگەڵ ئالکینوس-ی شای فیاسینەکاندا، و حەرەکەتی دووبارە بەرەو ئیتاکا.

٣- پنلوپەی هاوسەری ئەمەکداری ئودیسیوس ساڵانێکی دوور و درێژ خۆی لە قەبووڵ کردنی داوای خوازبێنیکەرانی دەدزێتەوە. خوازبێنیکەران زیاتر سەروەت و سامانی ئودیسیوس بەبادا دەدەن و تەنانەت پیلانی کوشتنی تلماخوس-ی (کوڕی ئودیسیوس)ش دادەنێن.

٤- ئودیسیوس و تلماخۆس بۆ ئیتاکا دەگەڕێنەوە و نەخشەیەك دژی خوازبێنیکەرانی دادەنێن، پنلوپە بێ ئەوەی ئاگای لە گەڕانەوەی مێردەکەی بێ، قایل دەبێ ببێ بە هاوسەری ئەو کەسەی بتوانێ کەوانە کۆنەکەی ئودیسیوس رابکێشێت. ئودیسیوس بە جلێکی ترەوە دێ و گرێوەکە دەباتەوە، خوازبێنیکەرەکان دەکوژێت و ئەوجا خۆی ئاشکرا دەکات. کەسوکاری کوژراوەکان خۆ بۆ تۆڵەسەندنەوە تەیار دەکەن، بەڵام ئاژاوەکە بە ناوبژیوانی ئاتینە و زیوس کۆتایی دێ.

<u>یاساکانی مەلحەمەبێژی بە گوێرەی بنەمای بەیتەکانی هۆمەر:</u>

أ- دەبێ سەربەهووردی پاڵەوانێك (هەڵبەتە پاڵەوانێکی نەتەوەیی) بکرێ بە بابەتی مەلحەمەکە.

ب- کۆمەك خواستن لە خواوەندانی هۆزان و هونەر (بە تایبەتی لە کالیوپە) "٢٥".

ج- دەستپێکردنی بەیتەکە لە ناوەڕاستی حیکایەتەکەوە و پاشان گێڕانەوەی ڕووداوەکانی بەشی یەکەم (مەلحەمەی ئیلیاد لە دەیەمین ساڵی شەڕدا دەست پێدەکات، مەلحەمەی ئودیسە بە ویستی ئودیسیوس بە حەرەکەت لە کالیپسووە دەست پێدەکات.

د- سوود وەرگرتن لە خەسڵەتێن جێگر و هەمیشەیی وەکو ئاتینەی چاو سەوز، ئوزیکای باز و چەرمگ، ئاخیلوس-ی خۆشبەز.

هـ- لێکچوونی مەلحەمی، لێکچوونی درێژ، ئەو لێکچوونانەی کە دەربارەی کار و ڕووداوەکان بە کار دەبرێ و زیاتر لە تەبیعەتەوە وەردەگیرێ.

و- سوود وەرگرتنی زۆر لە مەنەلۆگ، وەکو قسەکانی ئودیسیوس لە دەعوەتەکەی ئالکینوسدا.

ز- تەدەخولی خواوەندان لە کاروبارە مرۆڤانییەکاندا.

ح- کێش و وەزن، سوود وەرگرتن لە کێشی ڕەزمی بەحری شەش پایەیی کە هەر پایەیەك لە سێ بڕگە پێك دێ، بڕگەی یەکەم درێژ و دوو بڕگەکەی دی کورتن.

**کورتەیەکی ڕەخنەکان:**

پتر لە دوو هەزار ساڵە کە هۆمەر بە یەکەمین کەسایەتی گەورەی ئەدەبی ڕۆژئاوا دەژمێردرێ، و تێپەڕبوونی ڕۆژگاران هیچی لە گەورەیی پێگەی ئەو لە دنیای ئەدەبیاتدا کەم نەکردۆتەوە.

وێڕای ئەمەش بەیتەکانی هۆمەر پڕن لە کەم و کوڕی و غەفڵەت. ئەمە جگە لە زۆر پارچە و کۆپلەی تاقەتبەری وەکو پێرست و لیستی تایبەتمەندی کەشتییەکان لە ئیلیادە، وەسفی زرێکەی ئاخیلوس لە ئودیسەدا. دووبارەکردنەوە و کاوێژکردنەوەش زیان بەم چیرۆکە دەگەیەنێ... هەڵبەتە بەیتەکان نەك هەر لە هێزی باڵای مەزهەبی بەدەرن، بەڵکو خواوەندەکانیش لە ئەخلاق بەدوورن و هەندێ جار مایەی ڕیشخەنن.

هەڵبەتە لە پاڵ ئەم کەم و کوڕییانەشدا، ئەو بەیتانە لەڕووی بونیادەوە یەجگار بەرزن، هاوسەنگییەکی زۆر لە نەخشەی حیکایەتەکەدا هەیە، کاراکتەرەکان هاوتان، بەیتەکە لە ناوەڕاستەوە دەست پێدەکات. وشە و زاراوە و زمانی ئیلیاد و ئودیسە دەوڵەمەند و سوار و ڕەوانە، بەیتەکان لێوانلێوی فۆرمی بەیانیی زیندوو و بەهێزن. هەر چەندە لایەنی مەزهەبی-ش لە بەیتەکان وێنە دەگیرێ، بەڵام پێگەیەکی بەرزی نییە، لێ قارەمانانی داستان (مەلحەمە) بە نموونەی بەرزی ئاکاری ئەخلاقی دەژمێردرێن، وەکو شەهامەت و بوێری، ئەقل و ئاوەز، ڕاستگۆیی خودی، سەبرو دادپەروەری. بە هەر حاڵ هۆمەر ڕۆشنبینییەکی قوڵ و دەوڵەمەندی

لەمەڕ سروشت و تەبیعەتی مرۆڤ هەیە. گەلێك لە کاراکتەری داستانەکانیشی کەسانی جیهانی و بێ زەمانن، واتە هی هەموو زەمانەکانن.

## هیسیود

هیسیود (لە دەوروبەری ساڵی ٨٠٠ی پێش ز ژیاوە)، شاعیرێکی داستان بێژی یونانە لە گوندی ئاسکرا-ی سەر بە بویتا، لە نزیکی کێوی هیلیکون لەدایك بووە و هەموو تەمەنی لەوێندەر بردۆتە سەر. هیسیود بە خۆی دەڵێ کە پاش مەرگی بابی، پرسیس-ی برای بە فێڵ و بەشە میراتەکی ئەو بۆ خۆی دەبات. جگە لەمە چ زانیارییەکی دیکەمان دەربارەی ژیانی هیسیود لەلا نییە.

### بەرهەمە ئەدەبییەکانی:

**کاران و رۆژان (ئیرگا):**

ئەمە قەسیدەیەکی درێژە لەسەر کێشی رەزمی دانراوە و چوار بەشە، بەشی یەکەم (١-٣٨٢) بریتییە لە کۆمەڵێك پەند و ئامۆژگاری کە پرسیس و ئەو قازییانە دەدوێنێ کە دەستیان هەبووە لە مەحرومکردنی هیسیود لە بەشە میراتی خۆی، شاعیر، پرسیس لە نەزانی ئاگادار دەکاتەوە. بەشی دووەم (٣٨٣- ٦٩٤) بریتییە لە کۆمەڵە رێنوێنییەك دەربارەی کشتوکاڵ و دەریاوانی. بەشی سێیەم (٦٩٥- ٧٦٤) بریتییە لە کۆمەڵە ئامۆژگارییەکی گشتی و ئاکار و ئەخلاقی باو، و پتر لایەنی عەمەلی هەیە. بەشی چوارەم (٧٦٥- ٨٢٨) بریتییە لە کۆمەڵێك خورافات دەربارەی رۆژانی خۆش و رۆژانی شوم.

**ماڵباتی خودایان:**

ئەمە گێڕانەوەیەکی شاعیرانەیە لەسەر وەزن و کێشی رەزمی، هەوڵێکە بۆ جۆرە سیستەم بەخشینێك بە ئەفسانان. هیسیود ماڵباتی خودایان دەژمێرێ و دەکەوێتە دەربڕینی جەنگی نێوان تیتانەکان و خواوەندانی ئۆلەمپی و ئەفسانەکانی پاندورا و پرومتەیوس (یا پرومتە)، و شرۆڤەیەك سەبارەت بە چوار سەردەمی ژیانی ئادەمیزاد بەدەستەوە دەدات: سەردەمێن زێڕ، زیو، حەوجۆش و ئاسن.

**بایەخی هیسیود:**

هۆمەر شیعری بۆ پاشایان دەگوت و هیسیود بۆ گوندییانی دەگوت. هیسیود وێڕای ئەوەی کە شاعیرێکی وشك، کورت بین، کۆنەپەرست، خورافات پەروەر، خۆپەسند و سست خەیاڵ بوو، توانی

ئەو کارەی کە خۆی بۆ تەرخان کردبوو، ئەوەی بە خۆی پێی دەگوت نیشاندانی حەقیقەت بگەیەنێتە سەر، هەندێ جار (برێك تروسکەی راستەقینەی شیعری) نیشان دەدا. هیسیود بەیتێکی بە نێوی (بیرەوەرییانی دێهاتی راستەقینە) لە پاش بەجێ ماوە. پیاوێکی سادە و ئەهلی عەمەل بوو و هەمیشە "لایەنی راستی لە بەرانبەر کەچی دا دەگرت". کاران و رۆژان-ەکەی کۆمەڵێك پەندی پڕ مانای تێیدایە کە هێشتاش هەر لەسەر زارانن (وەکو نیوە گەورە ترە لە گشت) و "خودایانی ئەمر لە بەرانبەر فەزیلەتدا شەرمەزارن" کتێبی (ماڵباتی خودایان)ـەکەی گەنجینەیەکی گرانبەهای ئەفسانانە، رەنگە (ئەگەر چاوپۆشی لە بەرهەمەکانی هۆمەر بکرێ) بە کۆنترین نموونە بژمێردرێ.

## بەیتە مەلحەمییە وەرزییەکان (دەورییەکان)

ئەمرۆکە لەو بەیتانەی کە بە ناوی بەیتێن مەلحەمی دەوری یا وەرزییەوە بەناوبانگ بوون تەنیا هەندێ ناونیشان و کۆپلەی پەراگەندە ماوەتەوە. ئەم شیعرانە لە بنەڕەتدا بە مەبەستی تەواو کردنی مەلحەمە و داستانەکانی هۆمەر دانراون، ئەوەی سەبارەت بە تەروا-یە، بە دەستی پروکلۆس- کە ناسنامە و ساڵانی ژیانی نەزانراوە- هاتۆتە کورت کردنەوە و گۆڕین و هەندێ جار شتیشی بۆ زیاد کراوە.

**دەوری Thebancycle:**

داستان و مەلحەمە سەرەکییەکانی ئەم وەزرە بریتین لە: ماڵباتی خودایان. کە باسی دروست بوونی ئاسمان و زەوی دەکات. تەبییەکان، ئودیپدیا و ئیپیگونەکان، کە سەربهووردی ئودیپوس (ئودیپ) دەگێڕنەوە.

**دەورەی تەروا:**

داستانە (مەلحەمە) سەرەکییەکانی ئەم دەورەیە (وەرزە) بریتین لە: کوپریا، ئیلیادی بچووك، تالانکردنی تەروا، گەڕانەوەی ئاترید، و تیلگونیا، کە باسی پێشینەی چیرۆکی تەروا لە سی ساڵی بەرلە جەنگی ئیلیادەوە تا زەمانی مەرگی ئودیسیوس دەگێڕنەوە.

## داستانە سەربەخۆکان

ناونیشان یا هەندێ کۆپلە (لەسەر کێشی رەزمی) لە دەمە مەلحەمەی دیکە بە دەست هاتووە، کە هیچیان ناچنە خانەی وەرزە مەلحەمییەکانەوە. سیان لەم دە داستانە بەسەرهاتی هەرکول دەگێڕنەوە و دووانیان بەسەرهاتی نییە.

## مەلحەمەی گاڵتەجاڕی

### جەنگی بۆق و مشکان"٢٦" (ڕەنگە بگەڕێتەوە بۆ ساڵانی ٤٠٠ی پێش ز):

نووسەرەکەی نادیارە. ئەم شیعرە لاسایی کردنەوەیەکی گاڵتەجارییانەی داستانەکانی هۆمەر و پەیڕەوانی هۆمەرە، بۆقان و مشکان بە ویقار و سامەوە لەگەڵ قارەمانانی هۆمەردا دەکەونە شەڕ، ئەم جەنگاوەرانە پاش ئەوەی پیس زامدار دەبن یا تەنانەت دەکوژرێن دووبارە لەسەر شانۆ دەردەکەونەوە، بەجۆرە پەیوەندی نێوان گیانلەبەران و خودایان بە شێوەیەکی ئاوێتە لە گاڵتەجاڕی و لە جدییەت دەبێتە مایەی تەوس و گاڵتەجاڕی. پلۆت یا نەخشەی شانۆنامەکە لاسایی کردنەوەیەکی هەجو ئامێزی جەنگێکی مەلحەمییە. مشکێك لە چنگی پشیلەیەك هەڵدێ، و تووشی پاشای بۆقان دەبێ. پاشا بە ڕێزەوە داوا لە مشکەکە دەکات کە سواری پشتی بێ تا لە گۆلاوێك بپەڕێتەوە. لە کاتی سەفەرەکەیاندا مارێکی ئاویان لێ پەیدا دەبێ و دەترسن، بۆقەکە بێ بیرکردنەوە خۆی لە ئاوەکەدا نقوم دەکات، و مشکەکە غەرق دەبێ. مشکان تووڕە دەبن و شەڕ لەگەڵ بۆقاندا رادەگەیەنن، بە توێکڵی لۆبیا و گوێز و گەڵای کاژ دەکەونە ئامادەکردنی زرێ و قەڵغان و نێزە، بۆقانیش بە گوڵی خەتمی، کەلەم، چەوەندر، و نەیچەی دەریاییەوە ئامادە و تەیار دەبن.

گوتاری بەجۆشی فەرماندەکان جەنگاوەران بۆ شەڕ هاندەدا. ئەنجوومەنی راوێژکاری خواوەندان پێکدێ تا بریار لەسەر لایەنگری یەکێك لە بەرەکان بدرێ. کاتێ ئاتنە پشتیوانی لە هیچ لایەکیان ناکات، مشکەکان جلەکانی دەخۆن و کونی دەکەن. و بۆقەکان بە قرەقر تووشی سەریەشەی دەکەن، لەم کاتەدا تاقمە مێشێك پڕوپاگەندەی هێرش و پەلامار بڵاودەکەنەوە، و شەڕێکی گەورە دەست پێدەکات. زۆر قارەمان لەناو دەچن، لەم کاتەدا کۆمەڵە قرژاڵێکی زۆر و هەورە تریشقە و بروسکە لەلایەن زیوسەوە دەنێردرێن و کۆتایی بە جەنگەکە دێنن.

هەر چەندە ئەم بەیتە لەڕووی ئەدەبییەوە لاوازە، بەڵام لە هەندێ لایەنەوە لە گاڵتەجاری راستەقینە نزیك دەبێتەوە، ئەمە جگە لەوەی کە کاریگەرییەکی زۆری بەسەر شاعیرانی داستانی گاڵتەجارییەوە هەبووە. پێویستە لەم بارەیەوە ئاماژە بۆ رۆلن هاگن"٢٧"، و پارنیل"٢٨" و (کە تەرجەمەی ئازادی جەنگی بۆقان و مشکانیان کردووە) پوپ بکرێ.

## سروودێن هۆمەری

زاراوەی (سروودێن هۆمەرییانە) بە سی و چوار سروودی بێ خاوەن (واتە خاوەنەکانیان نادیارە) دەگوترێ کە مێژووی هۆنینەوەیان بۆ سەدەکانی حەوتەم تا چوارەمی پێش ز دەگەڕێنەوە: ئەم سروودانە کە لەسەر وەزنی حەماسی دانراون، ژمارەی بەیتەکانیان لە نێوان ٣٠- ٦٠٠ بەیتە، بەلام زۆربەیان کورتن. نێورۆکی سروودەکان هەمە جۆرە، هەندێکیان موناجاتە، بڕێکیان چوونە بەر دەرگای خوایە، یان پێشەکی حیکایەتن، بەناوبانگترینیان بریتییە لە: سروودی ئافرۆدیتە، سروودی هرمس، و سروودی دیمتر.

# پەراوێز:

١- شلیمان (١٨٢٢- ١٨٩٠) کەوناراناسێکی ئەڵمانییە،

٢- ئیڤانز (١٨٥١- ١٩٤١) ئارکولۆجیستێکی ئینگلیزییە.

٣- کسنون (٣٢٥- ٢٣٤ پێش ز) ئەدیب و زانایەکی سەرف و نەحوی یونانییە.

٤- هیلانیکوس (٤٩٠- ٤٠٥) مێژوونووسێکی یونانییە.

٥- ئاریستارخوس (؟) زانایەکی سەرف و نەحو و رەخنەگرێکی یۆنانییە.

٦- هێرمان (١٠١٣- ١٠٥٤) شاعیرو مێژوونووسێکی ئەڵمانییە، بە هێرمانوس کونتراکتوس-ش ناسراوە.

٧- کارل لاکمان (١٨٥١- ١٩٧٣) زمانەوانێکی ئەڵمانییە.

٨- تیتس- Thetis: خواوەندی دەریا و دایکی ئاخیلوس.

٩- ئیریس- Eris: خواوەندی بوختان و دووروویی و ئاژاوە.

١٠- هێرا- Hera: خواوەندی ئاسمان و مانگ.

١١- ئاتینە- Azhene: خواوەندی حیکمەت و جەنگ.

١٢- ئافرودیتە- Aphrodite: خواوەندی ڤیان و جوانی.

١٣- ئولیس- Ulysses: (لە ئەفسانانی یونانیدا) شای ئیتاکا، و مێردی پنلوپە و بابی تلماخوس (تلماك)ـە لە رێبەرانی جەنگی تەرواده بووه و بە فێڵ و فەندی جەنگی بەناوبانگ بوو.

١٤- سیکون: تیرەیەکی خەڵکی تراسن کە کاتێ ئودیسیوس لە وڵاتی ئەواندا وەستا، پەلاماریان دا.

١٥- پولوفیموس: یەکێکە لەو دێوانەی کە بەدەستی ئودیسیوس کوێر کرا.

١٦- سیکلوپ: هەندێ دێوی زەلامن کە تەنیا یەك چاویان لە ناوەندی تەوێڵدا هەیە.

١٧- موشەدەمە: بەگوێرەی ئودیسە کاتێ ئودیسیوس دەگاتە دورگەی بایان، خودانی بایەکان بە دیاری مەشکەیەکی پڕ لە (بای) هەمە جۆری دەداتێ. دەست و پێوەندەکەی ئودیسیوس مەشکەکە دەکەنەوە و بایەکان لە شێوەی گەردەلولدا دێنە دەرێ و کەشتییەکە گیرۆدەی لافاوو تۆفان دەبێ.

١٨- سیرسە- Cirse: دەڵە دێو، ژنێکی جادووگەر بووە کە قوربانییەکانی خۆی کردووە بە حەیوانات.

١٩- هێرمیس- Hermes: خواوەندی رێگری و بازرگانی و گوتاربێژی.

٢٠- سیرنەکان- Sirens: سێ پەریی دەریایین بەسەر ژن و بە بەدەن، باڵندەن، کە لە دوورگەیەکی تاوێریی دا دەژیان، ئەمانە بە ئاوازی دڵڕفێنی خۆیان دەریاوانیان بەرەو ئەو دوورگەیە رادەکێشا و لەوێندەر کەشتییەکانیان تێك دەشکا.

٢١- سیکلا- Scylla: تاوێرێکە لە کەناری ئیتالیا کە پێشینان بە دەڵە دێویان دەشوبهاند.

٢٢- کاربیدس- Charybdis: گێژاوێکە لە نزیکی دوورگەی سیسیل کە پێشینان بە دەڵە دێویان دەچوواند.

٢٣- کالیپسو- Calypso: پەرییەکە، و کیژی ئەتلەسە.

٢٤- پوزیدون: لە خواوەندانی دەریایە، و بابی دەڵە دێوانە.

٢٥- خواوەندانی هۆزان و هونەر (موز) نۆ دانە بوون.

٢٦- کالیوپە- Calliope: کالیوپە خواوەندی هۆزانی حەماسی و فەساحەت کە گەورەی هەموو (موز- Muse)ـەکانە.

٢٧- جەنگی بۆق و مشکان: هەر چەندە لەگینە چوار یا پێنج سەدە پاش مەلحەمە و داستانە جدییەکان نووسرابێ، بەڵام لەبەر سێ هۆ لە باسی سەردەمی هۆزانی مەلحەمیدا ئاماژەی بۆ کراوە:

١- مێژووی دانانەکەی نادیارە.

٢- لە رابردوودا درا بووە پاڵ هۆمەر.

٣- نمایشێکی گاڵتە ئامێزی مەلحەمە جدییەکانە.

# سەردەمی هۆزانی لیریکی

## (٧٠٠- ٤٥٠ی پێش ز)

**پێشینەیەکی مێژوویی:**

لە ماوەی نێوان سالآنی ٧٠٠-٥٠٠ی پێش ز. شێوەی ژیانی کۆمەلآیەتی خەلکی یونان گۆڕانی تەواوی بەسەردا دێت. دەسەلآتی حوکمڕانان کەم دەبێتەوە و دەسەلآتی ئەشراف و نەجیمزادەکان زیاد دەکات. گوندەکان جۆرێك لە یەکێتی پەیدا دەکەن و وەکو یەکەی سیاسی سەربەخۆ یا دەولەتی — شاران جێگیر دەبن و رەعیەتەکانیان هەموو مافێکی مەدەنییان دەبێ. ئاتین، ئەسپارتە، کورنت، ئارگوس، و ئیفسوس، ئەمانە هەموو لە دەولەتشارە بەناوبانگەکان بوون. لە سەدەی شەشەمدا دەسەلآتی نەجیمزادەکان بە دەستی تیرانەکان-کە حوکمڕانانی خۆ سەر بوون و حکومەتەکەیان لە هەر یاسایەك بە دوور بوو، و لەلایەن چینە یەکگرتووە نائەشرافییەکانەوە پشتیوانییان لێدەکرا- لە ناوبرا. گەلێك لە تیرانەکان، لەگەڵ هەموو جەور و ستەمێکیاندا، کەسانی پێشکەوتووخواز و هونەر پەروەر و ئەدەب دۆست بوون. لە دوا سالەکانی سەدەی شەشەمدا تیرانەکان سەرکوت دەکرێن، و دەولەتی شاران یا سیستەمی ئولیکاریشی و یا حکوومەتی تەواو دیموکراتی هەلدەبژێرن.

لەم رۆژگار و دەورانەدا، زۆربوونی خەلکی و ئالۆزانی رامیاری، دەبێتە مایەی سەرهەلدان و پەیدا بوونی زۆر موهاجیرنشین. یۆنانییەکان لە زۆربەی دەڤەری دەریای ناڤیندا، بە تایبەتی لە سیسیل و ئیتالیای باشووردا کۆمەلێك موهاجیرنشین دروست دەکەن. بازرگانی و پیشەسازیش رەونەقێکی زۆر پەیدا دەکات.

لەم رۆژگارەدا، بارودۆخی زەمانە لەگەڵ تەمەرکوزی دەسەلآتدا ناگونجێ و ئازادی تاك و تاکپەروەری رەونەق پەیدا دەکات و دەبێ بە خەمی گەورە و مشووری دەخورێ.

## نۆڕینێکی گشتی:

لەواری ئەدەبیاتدا، سەردەمی پاڵەوانی تەقریبەن فەرامۆش دەکرێ و پشتگوێ دەخرێ، ستایشی پاڵەوانان جێگە بۆ دەربڕینی سۆز و گوداز و هەستی شەخسی چۆڵ دەکات. واتە دەربڕینی لایەنە رۆمانسیەکان جێگەی ستایشی پاڵەوانان و سوارچاکی دەگرێتەوە. ئێستا و دیتنی ئێستا جێگە بە رابردوو و دیتنی رابردوو لەق دەکات، لەم سەردەمەدا هۆزانی لیریکی دەبێ بە تاقە فۆرمی ئەدەبی باو. چونکە لەبارترین قاڵبە بۆ دەبڕینی هەست و سۆز و بۆچوونی شاعیران.

# جۆرەکانی شیعری لیریکی

## شیعری شیوەن و لاوانەوە:

هەر چەندە لەوەیە یەکەمین شیوەننامە لە قاڵبی لاوانەوە و تازیەباریدا بووبێ، بەڵام ئەم زاراوەیە لە بنەڕەتدا دەلالەتی لەو شیعرانە نەکردووە کە بۆ یادی مەرگی دۆستێك گوترابن، بەپێچەوانەوە، لەوەیە ناوەڕۆکی جۆراوجۆری وەکو کەرب و کینە، نەفرەت و یا تەنانەت ڤیان و ئەوینداریشی لەخۆ گرتبێ. شیعری لاوانەوە فۆرم و قاڵبی وەزندار و تایبەتی خۆی هەیە، بریتییە لە کۆمەڵە بەیتێك کە بەڕیز یەکێکیان لەسەر کێشی شەش بڕگەیی و ئەوی دیکەیان لەسەر کێشی پێنج بڕگەیی بووە.

## تایبەتمەندییەکانی شیعری شیوەن یا لاوانەوە:

١- بەیتی لاوانەوە پتر روونکردنەوەییە تا داستانی (مەلحەمی) بێ.

٢- بە زۆری کورت و چڕە و بە قالبێکی لەبار بۆ دەربڕینی پەیڤی پەندئامێز و وتەی کورت دەژمێردرێ.

٣- جۆرە رازێکی دەروونە، و لەڕاستیدا قۆناغێکی گواستنەوەیە لە بابەتگەرایی مەلحەمەوە بۆ شیعری زەینگەرایی و دەربڕینی هەست و سۆزی شەخسییە.

٤- بە دەم ژەنینی فلوتەوە یا لێدانی نەیەوە دەخوێنرێتەوە.

# گەورە شاعیرانی واری لاوانەوە

## کالینوس (لە دەوروبەری ساڵی ٦٨٠ی پێش ز ژیاوە):

خەڵکی ئیفسوس-ـە و کۆنترین شاعیری لیریکییە لە واری نیشتیمانپەروەریدا. خەڵکی ئیفسوس بۆ بەرەڤانی دلێرانە لە هەنبەر هێرش و پەلاماری ماکیسییەکان هاندەدا. تەنیا بیست و یەك بەیت لە شیعرەکانی ماوەتەوە.

**میم نیرموس (لە دەوروبەری ساڵی ٦٣٠ی پێش ز ژیاوە):**

خەڵکی کولوفن-ـە بە دامەزرێنەری لاوانەوەی ئەڤینداری دەژمێردرێ. ئەم شاعیرە شین بۆ خەمینی ژیان، ناپایەداری جوانی، و کورتی سەردەمی لاوی دەگێڕێ. شیعرەکانی ڕەنگدانەوەی داروخان و رواڵەتپەرستی یونیاکانە.

**سولون (٦٣٨- ٥٥٩ی پێش ز):**

بە یاسارێژ و شاعیری ئەتینا دەژمێردرێ. سولون شیعری لاوانەوە بۆ پەندو ئامۆژگاری سیاسی و دەربڕینی راوبۆچوونی خۆی دەربارەی ژیان بەکار دێنێ. نزیکەی دوو سەد و پەنجا بەیتێك لە شیعرەکانی ماوەتەوە.

## ئیبامبیك

ئیبامبیك جۆرە شیعرێکی لیریکییە و دەدرێتە پاڵ ئیبامبوس، ئەمە جۆرە شیعرێکە کە کێشەکەی لە بڕگەکاریدا لە بڕگەیەکی کورت و لە بڕگەیەکی درێژ پێك دێت. ئەو شیعرانەی کە لەسەر وەزن و کێشی ئیبامبوس دانراون بە زۆری لە هەجوو داشۆریندا بەکار هاتوون.

دیارترین شاعیری ئیبامبیك ئارکیلوخوسە (لە دەوروبەری ساڵی ٦٥٠ی پێش ز ژیاوە)، ئەم شاعیرە خەڵکی پاروسە کە بە داهێنەری شیعری ئیبامب دەژمێردرێ. تەبیعەتێکی ئاگرین و توندوتیژی هەبووە، زۆربەی شیعرەکانی لێوان لێوی نەفرەت و رق و کەرب و کینن. لێ روون و ناسك و کورت و زیندوون. ئەم شاعیرە شیعری لاوانەوەشی گوتووە، بە تایبەتی لە قاڵبی شیندا.

## میلیك

شیعری میلیك بە دەم لێدانی چەنگ و سێتار و تەمورەوە دەخوێنرایەوە. ئەم جۆرە شیعرە لەسەر کێش و وەزنی هەمە جۆر دانراوە و بابەتی هەمەڕەنگی لەخۆ گرتووە. گرنگترین جۆری شیعری لیریکی میلیك مۆنۆدی و کۆراڵە.

١- **مۆنۆدی (تاك بێژ)**

بەو شیعرە غەمناکە دەگوترێ کە یەك کەس بە ئاوازەوە دەیڵێ، گەورەترین شاعیرانی شیعری لیریکی بە شێوەی مۆنۆدی بریتین لە:

**ئالیکوس (لە دەوروبەری ٦١٢ی پێش ز ژیاوە):**

خەڵکی لسبوسبە، نەجیمزادەیەکی کۆنەپەرستی دوژمنی سەرسەختی دیموکراسی بووە. ئەم شاعیرە لە ئاراوگەدا کۆمەڵێك قەسیدەی (بە زمانی ئایولیاتی) بۆ چارەڕەشی خۆی نووسیوە.

ئالیکوس دە کتێبی شیعری لیریکی دەربارەی جەنگ، سیاسەت، غەمانی دەروونی، ڤیان و شەراب هەیە.

**ساپفو (سافو) (لە دەوروبەری ساڵی ٦٠٠ی پێش ز ژیاوە):**

هەر چەندە تەم ومژێکی زۆر سایەی خستۆتە سەر ژیانی سافۆ و زانیارییەکی وردمان لەمەڕ ژیانی واقیعی ئەو لەبەردەستدا نییە. بەڵام ئەم شاعیرە لە بنەماڵەیەکی زۆر دەوڵەمەندە و لە موتیلنەی دوڕگەکانی لسبوس لە دایك بووە و زۆربەی تەمەنی لەوێندەر قەتاندووە. تاقمێك لە خوشکان هەمیشە لەلای ئەو خڕدەبوونەوە و ئەمیش (شاعیرێکی ئافرەت بووە) مۆسیقا و ئاواز و داب و نەریت و ڕێورەسمی پەیوەندی کۆمەڵایەتی فێر دەکردن. لەڕاستیدا کیژان لەناو ئەم گرووپەدا فێری ڕێ و ڕەسمی ژیان دەبوون. بە گوێرەی حیکایەت و ریوایەتە جۆراوجۆرەکان وا دەردەکەوێ کە سافۆ شوی کردووە و یەك کیژی هەبووە، هەروەها بە گوێرەی ریوایەتێکی دیکە ئەم شاعیرە بۆ سیسیل دوور خراوەتەوە و ماوەیەکی لە تاراوگەدا بەسەر بردووە. ئەنجام ئاشقی فائوونی شوان دەبێ، بەڵام فائون ڕووی ناداتێ و ئەم شاعیرە ژنە لە لوتکەی لوکادەوە خۆی هەڵدەدێرێ و خۆی دەکوژێت.

بەڕای خەڵکانێکی زۆر سافو گەورەترین شاعیری هۆزانی لیریکی، لە جۆری مۆنودییە و جماعەتێکیش بە گەورەترین شاعیری هەموو سەردەمەکانی دەزانن، و ئەفلاتوون بە دەیەمین خواوەندی شیعری دەزانێ. سافۆ سوودی لە پانزە کێشی جۆراوجۆر وەرگرتووەو ئەمەش بەڵگەی ئەوەیە کە لە واری کێشی شیعریدا وەستا و زاڵ بووە. جوانی هەڵبژاردنی وشە کە یەکێکە لە پێداویستییەکانی شیعری لیریکی، ڕەوانی و دڵگیرییەکی تایبەتی بە شیعرەکانی بەخشیوە، بەڵام ئەم ڕەوانیی و دڵگیرییە بە زۆری لە کاتی وەرگێڕان لە بەین دەچێت، ژمارەیەك لە ڕەخنەگران پێیان وایە کە (لە نێو هەموو شاعیرانی جیهاندا، لە نێو گشت ئەدەبیاتی بەرجەستەدا، سافۆ تاقە شاعیرێکە کە هەر پەیڤێکی شیعرەکانی بۆنێکی سەیر و تایبەت بە خۆی هەیە، پەیڤی سافۆ نیشانەی کەماڵی موتڵەقی ناسکی بێ وێنەیە).

جۆش و خرۆشی ئایولیایی ئەو ئاوێتەی شیعرەکانی بووە. زۆربەی غەزەلەکانی شەخسی و هەڵقوڵاوی کانگای دڵ و کەشفی ڕازی دەروونن. ڤیان ناوەڕۆکی هەرە زاڵی زۆربەی هەرە زۆری شیعرەکانیەتی، ئەو شیعرانەی کە زیاتر کچۆڵان دەدوێنن. مەخابن، زۆربەی شیعری سافۆ لە نێو چوون و تەنیا یەك لەسەر بیستی شیعرەکانی ماونەتەوە، کە بریتییە لە غەزەلێکی تەواو و چەند پارچە غەزەلێکی دیکە و هەمووشی بە شێوەزاری ئایولیاییە. ئەو شیعرە تەواوەی کە لە

پاش سافۆ بەجێ ماوە قەسیدەیەکە روو لە ئافرودێتە کە لە شیعرەکەدا خوازیاری سەرکەوتنی کیژێکی لاوە لە ڤیان و ئەڤینداریدا. شیعرەکانی دیکەی بریتیین لە گۆرانی موبارەك بێ زەماوەند، مالاوایی لە دۆستان، ستایشی جوانی کیژان، و چەند غەزەلێکی ئاشقانە.

سافۆ، کارێکی زۆری کردۆتە سەر شاعیران و نووسەران، لەوانە: تیوکریتوس، کالیماکوس، کاتولوس، هوراس، گریل پارتسر، رونسار، مالرب، بوالو، راسین، دوستال، شاتوبریان، لامارتین، بودلیر، سیدنی، لیلی، هیریك، براونینگ، تنی سن، سوین برن، فرنو، ئالن پۆ و .... هتد.

**ئاناکریون (لە دەوروبەری سالی ٥٤٠ی پێش ز ژیاوە):**

خەلکی تیوس و شاعیری دەرباری پولوکراتس"١" بووە، پاشان لە ئەسینادا چووەتە لای هیپارخوس"٢". یەکێکە لە داهێنەرانی شیعری کۆمەلایەتی. شیعرەکانی خەیال ئەنگێز و دلگیر و خۆش ریتم و ئاهەنگ بووە. شەراب، ڤیان، ناپایەداری ژیان و جوانی و نەفرەت و بێزاری لە جەنگ، ناوەڕۆکی سەرەکی شیعرەکانی پێك دەهێنن. هەر ەندە هەندێ کەس پێیان وایە شیعرەکانی دوورن لە قولی و ناسکی، بەلام وێرای ئەوەش یەکێکە لە سێ شاعیری گەورەی واری هۆزانی لیریکی کۆنی یۆنان (دووانەکەی دی سافو و پیندار-ن).

**٢- کۆرال:**

رەنگە غەزەلی کۆرال یەکەمجار لە ئەسپارەتە و لەسەر دەستی ئالیتاس (لە دەوروبەری ٦٧٥ی پێش ز ژیاوە) دامەزرا بێ، تالیتاس هەندێ شیعری گۆرانی بۆ کۆرسی کۆرالەکان دادەنا تا پێکەوە بەدەم سەماوە لە فیستیڤالەکاندا بیلێن. غەزەلی کۆرال بریتییە لە سێ بەند. بەندی یەکەم بە وەرسورانی کۆرسی کۆرالە کە بۆ لایەك دەگوترێ، بەندی دووەم لەگەل وەرچەرخانەوە بۆ دواوە دەگوترێ، بەندی سێیەم کە لەڕووی بونیادەوە لە بەندی یەکەم و دووەم جیاوازە لەلایەن هەموو کۆرسەکەوە دەگوترێ.

شیعری لیریکی کۆرال، جۆری هەیە -گۆرانی شاباشی زەماوەند، سەرکەوتن نامە، تازیەنامە، سروودی پاڕانەوە لەبەر دیونوسوس"٣" واتە گۆرانی (دیتورامب)"٤" بەناوبانگترین شاعیرانی شیعری لیریکی کۆرال بریتیین لە: ئالکمان"٥"، ئاریون"٦"، سیمونیدس"٧" و پیندار.

**پیندار: (٥٢٢- ٤٤٣ی پێش ز):**

زۆربەی خەلکی بە گەورەترین شاعیری لیریکی یونانی دەزانن. پندار لە نزیکی تب لە مالباتێکی زۆر دەولەمەند و دارا هاتۆتە دنیاوە. زانیارییەکی کەم لەمەڕ ژیانی ئەو لەبەر دەستدایە، رەنگە کاهینی پەرستگەی ئاپولون بووبێ. پندار هەر لە گەنجییەوە رووی کردۆتە

# پەراوێز:

١- پولوکراتس (٥٢٢ی پێش ز) حوکمرانێکی دیکتاتۆری یونانی بووە لە یەکێك لە دورگەکانی دەریای ئیجە.

٢- هیپارخوس: حوکمرانێکی دیکتاتۆری ئاتین بووە لە ساڵانی ٥٢٧- ٥١٤ی پێش ز.

٣- دیونوسوس (بە گوێرەی ئەفسانانی یونان) خوای شەرابە. لە رومدا (باکوس)ی پێ دەگوترێ.

٤- دیترامب: گۆرانییەکی دەستەجەمییە کە یونانییەکان لە جەژنەکانی خوای شەرابدا بە کۆمەڵ و کۆرس گوتوویانە.

٥- ئالکمان (لە سەدەی هەفتەمی پێش ز ژیاوە) خەڵکی ئەسپارتەیە.

٦- ئاریون (لە ساڵی ٦٠٠ی پێش ز ژیاوە) خەڵکی کورنت ـە.

٧- سیمونیدس (٥٥٦- ٤٦٧ی پێش ز) خەڵکی کیاس- ـە.

# سەردەمی ئاتیک"١"

**پێشینەیەکی مێژوویی:**

سەدەکانی پێنجەم و چوارەمی پێش ز لە باری سیاسی، شارستانی و رۆشنبیری، هونەری و ئەدەبییەوە بە رۆژگار و دەورانی شکۆداری یۆنان دەژمێردرێ. ئاتین"١" تا ساڵی ٤٠٤ی پێش ز کە لەلایەن ئەسپارتەوە شکێنرا، بە مەڵبەندی شارستانی دەژمێردرا. ریفۆرمەکانی کلیس تینس"٢" لە ساڵی ٥٠٨ی پێش ز، یەکەمین حکوومەتی دیموکراتی واقیعی مێژووی جیهانی لە ئاتینادا هێنایە ئاراوە. هەموو هاووڵاتییەك مافی سیاسی تەواوی خۆی هەبوو، بەڵام ئەمانە تەنیا لە سەدا بیستی هەموو خەڵکەکەیان پێك دێنا، چونکە کۆیلەکان، بێگانان، و ژنان لەم مافانە بێبەش بوون. لەساڵێ ٤٩٠ی پێش ز، ئێرانییان پەلاماری یونانیانــدا، بەڵام سێ جار شکستیان هێنا: لەساڵێ ٤٩٠ دا بە دەستی سوپاییانی ئاتین و بە فەرماندەیی میلتیادوس لە مارتون شکان، لە ساڵی ٤٨٠ بە دەستی هێزی دەریایی ئاتین لە سالامیس شکان و ئەنجام لە ساڵی ٤٧٩ لە پلاتیە بە دەستی هێزی یەکگرتووی یونانی شکان، لە ساڵی ٤٧٧ ژمارەیەك لە دەوڵەت- شارانی رۆژهەڵاتی، یەکێتیی لوسی-یان پێك هێنا کە کۆنفدراسیونێك بوو بۆ بەرەنگار بوونەوەی هێرش و پەلاماری ئێرانییەکان، ئاتینییەکان رێبەرایەتی ئەو یەکێتییەیان لە ئەستۆ گرت و لە ساڵی ٤٥٤ی پێش ز، خەزینەی یەکێتییەکە لە دورگەی دیلوس-ەوە بۆ ئاتین گوازرایەوە.

ئیدی باقی ئەندامانی یەکێتییەکە خۆیبوونی خۆیان لە دەست دا و ناچار بوون باج و خەراج بە ئاتینییەکان بدەن و ئەمە سەرەتا و دەستپێکی ئیمپراتۆرییەتی ئاتین بوو.

قۆناغی نێوان ساڵانی ٤٦١- ٤٢٩ی پێش ز، بە سەردەمی پریکلس"٣" ناسراوە. لەم سەر و بەندەدا پریکلس بوو بە فەرماندەی گشتی و رێبەری خەڵك، واتە بوو بە حوکمڕانی غەیرە

ڕەسمی ئاتین. ئەم ساڵانە لەڕووی پێشکەوتن و ئیحتویاری فەرهەنگی و شارستانییەوە بێ وێنەیە. هەموو هاوولاتییان مافی خوێندن، نووسین، حیساب، ئەدەبیات، موسیقا و گەمەێن وەرزشییان هەبوو.

لە ساڵی ٤٣١ی پێش ز، ململانێی دەسەلات و دەسەلاتداری لە نێوان ئاتین و ئەسپارتەدا جەنگی پلوپونزوس-ی لێکەوتەوە. پاش دە ساڵ لە جەنگی بێوەر، جەنگاوەران لە ساڵی ٤٢١ی پێش ز، دەستبەرداری شەڕ بوون و (ئاشتی نیسیاس)[٤] یان ڕاگەیاند. بەڵام ماوەی سولحەکە کەم بوو. ئاتین لە ساڵی ٤١٥- ٤١٣ی پێش ز بە مەبەستی گرتنی سیسیل گەمارۆی سیراکوز-ی دا. ئەم گەمارۆیە شکستی هێنا و عەماری ئازوقەی ئاتینییەکان کەوتە دەستی دوژمن، بارودۆخی نالەبار و پڕ قەیرانی ئاتین کارێکی وایکرد ئەسپارتە سەرلە نوێ پەلاماری ئاتین بداتەوە و سەرەنجام بەسەریدا سەر بکەوێ. ئەوە بوو ئاتین لە ساڵی ٤٠٤ی پێش ز بە ناچاری تەسلیم بوو.

ساڵانی نێوان ٤٠٤- ٣٥٩ی پێش ز، قۆناغی ڕکابەری نێوخۆ و جەنگی چینایەتی و... بوو.

ئەسپارتە تا ساڵی ٣٧١ی پێش ز، کە لەبەرەی لوکترا دا لە لایەن تب-ەوە شکا، دەسەلاتی هەرە زاڵ بوو. تب تا ساڵی ٣٦٢ی پێش ز ڕۆڵی ڕابەرایەتی لە ئەستۆ بوو. لەم ساڵەدا ئاپامینونداس-ی ڕێبەری تبی لە شەڕێکدا دژی ئاتین و ئەسپارتە، لە مانتینەدا مرد و ئیدی ئاژاوە و پاشاگەردانی دەستی پێکرد، فیلیپی مەقدونی لە ساڵی ٣٥٤ی پێش ز دا دەستی بە فەتحی یونان کرد و لە ساڵی ٣٣٨ی پێش ز دا لە شەڕی خارونادا بە تەواوەتی سەرکەوت.

فیلیپ دوای دوو ساڵ مرد و ئەسکەندەری گەورەی کوڕی بوو بە جێنیشینی. ئەسکەندەر تا ساڵی ٣٣١ ی پێش ز بە سەر سەرانسەری جیهانی ناسراوی ئەو ڕۆژگارەدا، واتە: یۆنان، میسر، سەرانسەری ئاسیای بچووک، ئێران، و ئاسیای ناوەندی و تا دەڤەری ڕووباری سن، زاڵ بوو و سەرکەوت. ئەسکەندەر لە ساڵی ٣٢٣ی پێش ز مرد و سەردەمی ئاتیك کۆتایی هات.

**نۆڕینێکی گشتی:**

سەردەمی ئاتیك بە دەورانی بەرجەستەترین نووسەرانی ئاتین دەژمێردرێ: هیرودوتوس (هیرودوت)، توسیدیدس و گەزنەفۆن لە مێژوودا، ئایسخولوس (ئیشیل)، سوفوکلس، یورپیدس، ئاریستوفانس و مناندر لە شانۆنامە نووسیدا، دموستن لە خیتابەدا، و ئەفلاتوون و ئەرەستۆ لە فەلسەفەدا شۆرەت و ناوبانگی عالەمگیریان هەیە.

## مێژوو

یونانیانی سەدەی پێنجەمی پێش ز مێژوویان بەلقێکی تایبەت لە زانست دەزانی. مێژوونووسانی یونانی کۆن، وێڕای کۆمەڵێك لە فەرامۆشکاری و گوێنەدان، یەکەمین کەسانێکن کە دەستیان بە نووسینەوەی رووداوە نیشتیمانی و جیهانییەکان بە شێوەیەکی سیستماتیك و بە بەڵگەوە و بە گوێرەی ریزبەندی مێژوویی کردووە.

**هیرودوتوس (هیرودوت): (لە دەوروبەری ساڵانی ٤٨٤- ٤٢٥ی پێش ز ژیاوە):**

هیرودوت کە بە (باوکی مێژوو) ناسراوە لە هالیکارناس-ی ناوچەی باشووری ئاسیای بچووك لە دایك بووە. لە دەوروبەری ساڵی ٤٥٥ لە شەڕی پارسەکاندا بەشداری کردووە و پاشان بە هۆی ئاژاوە و پاشاگەردانی سیاسییەوە ناچار وڵاتی بەجێهێشتووە. ماوەی دە ساڵێك لە زۆربەی وڵاتانی ناسراوی جیهانی ئەو رۆژگارەدا ئاوارە و سەرگەردان بووە —لە باکوورەوە تا دەریای رەش، لە باشوورەوە تا میسر، و لە رۆژهەڵاتەوە تا بابل گەڕاوە. هیرودوت لە دامەزراندنی تۆڕی موهاجیرنشینی ئاتینی باشووری ئیتاڵیادا بەشداری کردووە و تا مردن، واتە دەوروبەری ساڵی ٤٢٨- ٤٢٥ ی پێش ز، لەوێندەر ژیاوە.

**بەرهەمەکانی:**

مێژوو: زانایانی ئەسکەندەریە مێژووەکەی هیرودوت-یان بەسەر نۆ کتێب دا دابەش کردووە.

هەر کتێبێکیان بە ناوی یەکێك لە خواوەندەکانی شیعرەوە ناونراوە. ئەم کتێبە، وێڕای جیاوازی بابەتەکانی، هەر هەمووی لەڕووی ناوەڕۆکەوە گێڕانەوەیەکی رووداوەکانی جیهانە تا دەگاتە شکستی پارسەکان لەلایەن یونانییەکانەوە. کتێبی یەکەم حیکایەتی دوژمنایەتی نێوان یونانییەکان و بەربەرەکان دەگێڕێتەوە کە جەنگی تەروادەی لێدەکەوێتەوە، هەروەها فتوحاتی کرزوس-ی پاشای لیدی، و دامەزراندنی ئیمپراتۆری پارس، تا زاڵ بوونی کەمبوجیە بەسەر میسردا لەخۆ دەگرێ.

کتێبی دووەم گوتارێکی دوور و درێژە دەربارەی میسر. کتێبی سێیەم دەسەڵاتی کەمبوجیە بەسەر میسر و راپەڕینی داریوش دەگێڕێتەوە. کتێبی چوارەم باسی لەشکرکێشی داریوش بۆ سەر وڵاتی سکاکان و زاڵبوون بەسەر لیبیادا دەکات. کتێبی پێنجەم باسی شۆڕشی یونییەکان دژی پارسییەکان دەکات. کتێبی شەشەم بەسەرهاتی جەنگ تا سەرکەوتنی یۆنانییەکان لە ماراتوندا شەرح و شرۆڤە دەکات. کتێبی حەوتەم تا نۆیەم تەرخان کراوە بۆ گێڕانەوەی مەرگی داریوش، تەدارەکی لەشکرێکی بەهێز لە لایەن خەشایارشاوە، شەڕی ترموپیل و سالامیس و

شکستی یەکجارەکی پارسییەکان کە هاوزەمان لە پلاتە لە رۆژئاواوە و لە میکال لە رۆژهەلاتەوە دەست پێدەکات.

**فەلسەفەی مێژوو:**

هیرودوت بەپێچەوانەی توسیدیدس-ەوە ئاشنایەتی و شارەزاییەکی ئەوتۆی لە فەلسەفەی مێژوودا نییە، بەلام هەمیشە هەولدەدا دەخالەتی خودایان لەکاروباری ئادەمیان نیشان بدات. بەرای ئەو خواوەندان لە سەرکێشی و خۆپەسندی و لوتبەرزی دەسەلاتدارانی (وەکو پارسییەکان) رازی نین و هەر لە لوتیان دەدەن و زەلیلیان دەکەن.

**شێوەو شێوازی نووسین:**

هیرودوت، کەسێکی رەواننووسە و بە زۆری لە شێوەی گفتوگۆدا دەنووسێت و یەکێك لە خەسلەتە دیارەکانی ئەو بەکارهێنانی دۆزێن ناکۆك و بایەخدانە بە کاریگەری قولی شتەکان.

شێوازی ئەو زیاتر حەماسی و مەلحەمەییە تا غایشی، بایەخی زۆر بە چەمکە گشتی و جیهانییەکان دەدات، بەلام حەز لە پاژ (جزئیات)ش دەکات، ئەو پاژانەی کە وێنەی وردی خەلکی و داب و نەریتی ئەو خەلکە نیشان دەدات. مێژووەکەی ئەو لەم رووەوە خۆی لە ناوەرۆکی سەرەکی و فراوان دوورەپەرێز دەگرێ، هیرودوت کەسێکی رۆمانتیکی بەرزە خەیالە. زیاتر حەزی لە گێرانەوەی سەربهوردی مرۆڤانە تا قوولبوونەوە و وردکردنەوەی هەوالان و لە بنج و بناوان کردنی هۆ و ئەنجامی هەوال و رووداوان.

**کورتەیەکی رەخنەکان:**

هەرچەند گلەیی درشت بینی و ناکۆکوێژی (بە تایبەتی دەربارەی سالەکان) لە هیرودوت دەکرێ، بەلام هیچ کاتێك بە ئانقەست هەولی نەداوە خوێنەر گومڕا و چەواشە بکات، هیرودوت زۆربەی کات کەسێکی سادە و خۆشباوەڕ بووە، و پشتی بەسەرچاوەی بێ ئیحتیوار بەستووە. بەلام هەر کاتێ بەلگەنامەیەك جێی باوەڕ و متمانە نەبێ، ئاگادارمان دەکاتەوە، کە ئەمە هەوالێکی زارەکییە، یا ئەفسانەییە یا گێڕانەوەیەکی لایەنگرانەیە. زانیارییەکانی هیرودوت دەربارەی شەڕ و جەنگان زانیاری دەستی یەك نین، بۆیە بە توێژەرێکی سوپایی شایستە ناژمێردرێ. بە هەر حال هیرودوت وەکو مێژوونووسێکی بێ لایەن ستایش دەکرێ، وەکو چۆن ستایشی بوێری و جەنگاوەری پارسەکان دەکات، ستایشی یونانییەکانیش دەکات. رەنگە زۆرجار لە خەت دەربچێ و پەراوێز رەوییەکی زۆر بکات و زنجیرەی بابەت و مەبەستەکانی بپچڕێ، بەلام هەر ئەم خەسلەتی لە خەت دەرچوون و بە تان و پۆدا چوونەش خۆی لە خۆیدا یەکێکە لە نیشانەکانی داستان بێژی هیرودۆت.

## توسیدیدس (توسیدید) (لە دەوروبەری ٤٧٠- ٣٩٨ی پێش ز):

توسیدیدس یەکەمین مێژوونووسی رەخنەگری جیهانە... لە ئاتین و لە بنەماڵەیەکی دەوڵەمەند و دەسترۆ لە دایك بووە، بە یەکێك لە نزیکانی میلیتادس دەژمێردرا.

لە گەنجیدا کەوتە موتاڵا و خوێندنەوەی بەرهەمەکانی هیرودوت و هەمیشە ستایشی دەکرد، لە کاتی هەڵگیرسانی شەڕی پلوپونزوسدا یەکێك بووە لە دە فەرماندەی ئاتینی. لە ساڵی ٤٢٤ی پێش ز، ئەو گەلە کەشتییەی کە ئەو فەرماندەیی دەکرد لە شەڕی بەرگری لە ئامفی پولیسدا شکا و ئەم موهاجیرنشینە یونانییە کەوتە ژێر دەستی ئەسپارتە. توسیدیدس دادگایی کرا و دوور خرایەوە. تا ساڵی ٤٠٤ی پێش ز کە شەڕەکە کۆتایی هات هەر لە تاراوگە بوو و لەم ساڵەدا رێگەی پێدرا بۆ ئاتین بگەڕێتەوە.

بەجۆرە دەرفەتی ئەوەی بۆ رەخسا کە لە نزیکەوە جەنگ بخاتە بەرباس و لێکۆڵینەوە و خوێندنەوە.

### بەرهەمەکانی:

### مێژووی جەنگی پلوپونزوس:

ئەمە بریتییە لە هەشت کتێب. کتێبی یەکەم مێژووی پەنجا ساڵی یونانی لەخۆگرتووە، وێڕای ئەو بایەخە تایبەتییە کە بەسێ ساڵی بەرلە دەستپێکی جەنگی پلوپونزوس-ی دەدات، لە هۆیە سەرەکییەکانی ئەم جەنگەش دەکۆڵێتەوە. لە کتێبی دووەمەوە تا کتێبی پێنجەم بریتییە لە یەکەمین دە ساڵەی جەنگی بێ ئاکام، سوڵحی نیسیاس، تازە بوونەوەی دوژمنایەتی و شکستی ملوس Melos (٤١٦ی پێش ز).

کتێبی شەشەم و حەوتەم لەشکرکێشی موسیبەتباری خەڵکی سیسیل دەگێڕێتەوە. کتێبی هەشتەم (ناتەواوە) پاشاگەردانی ناوخۆ و هەرا و ئاژاوەی ئاتین (٤١٣- ٤١١ ی پێش ز) کە دوا بە دوای لەشکرکێشییەکەی سیسیل روو دەدات، شەرح و شرۆڤە دەکات.

### فەلسەفەی مێژوو:

توسیدیدس-یان بە (یەکەمین فەیلەسووفی مێژوو) ناو ناوە. ئەم مێژوونووسە تیۆرییەکانی هیرودوت رۆنراو لەسەر خواپەرستی رەت دەکاتەوە و تیۆری مەتریالیستی پەسند دەکات. ئەو باوەڕی بە دەخالەتی خودایان لە دیاردە و رووداواندا نییە، بەڵکو پێی وایە هەموو رووداوێك بەندە بە خووە مرۆڤایەتییەکانی وەکو خۆپەسەندی، لاوازی ئەخلاقی، و کەڵکەڵەی دەسەڵاتخوازییەوە. تەبیعەت و خووی مرۆڤانیش هیچ کاتێك ناگۆڕێ. تەنیا مێژوو دووبارە

دەبێتەوە. بە هەر حاڵ، میژووەکەی توسیدیدس سەرمایەیەکی هەمیشەیی و رێنوێنێکی بەکەڵکە بۆ پێشهاتەکانی ئاینده.

**شێواز و مامەڵە:**

ئاشکرایە هەمووان ستایشی توسیدیدس دەکەن، بەڵام کەم کەس لەزەت لە خوێندنەوەی بەرهەمەکانی دەبینێ. پەیڤی ئەو سارد، دەستکرد، وشك و بە تەمتومانە و رەوانی و تۆنی گوتاری هیرودۆتی نییە. راستەوخۆ لە ژێر کاریگەری مامۆستایانی زانستە بەلاغی و سۆفستاییەکاندایە. توسیدیدس، لە چاو هیرودوتدا رووداونووسێکی هوشیارترە و کەمتریش لە بابەتەکەی دەردەچێ.

ئەو بە وردی و تاڕادەیەك بە تەوس و توانجەوە ئەو ئەفسانە، حیکایەت و وتانە رەت دەکاتەوە کە نووسینەکانی هیرودوت-یان دلگیر و شیرین کردووە، بەڵام لە هەمان کاتدا بێ ئیحتویاریان کردووە. توسیدیدس مامەڵەیەکی رەخنەگرانە دەگەڵ سەرچاوەکانی بەرهەمەکانی خۆیدا دەکات.

**کورتەیەکی رەخنەکان:**

زۆربەی خەلکی ئیرادی ئەوە لە توسیدیدس دەگرن کە نووسینەکانی قورس و دژوارن. لەڕادەبەدەر وشك و پابەندی نووسینی رووداوانە و نووسینەکانی شیرین و دلگیر نین، ئێوەڕۆکی میژووەکەی ئەو سنووردارە و بایەخ بە جوانناسی یان بزاڤە کۆمەلایەتییەکان نادات. بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا بەرهەمێن توسیدیدس زۆر لایەنی پۆزەتیڤی تێدایە، و بە پێچەوانەی هیرودوت-ەوە میژوونووسێکی ورد و ئەمینە. لە هەڵبژاردنی سەرچاواندا راراو دوودڵە، و لەڕووی تۆمار کردنی رووداوانەوە جێگەی متمانە و باوەڕە. توسیدیدس کە بە خۆی بەشداری شەڕی دەکرد، زۆر بە وردی رووداوە سوپاییەکان دەخاتە بەر وردەبینی شیکردنەوە و هەڵسەنگاندنەوە. ئەمە جگە لەوەی کە یەکەمین میژوونووسە کە لە گۆشەنیگایەکی زانستی و رەخنەییەوە رووداوە میژووییەکانی شەرح و شرۆڤە کردووە، توسیدیدس یەجگار هۆشیار و وریایە، و لە شیکردنەوەی هاندەرە مرۆڤانیەکاندا بێ لایەنە. وێڕای ئەوەی کە ئاتین بابەتی سەرەکی میژووەکەی ئەوە، کە چی لەگەڵ ئەوەشدا توسیدیدس هیچ جۆرە لایەنگرییەك لە ئاتین یان ئەسپارتە ناکات.

## گیزنۆفۆن (٤٣٤- ٣٥٥ی پێش ز):

خەڵکی ئاتین، مێژوونووس و نووسەر، سەرداری جەنگی و، هاونشینی سوکرات بوو. گیزنوفون لە سایەی فەرماندەیی کورشی بچووکی شازادەی پارسدا، بە هاوڕێیەتی دەهەزار سەربازی بەکرێگیراوی یونانی، لە شەڕی ئەردەشیری دووەمی هەخامەنشیدا (٤٠١- ٣٩٩ی پێش ز) بەشداری کردووە. پاشان لە ئەسپارتە ئاکنجی بوو و لە جەنگی کورونیادا"[٥]-٣٩٤ی پێش ز) دژی ئاتین بەشداری کرد. لەبەر ئەمە لە ئاتین دوور خرایەوە و تاساڵی ٣٧١ی پێش ز لە ئولمپیادا ژیا، پاشان چوو بۆ کورنت و تا مردن لە وێندەر ژیا.

**بەرهەمەکانی:**

**(دیالۆگەکان)**

بەرهەمێن گیزنۆفۆن دەربارەی سوکرات بریتییە لە چوار کتێبان لە شێوەی دیالۆگدا: بەرەڤانی لە سوکرات، زیافەت، بیرەوەرییان، و پەیامی ئابووری یان ئابوورینامە. بۆچوون و تێورییەکانی گیزنوفۆن دەربارەی سوکرات سەرڤە سەرڤەیە. راستە ستایشی سوکرات دەکات، بەڵام توانای تێگەیشتنی وردەکارییەکانی فەلسەفەی سوکراتی نییە، گیزنوفون شەیدای فەلسەفەی پراکتیکییە و پەیوەندییەکی ئەوتۆی بە هزرێن تێورییەوە نییە.

**بەرهەمە مێژووییەکانی:**

**هیلنیکا:**

درێژەی مێژووەکەی توسیدیدس-ە و مێژووی رووداوەکانی یۆنان لە ساڵی ٤١١ەوە تا ساڵی ٣٦٢ دەگێڕێتەوە. هیلنیکا وەکو کتێب سەرچاوەیەکی زیندووە، بەڵام زۆر زەحمەتە بتوانرێ بە هاوتا و هاوسەنگی مێژووە رەسەنەکەی توسیدیدس دابنرێ. گیزنوفۆن بە بێدەنگی بەسەر رووداوە سەرەکییەکانی مێژووی ئاتیندا تێدەپەڕێ و لایەنگرانە دەکەوێتە ستایشی ئەسپارتە.

**ئاناباز (گەڕانەوەی دەهەزار نەفەری):**

ئەمە چیرۆکی "بەناوبانگ ترین پاشەکشەی مێژووی سەربازییە". گیزنوفۆن لەم کتێبەدا باسی لەشکرکێشی ناکامی دە هەزار سەربازی بەکرێ گیراوی یۆنانی دەکات کە لە ساڵی ٤٠١ی پێش ز پێشڕەوی دەکات تا یارمەتی کورشی بچووکی شازادەی هەخامەنشی بدات کە دەسەڵات لە چنگی ئەردەشیری دووەمی برای دەربێنێ. ئاناباز چیرۆکی ئەم قۆشەن کێشییە لە ساردەوە و لە رێگەی ئاسیای بچووك و بیابانی عەرەبستانەوە بۆ کوناکسا دەگێڕێتەوە. لەم شوێنەدا کورشی بچووك دەکوژرێ. لەشکری دە هەزار نەفەری دەشکێت و دووچاری پەشێوی

و پاشاگەردانی و پەراگەندەیی دەبێت. یۆنانییەکان بە ناچاری گیزنوفون بە فەرمانـدەیی هەڵدەبژێرن و لە رێگەی کوردستان و ئەرمەنستانەوە بەرەو سەنتی باکوور پاشەکشێ دەکەن تا دەگەنە کەناری دەریای رەش. لەوێندەرەوە بۆ کالسدون و بیزانس دەڕۆن و دەچنە ژێر رکێفی سیوتس-ی شای تراکیە.

سەرەنجام، نزیکەی شەش هەزار کەسیان دەمێننەوە لە ساڵی ٣٩٩ی پێش ز، لە ئاسیادا دەچنە ژێر رکێفی ئەسپارتە. گیزنوفون-یش بۆ ئاتین دەگەڕێتەوە.

**پەروەردەی کورش (کوروپدیا):**

ئەم بەرهەمە بریتییە لە هەشت کتێبان. وێڕای ئەوەی کە درێژ و تاقەتبەرە، بەڵام لە باری میژووییەوە لەبەر سێ هۆ بایەخی خۆی هەیە:

١- یەکێکە لە کۆنترین پەیامان لەواری یاسا و رێسای تیۆری پەروەردە و فێرکردنەوە کە لەوێدا بۆچوونەکانی کیزنوفون سەبارەت بە پەروەردەی سیاسی و سوپایی پێویست بۆ شازادەیەکی لاو هاتۆتە دەربڕین. گیزنوفۆن ئەوە دەگێڕێتەوە کە چۆن کۆرشی گەورەی شای ئێران (حوکمڕانی ٥٥٠- ٥٢٩ی پێش ز) رێورەسمی راو، سەربازی و وڵاتداری، فەرمانـدەیی، جوامێری و پاشایی فێر دەبێت. بەشێك لەم نامەیە میژوو دەگێڕێتەوە و بەشەکەی تری ئەفسانە، بەڵام فەسڵ و بەشە گرینگەکانی ئەم کتێبە تەرخانن بۆ دەربڕینی بۆچوونەکانی گیزنوفۆن خۆی، ئەو پێی وایە لە پەروەردەی حوکمڕانانی نموونەییدا ئاوێتەیەك لە شێوەی پەروەردە و ئەخلاقی پارس و ئەسپارتە پێویستە.

٢- ئەم نامەیە یەکێکە لە کۆنترین سەرچاوەکانی بواری کۆمەڵگەی یوتوبیایی. کورش وڵاتێکی خەیاڵی دادەمەزرێنێ کە تەنیا یەك شاری هەیە. گیزنوفۆن ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە خەڵکی ئەم یوتوبیایە هەموو خزمەتێکی خۆشگوزەرانییان لەواری زەوجین و ساغڵەمی گشتیدا بۆ فەراهەم کراوە.

٣- هەندێ بەشی ئەم کتێبە شێوەی جۆرە رۆمانێکی میژوویی لەخۆ گرتووە. ژیانی کورش بە شێوەیەکی مەیلەو ئەفسانەیی دەگێڕدرێتەوەو سەربهوردی ئابراداتاس[٦] و پانتیای هاوسەریشی تەقریبەن چیرۆکێکی ریسکی میژووییە.

**فەلسەفەی میژوو:**

فەلسەفەی میژوو لە گۆشەنیگای کیزنوفۆنەوە بە ئاسانی پێناسە ناکرێ، هەر چەندە ئەو بە جێگری توسیدیدس دەزانن، بەڵام زۆر لەو میژوونووسە جیاوازە. گیزنوفون زۆری حەز لە نەقڵ

کردن و گێڕانەوەی رووداوانە، ئەمەش تاڕادەیەك دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە بە خۆی لەو رووداوانەدا بەشداری کردووە و شانازییان پێوە دەکات. ئەو لەواری پراکتیکیدا هیچ هەوێك بۆ هەڵسەنگاندن و لە بنج و بناوان کردنی رووداوەکان لە باری سایکولۆژییەوە نادات.

**شێواز و مامەڵە:**

پەیڤی گیزنوفۆن سادە و ناسك و رەوان و راشکاوانەیە، لەڕاستیدا پەیڤی وی پەیف و ئاخافتنی پیاوێکی ئەهلی ئەدەب و کارە. شێوازی وی لەواری مێژوونووسیدا نە مینا هیرودوت رۆمانتیکی درێژدادڕانەیە و نە وەکو توسیدیدس پڕ ئاو تاو و دەستکردە.

**کورتەیەکی رەخنەکان:**

گیزنوفون لە مەقامی مێژوونووسدا نەهاوتای هیرودوتە و نە هاوسەنگی توسیدیدسە. دوورە لە هەر توانا و بەهرەیەکی رەخنەگری و لە هەر دەسەڵات و کاریگەرییەکی مەعنەوی و ئەخلاقی. لەواری مەسەلە مەعنەوییەکاندا وردبین نییە، و بە تەرەفداری و لایەنگری (لایەنگری لە ئەسپارتە) و خۆپەرستی و لاف و گەزاف بێژی مەحکومە. لەلایەکی دیکەوە لە دیتنی رووداوەکاندا وردە، بە تایبەتی لایەنگری لەشتە ئابڕومەندەکان، و مرۆڤانی، و دلێرانەکان دەکات. راشکاوی و توندی و رەوانی، لە تایبەتمەندییەکانی نووسینەکانی گیزنوفۆن-ن. گیزنوفۆن کۆنترین گوتار (مقالە) نووسی یونانە. یەکێکە لەوانەی کە خاڵی لاوازی سەرەکی ئیمپراتۆری گەورەی پارسی بە یۆنانییەکان ناساند.

## شانۆنامە

**تراژیدیا:**

**سەرهەڵدان و پەرەسەندنی:**

تراژیدی یۆنان، وەکو شانۆنامەنووسی لە ئینگلیستاندا، لە سروود و رسوماتنامە مەزهەبییەکانەوە سەری هەڵداوە، لە جەژن و ئاهەنگ و فیستیڤاڵەکاندا گرووپی کۆرس و کوراڵانی پیاو کەوڵی بزنیان دەپۆشی (رەنگە بۆ ئەوە بوویێ کە وەکو ساتیرەکان"٧" بنوێنن)و دەرەقسین و گۆرانی دیترامب-یان لەسەر شەرەفی دیونوسوس-ی خوای شەراب و پیت و بەرەکەت دەگوت.

لە ساڵانی ناوەندی سەدەی شەشەمی پێش ز تسپیس"٨"-ی ئاتینی، کە بە باوکی شانۆنامەنووسی بەناوبانگە، ئەو ئەکتەرەی هێنایە ناو جیهانی شانۆوە کە وەڵامی هەندێ

بەشی دیالۆگی دەستەجەمی لە بەینی پەردەکاندا لە بەشی لیریکی نمایشدا دەدایەوە. بەمجۆرە و لەگەڵ پەرەسەندنی ئەم بەشانەدا و بە زیادبوونی هەندێ توخم و رەگەزی ئەفسانەیی تازە شانۆ هاتە ئاراوە. پاشان ئاسخیلۆس ئەکتەری دووەمی هێنایە ناو شانۆوە و بەمجۆرە گفتوگۆ و دیالۆگ لە شانۆدا باوی پەیداکرد. دوای ماوەیەکی دیکەش، سوفوکلوس ئەکتەری سێیەمی هێنایە ناو ناوان.

لە سەرەتای سەرهەڵدانی تراژیدییەوە تا رۆژگاری ئورپیدس، بە هەمان ئەندازەی زیاد بوونی رۆڵی ئەکتەران، رۆڵ و بایەخی گرووپی کۆراڵ و کۆرس و کۆمبارس کەم دەبوو. ژمارەی کەسانی گرووپەکانی کوراڵ کە لە سەردەمی تسپیسدا پەنجا کەس بوون، لە سەردەمی ئاسخیلۆسدا هاتە سەر پازدە کەس، و لە رۆژگار و سەردەمی سوفوکلوسدا گرووپێن پازدە نەفەری بوو بە باو.

## شانۆسازی و دەرهێنان:

هەر چەندە پەرستنی دیونوسوس لە سەرانسەری یونانندا باو بوو، بەڵام لە ئاتیندا بایەخێکی تایبەتی هەبوو. لە نێوان ساڵانی ٦٣٥- ٦٣٤ی پێش زدا جەژنێکی گەورەی تازە بۆ دیونوسوس بە ناوی دیونوسیای شار-ەوە بەو مەبەستەی لە ئاخر و ئۆخری مانگی مارسدا ئەنجام بدرێ هاتە ئاراوە. گرووپی کۆرس و کۆراڵی دیتورامب و پاشان شانۆنامەی تەواو، بوون بە یەکێك لە تایبەتمەندییە باوەکانی ئەم جەژن و رێورەسمە. لە سەرەتاکانی سەدەی پێنجەمی پێش زدا دانی خەڵات بە شانۆنامە براوەکان بوو بە باو. بۆ هەر یەکێك لەو سێ شاعیرەی کە لە پێشبڕکێیەکەدا بەشداری دەکرد، رێبەرێکی گرووپی کۆراڵ هەڵدەبژێردرا، رێبەری گرووپی کۆرس یان کۆڕاڵ لەسەر حیسابی خۆی و بە پارەی خۆی پێداویستییەکانی گرووپەکەی فەراهەم دەکرد و ئەکتەرەکانی پەروەردە دەکرد و پرۆڤەی پێدەکردن. هەر شانۆنامەنووسێك چوار پارچەی نمایشی (تیترالۆجی) پێشکەش بە فیستیڤاڵەکە یان جەژنەکە دەکرد کە دەبوایە یەك تریلۆجی و (سێ تراجیدی کە دەربارەی یەك بابەت بن، وەکو تریلوجی ئورستیا-ی ئاسخیلوس) یەك شانۆنامەی تەنز ئامێز یان ساتیریك"٩" (وەکو سیکلۆپەکان-ی ئورپیدس) لەخۆ بگرێ:

لەم رۆژگارەدا هەموو ئەکتەرەکان پیاو بوون کە زیاتر بە هۆی رەسایی دەنگیانەوە نەك بە هۆی بەهرە و توانای ئەکتەرییەوە، هەڵدەبژێردران. دیمەنە شانۆییەکان یان تەختەی شانۆ وەستایانە دەرازێنرایەوە و ئامادە دەکرا. جلوبەرگ و پێداویستییەکانی شانۆ بە تەواوەتی ئامادە دەکرا. هەر ئەکتەرێك دەمامك و کڵاوگیسێکی بەکار دێنا کە رەنگدانەوەی تەبیعەت

و خوی وی و نیشانەی رۆڵەکەی بوو. پێڵاوێکی پاژنە بەرزیشی لە پێ دەکرد تا بەژن و باڵا و هەیبەت و شکۆی بەرزتر و زۆرتر بکات. لە سەردەمی ئاسخیلوسدا دوو ئەکتەر و (پاشان بوو بەسێ) دەچوونە سەر شانۆ، بە جۆرێ کە هەر ئەکتەرێك ناچار بوو لە هەر یەکێك لەو چوار نمایشەی کە نیشان دەدران چەند دەورێك بگێڕێ.

شانۆنامە بە جۆرێ ئامادە دەکرا کە لە هاماجێکی کراوەدا ئەنجام بدرێ و پێشکەش بکرێ. کورسییەکان (هەوەڵجار دارین، و پاشان بوون بە کورسی بەردین) بە شێوەیەکی مەیلەو بازنەیی بەناوی ئۆرکستراوە دادەنران کە شوێنی گرووپی کۆراڵ بوو. لە پشت بەشی ئۆرکستراوە شوێنی جل گۆڕین هەبوو کە شوێنی گۆڕینی جل و دیکۆر بوو. هەڵبەتە گۆڕینی دیمەن و پەردە لە ئارادا نەبوو. هەندێ جار ئامێرێن وەکو سلینگ"١٠" بۆ دەرخستن و نیشاندانی هیمادگەری غەیبانی لە سەرووی شانۆکەوە بەکار دەهێنرا.

## بونیادی تراجیدیا:

بونیادی تراجیدی یونانی بەشێوەیەکی گشتی لەم بەشانە پێك دێت:

١- دەستپێك (ئەمەلە لە تراجیدیا کۆنترەکاندا لادەبرا)

دەستپێك بریتییە لە پێشەکییەك سەبارەت بەشەرح و شرۆڤەی شانۆنامەکە کە بە شێوەی مەنەلۆگ پێشاندەدرێ.

٢- رێگە، مەبەست لە رێگە ئەو ئاوازەیە کە لەلایەن کۆرسەوە پێشکەش دەکرێ.

٣- رووداوی رەوتەنی و نامۆ (سێ یا چوار رووداو) بریتییە لەو بەشانەی کە کاراکتەرە سەرەکییەکان هەندێ بەشی نەخشە و پلۆتی شانۆنامەکەی تیادا نیشان دەدەن.

٤- مەقام، ئەو ئاوازەیە کە گرووپی کۆراڵ لە دوای هەر رووداوێکی رەوتەنی و نامۆ دەیخوێنن و دەیڵێن.

٥- بەند، بەو شتانە دەگوترێ کە پاش مەقام ئەنجام دەدرێن.

**بابەتی تراجیدیا:**

بابەتی تراجیدی یونان یا ئەفسانەیە یا سەربهووردی پاڵەوانانە، یا هەردووکیانە. کاراکتەرانی سەرەکی شانۆنامەکان یا خواوەندانن یان گەورەپیاوانی سەردەمی پاڵەوانین.

**شێوەی مامەڵەکردن:**

**پلۆت (نەخشە):**

تراژیدی یونانی پلوتێکی تەواوی نەبووە هەندێ لە تەماشاڤانان پێشوەختە خاڵە گرنگ و سەرەکییەکانی چیرۆکەکەیان دەزانی، و زیاتر بۆ دیتنی ئەمە دەهاتن کە بزانن ئامادەکاری شانۆنامەکە چۆن بابەتەکەی بەرهەم هێناوە نەك بۆ دیتنی ئەنجامی چیرۆکەکە.

لەسەر شانۆدا جوڵە کەم بووە و بگرە هەر نەبووە. سنوورداری خودی شانۆکە و وەزع و حاڵی جلەکان کۆسپ بوون لە بەردەم جوڵەی پێویستدا. هەندێ لە رووداوەکان لە دەرێی شانۆدا رووی دەدا (وەکو کوشتنی ئاگامەمنون) یان لە رێگەی جارچییەکەوە دەگێڕدرایەوە (وەکو خۆکوژییەکەی ئانیتگۆنە و هەمۆن).

تراژیدیا نووسانی یونان هەندێ جار یەکێتی کات و شوێن "١١" یان رەچاو دەکرد، بەڵام یەکێتیی کار هەمیشە رەچاو دەکرا.

زۆربەی شانۆنامەکانی ئاسخیلوس و سوفوکلوس لێوان لێون لە هۆکار و هاندەری دراماتیکی بەرز و باڵا، لە شانۆنامەکانی ئورپیدسدا، کاتێ زنجیرەی رووداوەکان دەئاڵۆسکێ و گرێ کوێرەیان تێ دەکەوێ و قارەمان یا کاراکتەر دەگاتە بنبەست، لە بری ئەوەی کە بە دوی یەکدا هاتنی مەنتیقی و لۆژیکی رووداوەکان، ئەنجامی چیرۆکەکە بەرهەم بێنێ، گرێیەکان بە دەستی یەکێك لە خواوەندەکان دەکرێنەوە. هیمدادکاری غەیبانی، لە شێوەی ئامێرێکی سلینگ ئاسادا لەسەر شانۆ دەردەکەوێ و کاراکتەرەکە رزگار دەکات و بە شێوەیەك لە شێوەکان فریای دەکەوێ. لە شانۆنامەدا کەشف و ئاسینیش کە هۆی کۆتایی چاوەڕوانییە باو بووە. پێشگۆیی، ئیلهام و بەخت گرتنەوە و هەروەها گرووپی کۆرس و کوراڵ و ئەکتەرانی سەرەکی هەمیشە لەواری کەشف و ئاسیندا دەوری گرنگیان هەبووە.

**کاراکتەرسازی:**

مامەڵە کردن لەگەڵ خەسڵەت و تەبیعەت و بیوگرافیدا ئەگەرچی (بەگوێرەی بۆچوونی ئەرەستۆ) پاش قۆناغی پلۆت و نەخشە دێت، بەڵام لە تراجیدی یونانییدا بایەخی فرەی هەبووە. لە هەندێ شانۆنامەیاندا کاراکتەرەکان تۆزێ لە ئاستی جۆری خۆیان، باڵاترن، بەڵام لە زۆر تراجیدی دا، کاراکتەر هەم بەشێوەی نەوعی و هەم بە شێوەی فەردی دەخرێتەڕوو و هەندێکیان سیمایەکی ئەوەندە مرۆڤانییان هەبوو کە دەیانتوانی مایەی ستایشی هەموو خەڵکی جیهان بن.

**کێش:**

لە تراجیدی یونانیدا بەشە دیالۆگییەکان زیاتر لەسەر وەزن و کێشی سیانی ئیامبیك یان لەسەر وەزن و کێشی چواری تروکایکە"١٢".

ئەو غەزەلیات و کۆپلە لیریکییە دەربڕانەی غەم و شادی، کە گرووپی کۆڕال و کاراکتەر ئەنجامی دەدەن، کێش و وەزنی لیریکی هەمە جۆریان هەیە.

## تراژیدیا نووسانی گەورە

**ئاسخیلوس (٥٢٥- ٤٥٦ی پێش ز):**

بە یەکەمین گەورە تراجیدی نووس دەژمێردرێ، ئوفوریون-ی بابی لە چینی دەوڵەمەندانی ئاتین، و خەڵکی ئیلیوسیس"١٣"-ـە، کە لەوێدا ئاسخیلوس بە قوڵی دەکەوێتە ژێر کاریگەری داب و نەریتی نهێنی ئامێزی پەرستنی خواوەندانەوە. ئاسخیلوس لە جەنگی ماراتوندا بەشداری دەکات و لەوەش دەچێت لە شەڕی سالامیس و پلاتە-شدا بەشداری کردبێ. لە ساڵی ٤٩٩ی پێش ز بە دواوە لە پێشبڕکێی شانۆنامەنووسیدا بەشداری دەکات و لە ساڵی ٤٨٤ی پێش زدا یەکەمین سەرکەوتن بە دەست دێنێ. تا ساڵی ٤٥٩ی پێش ز درێژە بە شانۆنامەنووسین بۆ شانۆی ئاتین دەدات، سەردانی زۆری سیراکوز، سیسیل و هەروەها دەربارەی هیرو"١٤" دەکات. لەوە دەچێت ئاسخیلوس تا ساڵی ٤٦٨ی پێش ز لە سیسیل ژیا بێ.

**داهێنانەکانی:**

ئاسخیلوس بەشدارییەکی زۆری لە پێشڤەبردنی تراجیدی یۆنانیدا کردووە، کە بریتین لە:

١- زیادکردنی ئەکتەری دووەم لەسەر شانۆ.

٢- کەمکردنەوەی ژمارەی کەسانی گرووپی کۆڕال بۆ ١٢- ١٥ کەس.

٣- کەمکردنەوەی بایەخی گرووپی کۆراڵ و زیاد کردنی بایەخی دیالۆگی ئەکتەرەکان.

٤- داهێنانی تریلوجی (واتە شانۆنامەی سێ بەش) و یەك بابەتی.

**بەرهەمەکانی:**

ئاسخیلوس نزیکەی نەوەت تراجیدی و شانۆنامەی ساتیریکی نووسیوە، لێ تەنیا حەوت تراجیدی وی گەییوەتە دەستی ئێمە.

**ژنانی شینگێڕ (دەوروبەری ٤٩٠ی پێش ز):**

رەنگە کۆنترین شانۆنامە بێ، و لەوەشە یەکەم بەشی تترالوجی یەك (بەرهەمێکی چوار بەشی) بێ کە سێ بەشەکەی دیکەی لەنێو چووە، پەیامی ئەخلاقی ئەم شانۆنامەیە ئاڵۆز و

نادیارە، لەم شانونامەیەدا باسی ڕێزگرتنی هەقی پەناهەندەیی کراوە، تەنانەت ئەگەر بە بەهای جەنگیش بێ. واتە ڕێزگرتنی مافی پەناهەندەیی ئەوە دێنێ تەنانەت ئەگەر پێویست بکا شەڕیشی لەسەر بکرێ. پەنجا کیژی دانایوس"١٥" لە میسرەوە بۆ ئارگوس هەڵدێن. پلاسگوس-ی شای ئەو وڵاتە قایبل دەبێ کە مافی پەناهەندەییان بدرێتێ، ئەگەرچی لەوەشە ئەم کارە ببێتە مایەی ئەوەی کە میسر شەڕ لەگەڵ ئارگوسدا رابگەیەنێ. بەمجۆرە ئەم شانۆنامەیە لە چاو دوو تراژیدیای تری ئەم بەرهەمە چوار بەشیەدا لە سنووری پێشەکییەك هێوەتر دەڕوات. ژنانی شینگێڕ لەڕووی فۆرمەوە قۆناغێکی گۆڕان و وەرچەرخانە لە نێوان گۆرانی لیریکی دیتورامب و تراجیدی واقیعیدا. لەم شانۆنامەیەدا جگە لە جارچییەك، دوو ئەکتەری دیکەش هەن، یەنجا کیژی شینگێڕیش گرووپی کۆراڵ یان کۆرس پێك دەهێنن، و بە ئەکتەری سەرەکی شانۆنامەکە دێنە ژماردن. لەم شانۆنامەیەدا جوڵە و کاراکتەرسازی ئەوەندە بە هەند نەگیراوە، بەڵام لە جیاتی ئەوە زۆر شیعری لیریکی جوان و زمانێکی دەوڵەمەند و مشتومڕێکی دراماتیکی واقیعی لەخۆ گرتووە.

<u>ئێرانییان (دەوروبەری ٤٧٢ی پێش ز):</u>

تاقە شانۆنامەیەکە کە دەربارەی مێژووی سەردەمی ئاسخیلوس ماوەتەوە. بابەتی ئەم شانۆنامەیە سەرشۆڕی سوپای ئێرانە پاش شکستی لە شەڕی سالامیسدا. لایەنی دراماتیکی ئەم شانۆنامەیە، لە هەموو تراجیدییەکانی یۆنانی کەمترە. پیلۆت و نەخشەی شانۆنامەکە، لە بری ئەوەی بچێتە قۆناغی ڕووناکی و بڕیار و دیاری کردنی چارەنووسەوە، تایبەتە بە کەشفێك کە لە ڕێگای ئاتوسا-ی دایکی خەشایار شاوە ئەنجام دەدرێ. شانۆنامەکە دیالۆگی تەاوی لەخۆگرتووە، بەڵام پلۆتێکی گونجاو و تەواوی نییە. لەو شانۆنامەیەدا بۆ یەکەمجار ڕووبەڕووی ئامادەبوونی ڕوح دەبینەوە.

<u>حەوت کەس دژی تیبە (دەوروبەری ٤٦٧ی پێش ز):</u>

ئەمە دواهەمین بەشی شانۆنامەیەکی چوار بەشییە (شانۆنامەکانی دی: لایوس، ئودیپ و شانۆنامەی تەنزئامێز ئەبول هۆل-ە). بابەتی ئەم شانۆنامەیە کەرب و کینەی نێوان دووان لە کوڕانی ئۆدیپە، ئەمە جگە لەو بەدبەختییە میراتییەی ناو ئەم ماڵباتە کە لە نەوەیەکەوە بۆ نەوەیەکی دی دێت. پاش مەرگی ئودیپ دووان لە کوڕانی وی (ئیتوکلوس و پولونیکس) لەسەر دەسەڵاتی تیبە بەشەڕ دێن و یەکدی دەکوژن.

**پرومیتە لە زنجیردا (دەوروبەری ٤٦٦ی پێش ز):**

یەکەمین بەشە لە بەرهەمێکی سێ بەشیدا (تریلوجی) دەربارەی ئەشکەنجە بە ئازارەکانی پرومیتە (دوو شانۆنامەکەی دی رەنگە بریتی بن لە پرومیتەی لە بەند خەلەسیو، و پرۆمیتەی ئاگر هەلگیرسێن). بابەتی شانۆنامەکە بەشێوەیەکی جۆراوجۆر شەرح و شرۆڤە دەکرێ، ئەفسانەی شەڕ و بێدادی و دڕندەگەری لەلایەك، و ژیری و دادپەروەری و مرۆڤدۆستی لەلایەکی دیکەوە.

پرۆمیتە چونکە ئاگر لە زیوس دەدزێ تا بە دیاریی بیداتە بەشەر، زیوس لە چیای قەفقازدا بەزنجیر بە تاوێرێکییەوە دەبەستێ. پرۆمیتە ئاگاداری نهێنییەکە کە ئایندەی زیوسی پێوە بەندە، بەڵام نایەوێ ئەو رازە بە وی بڵێ. ئەم شانۆنامەیە هەر چەندە کەمترین جوڵەی تێیدا نییە، بەڵام دەشێت قوڵترین و هۆشمەندانەترین شانۆنامەی ئاسخیلوس بێ، کاریگەری ئەم شانۆنامەیە بەسەر نووسەرانی کۆن و تازەوە زۆر بووە. جگە لە کاریگەریی بەسەر بابەتی شانۆنامەکانی شیلی و بریجز، بەسەر بەرهەمەکانی میلتن، گوتە، بایرون، براونینگ، سوین برن، و توماس هاردی-شەوە کاریگەری هەیە.

**ئورستیا (ئاگامەمنون، کویفور، ئومنیدس) (دەوروبەری ٤٥٨ی پێش ز):**

تاقە بەرهەمی تەواوی سێ بەشییە (تریلوجی) کە ماوەتەوە و براوەی خەڵاتی یەکەمی پێشبڕکێی ئاتینە، بابەتی ئەم شانۆنامەیە جۆرە نەحسی و نەگبەتییەکە کە لە ئەنجامی تاوانانەوە پشتاوپشت بۆ نەوەکان دێ، لەم ماڵباتەدا هەر تاوانێك، تاوانێکی دیکەی بەدوودا دێ، نەفرەتی ئانتالوس"١٦" بە پیلوپس، و لەوەوە بە ئاتریوس"١٧" دەگات، پاشان بە ئاگامەمنون و سەرئەنجام بە ئورستیس"١٨" دەگات کە لە لایەن خواوەندانی تۆڵەوە"١٩" تاقیب دەکرێ. ئەو کە دایکی کوشتووە داوای بوردن دەکات، و دەبەخشرێ. ئەم شانۆنامەیە کاری کردۆتە سەر سوفوکلس، سنکا، ڤۆلتێر، ئالفیری، ئونیل، و گەلێکی تر.

**ئاگامەمنون:**

باشترین و یەکەمین بەشی شانۆنامەی سێ بەشی ئورستیایە کە پلوتێکی چڕ و کورتی هەیە. کیلی تیمنسترا بە هاوکاری ئیژیستوس- ی دۆستی، کە ئامۆزای ئاگامەمنونە، وی کە بۆ ئەو مێردێکی بێ وەفا و بۆ منداڵەکانی باپێکی بێ سەر و بەرە دەکوژێ. لەم شانۆنامەیەدا کەسایەتی کیلی تیمنسترا بە شێوەیەکی بەرز وێنە گیراوە.

**کویفور:**

یەکەم شانۆنامەیە کە پلۆت و هەوێنی سەرەکی بریتی بێ لە دەسیسە و پیلانگێڕی. ئورستیس- ی فەرزەندی ئاگامەمنون، دەست لەگەڵ دۆستەکەیدا (پیلادس) تێکەڵ دەکات و پیلان بۆ کوشتنی کیلی تیمنسترا و ئیژیستوش دادەنێ، ئورستیس دەگاتە مەرام، بەڵام بە تاوانی کوشتن دەکەوێتە بەر تاقیبی خواوەندانی تۆڵە.

**ئومنیدس:**

یەکەمین شانۆنامەیە کە گۆڕانی تەواوەتی لە دیمەنەکانیدا هەیە. خواوەندانی تۆڵە بە تاوانی پیاوکوژی تاقیبی ئورستیس دەکەن، بەڵام چونکە تۆڵەی کوشتنی باوکی خۆی کردۆتەوە، ئاتینە تەبرئەی دەکات و دەیبەخشێت. ئەم تراجیدییە لەڕووی توانای دەرهێنانەوە بایەخێکی زۆری هەیە.

**بیروبۆچوونەکانی ئاسخیلوس:**

ئاسخیلوس لە تراجیدییەکانی خۆیدا مامەڵە لەگەڵ قوڵترین مەسەلەێن ئایینی و ئەخلاقیدا دەکات: سروشتی خودایان، مەسەلەی شەڕ، نیشتیمانپەروەری و بەرپرسیارییەتی مرۆڤانی، کورتە و پوختەی بیروبۆچوونەکانی بەمجۆرەیە:

خواوەندان بەرز و دادپەروەرن. مرۆڤ دەبێ ملکەچی ویستی ئەوان بێ. گوناح میراتییە، بەڵام ئادەمیزاد بەرپرسیارییەتی فەردی و شەخسیشی لەسەرە. دەبێ بە تەحەمولکردنی ڕەنج و زەحمەت، کە مرۆڤ ئاقڵ دەکات، کەفارەی لوتبەرزی، تاوان و گوناحانی خەڵکانی دی بداتەوە.

**شێوە و مامەڵەی ئاسخیلوس:**

پلۆت و نەخشە لە بەرهەمەکانی ئاسخیلوسدا سادە و ناکۆکە. ڕووداو زۆر کەمە، کاراکتەرەکانی لە ئاستێکی بەرزدان و لە سەرووی سروشت و خووی ئادەمیزادەوەن، چارەنووسیان لە بری ئەوەی لە دەست خۆیاندا بێ زیاتر لە دەستی خواوەنداندایە. زمانەکەی بە ریتم و ڕەوان و سوار و بەرزە.

زۆر دەربڕین و زاراوەی لە هۆمەر، سولون، هسیود، شاعیرانی لیریکی، سوفوکلوس، و دەستووورە نهێنی ئامێزەکان و سەرچاوە زمانەوانییەکانەوە وەرگرتووە. شێوەی وەسفی وی بابەتیانەیە و هزر و بیری لێکدی دوور و پچڕ پچڕ و غەریبە.

**کورتەیەک لەمەڕ ئەو ڕەخنانەی لێی گیراون:**

شۆرەتی ئاسخیلوس زادەی بونیادی پلۆتی بەرهەمەکانی نییە، پلۆت و نەخشەکانی لە بنەڕەتدا پایە و بنەمای لۆجیکییان نییە، کار و جوڵە لە بەرهەمەکانیدا زۆر کەمە، کاراکتەری

شانۆنامەکانی هەر چەندە بەشێوەیەکی روون و زیندوو وێنە دەگێرن، بەڵام پەرەسەندن و گەشەکردنیان لاوازە، هێندەیان موبالەغە دەربارە دەکرێ کە لە شێوە و سیمای بەشەری دوور دەکەونەوە، گەزافە وێژی، درێژدادڕی، و ئاڵۆزیش بە خەوشی وی دادەنرێن. بە هەر حاڵ لایەنی ئیجابی بەرهەمەکانی ئاسخیلوس لە لایەنە سەلبییەکانی زیاترە. جگە لە داهێنانە گرنگەکانی، بایەخ و ئیحتویاریش بە تراژیدی دەبەخشێت. ئەگەر چی هەندێ جار دەربڕین و گوزارشتی موبالەغە ئامێزە، بەڵام زمانێکی مکوم و بتەوی هەیە. شکۆ و گەورەیی ئەو، ئاریستۆفانس (لە قورباقان)دا وا لێدەکات کە ئاسخیلوس لە ریزی پێشەوەی تراجیدی نووساندا دابنێ.

## سوفوکلیس (٤٩٥- ٤٠٦ی پێش ز):

دووەمین تراجیدی نووسی گەورەیە. لە کولون، کە گوندێکی نزیکی ئاتینە، لە بنەماڵەیەکی بازرگانی دەوڵەمەن دێتە دنیاوە. هەر بە منداڵی دەخرێتە بەر خوێندن و پەروەردە و فێرکردن و زوو دەست بە نووسین دەکات و بۆ یەکەجار لە ساڵی ٤٦٨ ی پێش زدا لە پێشبڕکێی ئاتینیدا بە پلەی یەکەم دەردەچێ و تا کۆتایی تەمەنی درێژە بە نووسین دەدات. سوفوکلیس لە پێشبڕکێیەکانی ئاتین بیست و چوار کەرەت بە پلەی یەکەم و دووەم دەردەچێ.

وەکو یەکێك لە دە فەرماندەی ئاتینی-ش هەڵدەبژێردرێ. وەکو دەگێڕدرێتەوە کۆتایی تەمەنی سوفوکلیس، بە هۆی ئەو دادگاییەوە کە کوڕەکانی دژی ئەو رێکی دەخەن، بەتاڵی و ناهەمواری دەگوزەرێ، لە ئەنجامدا لە ئاتین دەمرێ.

### تازەگەرییەکانی:

بەشدارییەکانی سوفوکلیس لە پێشڤەبردنی شانۆی یونانیدا بریتییە لە:

١- نیگارکێشی و رازانەوەی شانۆ و دیمەنان.

٢- کەمکردنەوەی بایەخی گرووپی کۆراڵ و راگرتنی ژمارەیان لە سنووری پازدە کەسدا.

٣- وەلانانی شانۆنامەی سێ بەشی (تریلوجی) و نووسینی تراجیدی تەواو.

### بەرهەمەکانی:

نزیکەی ١٢٣ شانۆنامە دەدەنە پاڵ سوفوکلیس، بەڵام تەنیا حەوت تراجیدی ئەو لەبەر دەستدایە.

### ئاجاکس (نزیکەی ٤٤٥ی پێش ز):

بابەتی ئەم تراجیدییە کەوتنی پیاوێکە لە ئەنجامی خۆپەسندی و لاسارییەوە، ئاجاکس کە دەبینێ زرێیەکەی ئاخیلوس کەوتۆتە دەستی ئودیسیوس، تووڕە دەبێ. ئاتینە تووڕەییەکەی ئەو

دەگۆڕێ بۆ شێتی. لە سەرەتای شانۆنامەکەدا ئاتینە بۆ ئودیسیوس-ی دەگێڕێتەوە کە خۆپەسندی و خۆپەرستی و لاساری و سەرەڕۆیی، ئاجاکس-ی بەرەو شێتی بردووە. ئاجاکس چاك دەبێتەوە، بە شمشێرەکەی خۆی خۆی دەکوژێت. ئاگامەمنون و منلایوس لە رقا بەشداری کفن و دفنی وی ناکەن، بەڵام سەرەنجام ئودیسیوس خۆپەسندی و لاساری لە مێشکی وان دەردەکات، و ئاجاکس بە خاك دەسپێردرێ. ئەم شانۆنامەیە زۆر تایبەتمەندی جیاوازی لە شانۆنامەکانی پێشتر هەیە، لەوانە: نیشاندانی کاری توندوتیژ لەسەر شانۆ، لابردنی گرووپی کۆراڵ، و گۆڕینی رازانەوەی شانۆ، دوو خاڵی قەیرانی شانۆییە کە بە سوود وەرگرتن لە لێکچوونی لاساری و خۆسەری ئاجاکس لەگەڵ ئاگامەمنون و منلایوس هونەرمەندانە پێکەوە گرێ دەدرێن. ئاجاکس قارەمانی واقیعی تراجیدییەکەیە -گوناه دەکات، و هەروەها بە شێوەیەکی تراجیدی یاخی دەبێ کە کار دەکاتە سەر، داروخان و کەوتنی.

**ئانتیگونە (دەوروبەری ٤٤١ی پێش ز):**

زەمینەی شانۆنامەی ئانتیگونە خەتایەکی زادەی خۆپەسندییەکی خۆسەرانە (بڕوانە ئاجاکس) و رووبەڕوو کردنەوەی قانونی دنیایی لەگەڵ یاسا خواییەکاندایە. کریون-ی شای لاسار رێگە بە ئانتیگونە کە وەکو ئەو خۆسەر و لاسارە، نادات کە جەنازەی پۆلونیکس-ی برای بە خاك بسپێرێ. ئانتیگونە سەرپێچی لە جێبەجێکردنی ئەو فرمانە دەکات، و کریون وێڕای پاڕانەوە و تکا و رجای هەمون و تیرزیاسی غەیبزان و گرووپی کوڕاڵ، فەرمانی کوشتنی ئانتیگونە دەردەکات. ئانتیگونە، هەمون، و ئوریدیس-ی (هاوسەری کریون) بڕیاری خۆکوژی دەدەن و کریون تەسلیم دەبێ. کاراکتەرسازی لەم شانۆنامەیەدا وەستایانەیە، ئانتیگونە سیمایەکی تەواو بەشەریی هەیە. ئیسمن وەکو کەسایەتییەکی بەرانبەری ئانتیگونە وێنە دەگیرێ، و هەمون بەرانبەر بە کریونە. تۆنی ئەم شانۆنامەیە بە جۆرێکی ناباو خەماوییە. حاڵەتی چاوەڕوانی کاریگەرییەکی ریزپەڕی هەیە: ئایا کریون پێش ئەوەی کە کار لەکار بترازێ نەرم دەبێ؟

**ئودیپ شا (دەوروبەری ٤٣٠ی پێش ز):**

زەمینەی ئەم شانۆنامەیە بریتییە لە: تەنزی قەدەر و چارەنووس، کە ناکرێ مرۆڤی نێچیری مەرگ بە بەختەوەر بزانرێ، مەگەر دوای مەرگ، بە گوێرەی پێشگۆیی دەنگی پەرستگەی دلف، ئودیپ بابی خۆی دەکوژێت (بێ ئەوەی کە بزانێ لایوس بابی خۆیەتی)و لەگەڵ دایکی خۆیدا دەزەوجێ (بێ ئەوەی بیناسێت).

زۆربەی شارەزایان ئەم شانۆنامەیە بە بەهێزترین تراجیدی یونان دەزانن، هۆکار و ئەنجامی کردارەکانی ئودیپ بە شێوەیەکی وەستایانە هاتۆتە دەربڕین و وێنەگرتن، هەروەها تەنزیی دراماتیکی لەم بەرهەمەدا گەییوەتە رادەی کەماڵ.

هۆکاری تراجیدیەکە بەرز و باڵایە، کار و جوڵە بلەزو پەی دەر پەیە. چارەنووس و قەدەری حەتمی ئودیپ کە هەستی ترس و بەزەیی لەلای تەمەشاڤان دەبزوێنێ، رەنگە باشترین نموونەی نێو تراجیدییە یۆنانییەکان بێ. گەلێك لە شانۆنامە نووسانی وەکو سنگا، کورنی، درایدن، لی، و ڤولتیر لە ژێر کاریگەری ئەم بەرهەمەدا بوونە.

**(ژنانی تراخیس) تارخینیا (دەوروبەری ٤١٣ی پێش ز):**

شانۆنامەیەکی تا ڕادەیەك لاوازە. بابەتەکەی بریتییە لە مەرگی هەرکول کە لە ئەنجامی پۆشینی چاکەتێکی ژەهراویدا، کە دژانیری "٢٠" هاوسەری بۆی دەنێرێ، روو دەدات. رازی چیرۆکەکە بە رێژەیەکی یەکسان لە مەرگی هەرکول و خۆکوژی دژانیردا پەنهانە. دەربڕینی چیرۆکەکە کاڵ و کرچ و ناپەسندە، گفتوگۆیەکان زۆر درێژن. قارەمانی چیرۆکەکەش تا وەکو پێش بەشی چوارەمی شانۆنامەکە لەسەر شانۆ دەرناکەوێ. (هەرکول لە ئوتا-)ی بەرهەمی سنکا، لە ژێر کاریگەری ئەم بەرهەمەدا بووە.

**ئیلیکترا (دەوروبەری ٤١٠ی پێش ز):**

بە شێوەیەکی گشتی پێگەی ئیلیکترا لە کویفور و ئومنیدس-سی ئاسخیلوس کە لە هەمان زەمینە و جیهاندایە، بە زیاتر و باڵاتر دەزانرێ. هەڵبەتە لەم شانۆنامەیەی سوفوکلیسدا، ئەلیکترا لە جیاتی ئورستیس زاڵە بەسەر شانۆوە. بەرجەستەترین لایەنی ئیلیکترا دیالۆگ و کاراکتەرسازییە.

**فیلوکتیتس (دەوروبەری ٤٠٩ی پێش ز):**

لە جوملەی ئەو شانۆنامانەدایە کە لە ئاتینندا خەڵاتی یەکەمی بەدەست هێناوە. فیلوکتیتس شانۆنامەی رووداوانە. ناوەڕۆکی ئەم شانۆنامەیە کێشمانەکێشی نێوان دادپەروەری و نەجابەت لەلایەك و نزمی و نێرەنگبازی و بیرکردنەوەی دنیاییە لەلایەکی دیکەوە. کاراکتەرسازی نیوپتولە (کوڕی ئاخیلوس)، ئودیسیوس، فیلوکتیتس یەجگار بەرز و باڵایە. پلۆتی شانۆنامەکە باش چنراوە، و گەشەکردن و پێشڤەچوونی شانۆنامەکە یەکگرتوو و رێکوپێکە، بەڵام لە کۆتایی چیرۆکەکەدا سوود لە رێچکەی هێنانی خودایان بۆ سەر شانۆ، بە مەبەستی کردنەوەی گرێی پلۆت و نەخشەی شانۆنامەکە وەردەگیرێ. لە رێگەی ترەوادەدا،

یونانییەکان فیلوکتیتس بە تەنیا بەجێ دێڵن، نەخۆشییە دژوار و لە چارە نەهاتووەکەی دەبێتە هۆی ئەوەی کە لە دوورگەی لمنوس ڕەهای بکەن. دوای دەساڵ کاتێ یونانییەکان پەی بەوە دەبەن کە بەبێ فیلوکتیتس و ئەو تیر و کەوانەی کە لە هەرکولەوە بۆی ماوەتەوە ناتوانن تەروادە بگرن، هەنگێ ئودیسیوس و نیوپتولمە دەگەڕێنەوە بۆ لمنوس و دەیانەوێ هاوکاری فیلوکتیتس بە دەست بێنن. هەڵبەتە ئەو یارمەتیان نادات، تا هەرکول خۆی دەگەڕێتەوە و بەڵێن بە فیلوکتیتس دەدا کە نەخۆشییەکەی چارەسەر بکات.

**ئودیپ لە کولونوسدا (٤٠١ی پێش ز):**

ئەم بەرهەمە تا پێنج ساڵ پاش مەرگی سوفوکلیس نمایش نەکراوە. لە جوملەی ئەو شانۆنامانەیە کە لەگەڵ چەندین شانۆنامەی دیکەدا خەڵاتی یەکەمی لە ئاتینا پێ براوە. لەوە دەچێ ئەم بەرهەمە ڕەنگدانەوەی ئەو شەڕە بێ کە لە نێوان سوفوکلیس و کوڕەکانیدا (بەتایبەتی یوفون) لە دەوروبەری ساڵی ٤٠٨ ی پێش زدا ڕوویداوە. تیمەی شانۆنامەکە بریتییە لە دەرکردنی ئودیپ لە زومرەی پاڵەوانان و تیمچە خودایان. نەفرەت لە کوڕەکانی دەکات و پێشبینی ئەوە دەکات کە بە دەستی یەکدی دەکوژرێن. ئودیپ دەمرێ و لە شوێنێکی پەنا و پەنهاندا بەخاك دەسپێردرێ. بونیادی پلۆتی شانۆنامەکە لوجیکییە، کار و جوڵە بلەزە و کاریگەری دراماتیکی خۆی هەیە. کاراکتەرسازی ئودیپ - شالیر"[٢١]" لە تراجیدی یونان- و ئانتیگونەدا بەرجەستەیە. ڕەنگە ئەم شانۆنامەیە لە ژێر کاریگەری ئاسخیلوس و ئورپیدسدا هاتبێتە دانان و نووسین.

**بیروبۆچوونەکانی سوفوکلیس:**

سوفوکلیس خواوەندان بە دادپەروەر دەزانێ، بەڵام بە ئەندازەی ئاسخیلوس پەنایان وەبەر نابات کە دەخالەت لە چارەنووسی بەشەردا بکەن. بە بۆچوونی ئەو لەوەیە گوناحی باوك یەخەی منداڵ بگرێ، بەڵام موسیبەت یان لاوازی کەسایەتی (بەتایبەتی بوغرایی و لوتبەرزی) زیاتر زادەی شەڕەنگێزی مرۆڤە. سوفوکلیس باوەڕێکی ئەوتۆی بە خوداوەندی تۆڵە یان پاداشت نییە. ئەویش وەکو ئاسخیلوس، باوەڕی وایە کە ڕەنج و زەحمەت مرۆڤ ئاقڵ دەکات و قاڵی دەکاتەوە و هێز و توانا بە کەسایەتی دەبەخشێت.

**شێواز و مامەڵە:**

لە شانۆنامەکانی سوفوکلیسدا هەمیشە هەموو چیرۆکەکە بە دەوری تەوەری یەك کەسایەتیدا دەسووڕێتەوە. ئەم یەك کەسایەتییە یەکێتییەکی ئەوتۆ بە شانۆنامەکە دەبەخشێت

کە هەر رووداوێك بە شێوەیەکی دیار و زەق مەدار و لوتکەی خۆی پەیدا دەکات. پلۆتی شانۆنامەکان بە وردی چنراوە و زۆر بەلەز روو دەدات. گروپی کۆراڵ یان کۆرس بایەخێکی کەمی هەیە. سوفوکلیس لە بواری تەوس و توانج و گاڵتەجاریدا بێ هاوتایە، عیللەت و هۆ لە پلۆت و تیمەی شانۆنامەکانیدا بەرز و باڵایە. کاراکتەرسازی وی لە چاوی ئاسخیلوسدا ئاسایی تر، مرۆڤانی تر، و ریالیستی ترە، بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا تارادەیەك ئاوێتەی خەڵگەراییشە.

سوفوکلیس بە نیشاندانی کێشمانەکێشی کەسایەتییەکان، پتر تایبەتمەندییەکانیان بەرجەستە دەکات. ئەو بە تایبەتی لە واری سایکۆلۆژیدا بە توانایە. کاراکتەرەکانی هەندێ جار لە میانی یەك شانۆنامەدا دەگۆڕین و نەش ونما دەکەن و گەشە دەکەن، کریون لە شانۆنامەی ئانتیگونەدا نموونەی ئەمەیە. هەروەها لە دراماکانی ویدا رەگەزی گاڵتەجاڕی نموودێکی کەمی هەیە.

## کورتەیەك لەمەڕ رەخنەکان:

تاقە ئیراد و عەیبێ کە بە هەق لە سوفوکلیس دەگیرێت دەربارەی کاراکتەرانی شانۆنامەکانیەتی کە هەندێ جار زۆر نموونەیی و ئایدیالی وێنە دەگیرێن. بە هەر حاڵ، کاراکتەرسازی ئەو زۆر جارانیش زۆر سەرکەوتووە. پلۆت و نەخشە و تیمەی شانۆنامەکانی گونجاو و هاوناهەنگە، و رەوتی رووداوەکانیش روو لە یەك ئامانجە. لەڕووی هونەر و شێوازیشەوە لە ئاسخیلوس باڵاترە.

## ئورپیدس (٤٨٠- ٤٠٨ی پێش ز):

شاعیری تراجیدی ئاتینییە. لە دوورگەی سالامیس، و لەگینە لە رۆژی سەرکەوتنی مەزنی دەریاییدا "٢٢" هاتبێتە دنیاوە. لە قسان زۆرانباز و بۆکسەریش بووە. لەگینە ئەمەش بۆ ئەوە بگەڕێتەوە کە بابی بۆ وەرزش هانی دەدا. لە گەنجیدا ماوەیەکیش خووی داوەتە نیگارکێشی. ئورپیدس یەکەمین شانۆنامەی خۆی لە ساڵی ٤٦٢ی پێش ز نووسیوە، لێ هیچ شانۆنامەیەکی تا ساڵی ٤٥٥ی پێش ز دەرنەهێنراوە. وا باوە کە سەفەری ئاتینی کردووە و لە شاگردانی ئاناکساگوراس "٢٣" پروتاگوراس "٢٤"، و سوکرات بووە. لە قسان ئورپیدس گرفتاری کێشەێن زەوجین بووە و لە شکەفتێکی کەناری سالامیس وەکو عابیدان رۆژگاری قەتاندووە. لە دەوروبەری ساڵی ٤٠٩ی پێش ز لە مەقدونیا رێی دەکەوێتە دەرباری ئارکلایوس، و سەرەنجام لە ساڵی ٤٠٨ ی پێش ز دا دەمرێ، دەنگۆیەکی وەها هەیە کە سەگە راوییەکانی ئارکلایوس کوشتبێتیان.

**تازەگەرییەکانی:**

گرنگترین داهێنانی یوریپیدس لەواری شانۆنامەی یونانیدا بریتییە لە:

١- کەمکردنەوەی بایەخی گرووپی کوراڵ.

٢- سوود وەرگرتنی زیاتر لەو پێشەکییەی کە لە شێوەی مەنەلۆگی سەرەتای نمایشدا کە راستەوخۆ تەماشاڤانان دەدوێنێ.

٣- سوود وەرگرتن لە ئەشقی رۆمانتیکی وەکو هەوێنی سەرەکی نمایش.

٤- سوود وەرگرتن لە مونودی.

**بەرهەمەکانی:**

نزیکەی نەوەد شانۆنامە دەدرێتە پاڵ یوریپیدس، لێ تەنیا هەژدە شانۆنامەی وی وەکو: مناڵانی هەرکول، ئاندروماك، هیکاپ، و ژنانی شینگێڕ لەبەر دەستدایە. شانۆنامەیەکی دیکەی وی بریتییە لە:

**ئالسیست (دەوروبەری ٤٣٨ی پێش ز):**

ئەمە چوارەمین بەشی شانۆنامەیەکی چوار بەشییە (تترالوجی) کە جێی درامای ساتیرێکی گرتۆتەوە. ئەم شانۆنامەیە کارێکی تراجیدی -کۆمیدی ریالیستییە کە چەندین دیمەنی خەندەداری (وەکو جوێنە مەستانەکانی هەرکول-ی تێدایە)و ئەنجامێکی خۆشی هەیە. بابەتی شانۆنامەکە بریتییە لە چاك بوونەوەی ئادمیتوس لە ئەنجامی مەرگی ژنەکەیدا کە ئالسیست-ە کە بە تاسەوە گیانی خۆی فیدای نەجاتی گیانی شووەکەی کردووە. کەسایەتی ئالسیست، کە لە کۆتایی شانۆنامەکەدا بە دەستی هەرکول لە هادیس (بنکی دۆزەخ) رزگار دەکرێ، بە جۆرێکی کاریگەر و جوان پەروەردە کراوە.

**میدیا (٤٣١ی پێش ز):**

یەکێکە لە ناودارترین و دڵگیرترین شانۆنامانی یونانی و شاکاری یوریپیدس-ە، بابەتی شانۆنامەکە بریتییە لەسەر کردنی هەستێن میناتورەیی و حەسودی کە لەگینە بەسەر ئاوەزدا زاڵ بێ و ئادەمیزاد بەرەو کاری نامرۆڤانی، کارەسات و خۆکوژی بکێش بکات. میدیا کە ژازونی مێردی ئەوی تەرك کردووە، دەکەوێتە بیری تۆڵە ئەستاندنەوە. گلۆسە-ی ماشوقەی تازەی شووەکەی دەرمانخوارد و ئەو دوو مناڵەی خۆی کە لە ژازون- بوونی دەکوژێ و پاشان جەنازەکانیان دەخاتە بەردەمی مێردەکەی. لەم شانۆنامەیەدا سیمای میدیا کە لە نێوان مەنگەنەی خۆشەویستی منداڵەکانی و نەفرەت لە بابی منداڵەکانیدا گیرۆدە

بووە، وەستایانە وێنە گیراوە و بەرجەستە کراوە. یوریپیدس لە کۆتایی شانۆنامەکەدا دیمەنێکی دڵگیر و سەیر دەخوڵقێنێ، میدیا بە گالیسکەیەك کە چەند ئەژدیهایەکی باڵدار رایدەکێشن بەرەو ئاتین هەڵدێ.

**هیپولیتوس یان هیپولیت (٤٢٨ی پێش ز):**

ئەمە پاشماوەی تترالوجییە کە خەڵاتی پێ براوە (سێ بەشەکەی تری لە بەین چوون) ئەم بەرهەمە کاری کردۆتە سەر نووسەرانی وەکو: ئوڤید، سنکا، راسین، و دانونزیو. بابەتی شانۆنامەکە بریتییە لە میانڕەوی لە ئەڤینداری و زاڵبوون بەسەر هەست و سۆزی خۆدا. تزەیوس و فەدرا لە هەڵچوونیاندا ئەوپەڕی توندڕەوی دەنوێنن، و هیپولت ئەوپەڕی توندڕەوی نیشاندەدا. کاتێ هیپولت-ی کوڕی تزەیوس، ئەشقی فەدرای ژنی بابی رەت دەکاتەوە، فەدرا دەست بە خۆکوژی دەکات و لە یادداشتێکدا کە بۆ تزەیوس-ی بەجێ دێڵێ هیپولت بەوە تاوانبار دەکات کە دەست درێژی کردۆتە سەری. هیپولت بە دەستی پوزیدون و لەسەر داوای تزەیوس، کە زۆر درەنگ پەی بە حەقیقەتەکە دەبات، دەکوژرێ.

**هەرکولی تووڕە (دەوروبەری ٤٢٢ی پێش ز):**

شانۆنامەیەکی سیاسییە کە بەڕێز و شکۆوە باسی ئاتین وەکو بە هەشتی بەدبەختان و دوور خراوان دەکات. ئەم شانۆنامەیە هەر چەندە تاڕادەیەك لە ئاستێکی نزمدایە، بەڵام لە باری تۆژینەوەی رەنج و ئازایەتییەوە بایەخی جیهانی هەیە. هەرکول، داگیرکەر دەکوژێ و بە خۆشی لە ئەنجامی ئەو کارەوە دووچاری شێتی دەبێ. تزەیوس بۆ ئاتین —ی دەبات و هەرکول لەوێندەر پاك دەبێتەوە و دێتەوە سەرخۆ.

**یون (دەوروبەری ٤١٧ی پێش ز):**

ئەم بەرهەمە میلودرامایەکە کە لەسەر بناغەی هاڕ وژاندن رۆنراوە. ئەم شانۆنامەیە هەوڵێکە بۆ ئەوەی کە یونییەکان بە وەجاخی خودایان بژمێرێ و خزمایەتییان لەگەڵ یونانیانی ئاتیندا نیشان بدات. زیاتر هەست دەوروژێنێ تا تراجیك بێ. بەڵام حاڵەتی چاوەڕوانییەکی جوان لەلای تەماشاڤان چێدەکات.

یون-ی کوڕی کریوزاو ئاپولون نزیکە بە دەستی دایکی بکوژرێ. دایکی وا بیردەکاتەوە یون لە مێردەکەی ئەم و ژنێکی دیکەیە. ئاپولون لە کاتی خۆیدا ناسنامەی یون کەشف دەکات و رزگاری دەکات.

### ژنانی تەروا (٤١٥ی پێش ز):

شانۆنامەیەکی زۆر بە هێزە، پلۆتێکی سادەی هەیە بە روونی و رەوانی و بێ ج پێچ و پەنایەك، بەلاّ و موسیبەتانی تەروا دێتە ریّی هکاب، کە ئەمە تاقە رەگەزە کە یەکێتیی بە شانۆنامەکە دەبەخشێت.

### ئیلیکترا (دەوروبەری ٤١٣ی پێش ز):

ئەم تراجیدیایە لەگەڵ کویفور-ی ئاسخیلوس و ئیلیکترای سوفوکلیسدا یەك هاماج و یەك کەش و هەوای هەیە. یورپیدس لەم شانۆنامەیەدا لە چاو ئاسخیلوس و سوفوکلیسدا واقیعی ترە و کەمتر ئاوڕی لە لایەنە قارەمانیەکان داوەتەوە، بەلاّم بونیادی پلۆتی شانۆنامەکەی ئەو بالاّتر و لۆجیکی ترە.

چارەسەری نابەجێی ئورپیدس بۆ مەسەلەی گوناه ئەمەیە کە کیلی تمنسترا شایستەی مەرگ بووە، بەلاّم نەدەبوایە جەلادەکەی ئەو ئورستیس بوایە. کاراکتەرسازی یورپیدس لە ئیلیکترادا، فەرقێکی زۆری هەیە لەگەڵ بەرهەمێن ئەو دوو شاعیرەدا.

### ئیڤی چینی لە تاوریس دا (دەوروبەری ٤١٤ی پێش ز):

شانۆنامەیەکی رۆمانتیکی، پڕ هەست و سۆز و کاریگەرە و زۆر نزیکە لە میلۆدراماوە. ئەرەستۆ لە (هونەری شیعر)ەکەی خۆیدا زۆر ستایشی ئەم شانۆنامەیە دەکات. ئیڤی چینی کیژی ئاگامەمنون، لە نێو ئەو کەسانەدا کە بۆ قوربانی بەو دەسپێردرێن، ئورستیس-ی برای دەناسێتەوە. ئیڤی چینی رزگاری دەکات، و بە جووتە لە تاوریس هەڵدێن و بۆ ئارگوس دەگەڕێنەوە. ئەم شانۆنامەیە باسی داب و نەریتی پەرستنی ئارتیمیس"٢٥" دەکات. لەڕووی چێکردنی حاڵەتی چاوەڕوانی لە لای تەماشاڤان زۆر بەرز و بالاّیە و کوتاییەکی خۆشی هەیە. ئەم شانۆنامەیە کاریگەری بەسەر زۆر نووسەری وەکو: ناڤیس، راسین، گلوك، گوتە، شلگل، کەسانی دیکەوە هەبووە.

### هیلین (٤١٢ی پێش ز):

میلودرامایەکە لەسەر بنەمای ئەفسانەی ناردنی هیلین بۆ تەروا رۆنراوە.. پلۆت و نەخشەی شانۆنامەکە زۆر لە پلۆتی (ئیڤی چینی لە تاوریس) دەچێت. ئەم شانۆنامەیە کە دەخرێتە بەر رامان، دەبینی کە هێرش دەکاتە سەر جەنگ، و فاڵ و باوەڕبوون بە پێشبینی. رەگەزی پێکەنیناوی، وەکو ئەوەی کە لە کۆمیدی تازەدا هەیە، لەم بەرهەمەدا فرەیە.

## ژنانی فینیقی (دەوروبەری ٤٠٩ی پێش ز):

شانۆنامەیەکی عەوام پەسندە کە حیکایەتی نەمانی بنەماڵەی ئودیپ دەگێڕێتەوە. پلۆتی شانۆنامەکە بریتییە لە جەنگی پۆلونیکس و ئیتوکلیس. سێبەر و کاریگەری ئەم شانۆنامەیە بەسەر ئاکسیوس، سنکا، راسین، شیلر و شانۆنامەنووسانی دیکەشەوە دیارە.

## ئورستیس (٤٠٨ی پێش ز):

شانۆنامەیەکی جوان و دلگیرە، لەرووی بابەتەوە لە ئومەندس-ی ئاسخیلوس دەچێت، بەڵام لەرووی تۆنی دیالۆگەکان و هەڵسوکەوتی ئەکتەرەکانەوە جیاوازیی زۆری لەگەڵ درامای ئاسخیلوسدا هەیە، کار و جوڵە لە شانۆنامەی ئورستیسدا تارادەیەك لاوازە، گرێ ڤەبوونی کۆتایی چیرۆکەکەش نابەجێ دێتە بەرچاو بە هەر حاڵ ئورستیس لاسایی کردنەوەیەکی دیکەی شانۆنامەکانی تری ئورپیدس-ە، بە تایبەتی ئیلیکترا، میدیا، ئیڤی چینی لە تاوریس.

## فیداییانی دیونوسوس (دەوروبەری ٤٠٥ی پێش ز):

ئەم شانۆنامەیە کە پاش مەرگی ئورپیدس دەرهێنراوە تراجیدیایەکی بەهێزە، و بەرای گوتە و مکولی، یەکێکە لە جوانترین دراماکانی ئورپیدس. چیرۆکی شانۆنامەکە یەکێکە لە کۆنترین بابەتێن تراجیدی: سزای پانتەیوس-ی بێ باوەڕ، بە دەستی دیونوسوس، مینادەکان[٢٦] و (ژنانی پاسەوان و فیدایی دیونوسوس) ئاگاڤە، دایکی پانتویوس، لە جیهانی مەستی و بێ ئاگاییدا بەدەنی پانتەیوس پارچە پارچە دەکەن. شەرح و شرۆڤەی شانۆنامەکە دژوارە.

جوانترین دیمەنێن شانۆنامەکە بریتیین لە:

١- هاتنی ئاگاڤەی سامگرتوو بۆ سەر شانۆ بە گورزێکەوە کە سەری منداڵێکی بە سەرەوەیە.

٢- خەمباری ئاگاڤە پاش مەستی و بە هۆش هاتنەوە.

## ئیڤی چینی لە ئاولیسدا (دەوروبەری ٤٠٥ی پێش ز):

ئەم شانۆنامەیە تەواو نەبووە، چونکە ئورپیدس بە سەریا مردووە، ئەم کارە لەگەڵ شانۆنامەی (فیداییانی دیونوسوس)دا دەرهێنراوە، میلودرامایەکی رۆمانتیکی و پڕ جۆش و خرۆشە.

حیکایەتی شانۆنامەکە بریتییە لە بە قوربانی کردنی ئیڤی چینی بە دەستی ئاگامەمنون، تا پایەکانی سەر بە ئاولیس هەڵبکەن و کەشتیگەلی یۆنانی بەرەو تەروادە بڕانن. کۆتایی شانۆنامەکە لەگینە رزگاری ئیڤی چینی بووبێ کە بە دەستی ئارتیمیس ئەنجام دراوە، ئورپیدس لەم درامایەدا وێنەیەکی زیندووی قارەمانێکی ژن نیشاندەدات. سەربهووردی ئیڤی چینی ئیلهام بەخشی راسین، گلوك، شیلر بووە.

**ریزوس:**

دانەر و مێژووی دانانی ئەم شانۆنامەیە دیار نییە. پێدەچێت بە هەڵە درابێتە پاڵ ئورپیدس. سەرچاوەی شانۆنامەکە، کتێبی دەیەمی ئیلیادەیە کە بەشێوەی شانۆنامە ئامادەکراوە. ئودیسیوس و دیومیدس "٢٧" بە هاوکاری ئاتینە بە دزییەوە خۆ بە ئۆردوی تەروادا دەکەن و ریزوس-ی هاوپەیمانی تراکییەی تەروادە دەکوژن. ئەم شانۆنامەیە لاوازترین تراجیدی یونانییە، نە کەسایەتییەکی تراجیدی هەیە و نە هونەر و شێوازێکی ناسك و زەریفی هەیە.

**سیکلۆپەکان (دەوروبەری ٤٢٣ی پێش ز):**

تاقە شانۆنامەی ساتیریکە (تەوسنامێز).

چیرۆکی سیکلۆپەکان لاسایی کردنەوەیەکی هەجونامێزی بەسەرهات و واریقاتی پولوفیموس-ە، کە بە دەستکارییەکی زۆرەوە لە کتێبی نۆیەمی ئودیسەی هۆمەرەوە وەرگیراوە. ئەم شانۆنامەیە پڕاوپڕە لە شۆخی خۆش و ناخۆش.

**بیروبۆچوونەکانی ئورپیدس:**

ئورپیدس وەکو هزرڤانێك زۆر پێش زەمانی خۆی کەوتبوو، لە باری بۆچوونی ئایینی و مەزهەبییەوە ئەگەرچی کافر نەبوو بەڵام لەبەر رۆشنایی ئەقڵ و ئەخلاقدا، بەتوندی ئیراد و رەخنەی لە خواوەندان دەگرت، بە ئارەزووی خۆی دەستکاری ئەفسانەی خودایانی دەکرد و دەیگۆڕین، گاڵتەی بە قارەمانانی تەقلیدی دەکرد، و هێرشی دەکردە سەر باوەڕێن پڕوپوچ و فاڵ و پێشبینیان. ئەگەرچی بە تەواوی لە سیاسەت دوور بوو، بەڵام هەستی دەکرد دیموکراسی ئاتین لە سەردەمی ئەودا کەوتۆتە گومڕایی و لە ژێر دەسەڵاتی ئورستۆکرات و دەوڵەمەندان دایە. ئورپیدس بە تەماو بە هیوای دیموکراسییەك بوو کە لەسەر پایەی ئەقڵ و لێهاتوویی و راستگۆیی رۆنرا بێ. سیاسەتی دەرەوە بەلای ئەوەوە بریتی بوو لە بەرەڤانی لە ئاتین لە هەنبەر دوژمناندا، لێ بە دەگمەن باسی کاروباری سوپایی دەکرد، زۆربەی کات هێرشی دەکردە سەر جەنگ و بە بەلا و نسیبەتی موتلەقی دەزانی.

تەوەر و بناغەی تیۆری و بۆچوونی ئەخلاقی ئەو بریتی بوو لە بایەخی سروشت و تەبیعەتی هەر تاکێك، و ئیحتوباری ئەقلانی و ئەخلاقی ئەو تاکە. ئورپیدس هاوسۆزی دەگەڵ هەژاراندا دەکرد بەڵام باوەڕی بە جەماوەری خەڵك وەکو چینێکی تایبەتی نەبووە، روانینی وی دەربارەی ژن روون و ئاشکرا نییە، بەڵام وا باوە کە گوایە لە ژنان دووره پەرێز بووە. ئورپیدس هەر بە تەبیعەت ئادەمیزادێکی رەشبینە. هیچ شتێك زامنی بەختەوەری

نییە، بۆ وێنە ئارمانجێن مەعنەوی ئەشق، منداڵ، یا تەنانەت نەبوونی منداڵیش، هیچیان زامنی بەختەوەری نین. ئەرەستۆ لە کتێبی هونەری شیعردا (فەسڵی سیازدەیەم) ئورپیدس بە تراجیدی ترین شاعیر ناو دەبات.

**شێواز و مامەڵە:**

شانۆنامەکانی ئورپیدس ئاوێتەیەکە لە کۆن و نوێ، لە لایەکەوە پابەندی پرەنسیپ و ڕێچکە کۆن و باوەکان و لەلایەکی ترەوە روو لە داهێنان و تازەگەرییە، و لە زۆر بەرهەمیدا ئەوەندە گوێ بە رەچاوکردنی قاڵب و شێوە تەقلیدی و باوەکان نادات. فۆرمگەرایی ئورپیدس لە دەسپێکی شانۆنامەکان، لە پرسیار و وەڵامی دوو نەفەری، هاوسەنگی دیالۆگ و هەندێ جار سوود وەرگرتن لە گرێ کردنەوە بە دەستی خودایان-دا بەرجەستە دەبێ.

ئورپیدس بۆ دەربڕینی تێورییە تازەکانی گۆڕینی زۆری هونەرە کۆنەکان بە پێویست دەزانێ. رەنگە دیارترین گۆڕانکاری لە کارەکانی ئەودا لە کاراکتەرسازیدا بێ. ئەو دەست لە وێنەگرتنی پیاوان و ژنان بە شێوەیەکی نیمچە خودایان و پاڵەوانانی بە تەبیعە لە مرۆڤ بالاتر هەڵدەگرێ و لە جیاتی ئەوە کاراکتەرانی مرۆڤانی تر و نزیك لە عەوامی خەڵك وێنە دەگرێ و دەخولقێنێ.

سوفوکلیس دەڵێت کە ئەو بە خۆی خەڵکان بە کەیفی خۆی وەکو چۆنی بوێن ئاوا وێنە دەگرێ، بەڵام ئورپیدس وەکو چۆن هەن ئاوا وێنەیان دەگرێ. ئورپیدس دەروونناسێکی باڵا دەست و بە دەسەڵاتە، بە تایبەتی لە وەسف کردن و وێنە گرتنی ژناندا- هەم ژنانی نەجیب و هەم ژنانی هەرزە.

ئورپیدس لەواری پلۆتی شانۆنامەشدا خاوەنی کۆمەڵێك داهێنان و تازەگەرییە، لە دراماکانی ئەودا نێوەڕۆکی سۆزداری و پڕ جۆش و خرۆش، میلودراما و کاریگەری بێ ئەندازە بە زۆری جێگەی سادەیی و ساکاری بەرهەمەکانی ئاسخیلوس دەگرێتەوە.

ئورپیدس لەزەت لە وەسفکردنی شێتایەتی و دەستێوەردانی خواوەندان لە گرێ کردنەوە بە مەبەستی چێکردنی ترس و دڵەراوکێ لای تەماشاڤانان دەبینێ. سوود لە منداڵانیش بۆ هاروژاندنی هەست و سۆز وەردەگرێ. پلۆت و نەخشەی شانۆنامەکانی لە چاو ئەوانەی پێش خۆیدا ئاڵۆزتر و پڕ پێچ و پەناترە، ئەمەش پلۆتی شانۆنامەکانی یورپیدس دەخاتە خانە و ریزی باشترین پلۆتێن سوفوکلیس-ەوە، هەر چەندە هەندێ جار بێ دەوامە، بە دەگمەن چارەنووس و قەدەر دەکات بە پلۆت و هەوێنی شانۆنامە.

ئورپیدس لە بایەخی گرووپی کوراڵ کەم دەکاتەوە و لە واری پراکتیکیدا پەیوەندی سەرەکی گرووپی کۆراڵ لە رووداوانی شانۆنامەکە جیا دەکاتەوە. زۆر وەستایانە دیمەن ئارایی، جلوبەرگ

و کەرەستەی شانۆ ئامادە دەکات. زۆر سوود لە شۆخی و نوکتە دەبینێ و زمانی سادە و واقیعی و هەندێ جار لەڕووی پێوەرێن رەوانبێژییەوە جوان و رەوانە.

**کورتەیەکی رەخنەکان:**

ئورپیدس شانۆنامەنووسێکە کە تایبەتمەنییە ناکۆکەکانی زۆر لە ئاسخیلوس و سوفوکلیس زیاترە. بەلای رەخنەگرانەوە تراجیدیەکانی ئەو هەم لایەنی ئیجابی و هەم لایەنی سەلبیان تێدایە، واتە هەم ستایش هەڵدەگرن، هەم زەم.

نێوەڕۆکی شانۆنامەکانی هەندێ جار سواوە و هەندێ گاڤ پەیوەستن بە شوێن و کاتی تایبەتەوە، بەڵام بە شێوەیەکی گشتی زەمینە و هاماجی شانۆنامەکانی سەروساخت لەگەڵ ژیانی رۆژانەدا پەیدا دەکەن و گشتگیرییەکی جیهانیان هەیە. هەر چەندە هەندێ لە کاراکتەرانی یەکم لە بەرهەمەکانیدا رەهەندی قارەمانیان نییە، بەڵام زۆربەی هەرە زۆریان مرۆڤن، حاڵەتی هەستەوەری، پڕ سۆز و گودازی و میلۆدرامی بەرهەمەکانی یورپیدس مایەی ئیراد و عەیبگیری ژمارەیەك لە رەخنەگرانە بەڵام زۆری دیکەش ستایشی دەکەن، پلۆتی هەندێ لە شانۆنامەکانی لەڕووی هۆکارەوە لاوازە، بە تایبەتی پەنا بردنە بەر خودایان بۆ گرێ کردنەوە، بەڵام پلۆتی هەندێ لە شانۆنامەکانی بونیادێکی مکوم و وەستایانەی هەیە، و شێوەی گرێدان و گرێچن لە رووداوەکاندا یان کردنەوەی گرێیەکان بە یارمەتی و کۆمەکی خودایان بە مەبەستی چێکردنی کاریگەری نمایشی، سەرکەوتووانە ئەنجام دەدرێ. ئەنجام شرۆڤەکاران رەخنەی ئەوە لە ئورپیدس دەگرن کە زمانەکەی قوڵ نییە، بەڵام بە دەگمەن رەخنەگرێك پەیدا دەبێ کە بتوانێ نکۆڵی لە سادەیی و راشکاوی و روونی و رەوانی زمانی وی بکات.

## بەراوردی نێوان ئاسخیلوس و سوفوکلیس و ئورپیدس

| ژ | ئاسخیلوس | سوفوکلیس | ئورپیدس |
| --- | --- | --- | --- |
| ١ | یەکەمین شانۆنامەنووسی گەورەیە | دووەمین شانۆنامەنووسی گەورەیە | سێیەمین و دوا تراجیدیانووسی گەورەیە |
| ٢ | زیادکردنی ئەکتەری دووەم | زیادکردنی ئەکتەری سێیەم | |
| ٣ | داهێنانی شانۆنامەی سێ بەشی | دەست هەلگرتن لە شانۆنامەی سێ بەشی پەیوەستە | |
| ٤ | کەمکردنەوەی ژمارە و بایەخی گرووپی کۆراڵ | جێگیرکردنی ژمارەی گرووپی کوراڵ لە سنووری پازدە کەسدا و کەمکردنەوەی پتری بایەخی گرووپی ناوبراو | کەمکردنەوەی زیاتری بایەخی گرووپی کۆراڵ و بڕینی پەیوەندییان بە کارو جوڵەی نمایش |
| ٥ | سوودوەرگرتنی کەم لە دیمەن نارایی | داهێنانی نیگارکێشی دیمەن و شانۆ | زیادکردنی دیمەن و شانۆنارایی جل وبەرگ و کەرەستەو پێویستییەکانی شانۆ |
| ٦ | دەربارەی خودایان و قەدەر و چارەنووس دوودڵی ڕەوا نییە، ڕەنج و زەحمەت زادەی گوناهەو گوناه میراتییە ڕەنج مرۆڤ ناقڵ دەکات | خواوەندان دادپەروەرن بەڵام بایەخێکی ئەوتۆیان نییە. چارەنووس حەتمییە. ڕەنج هەندێ جار (نەك هەمیشە) زادەی گوناهە. گوناه میراتییە، گوناه مرۆڤ ناقڵ دەکات | خواوەندان بە زۆری نا ئەخلاقی و زۆردارن. ژیان مسیبەتبارە، ژیان مسیبەتبارە، بەڵام لە بنەڕەتدا ئەنجامی ململانێی مرۆڤ لەگەڵ تەبیعەتی خۆی دایە. |
| ٧ | کەسایەتی شانۆنامەکان باڵان، لە میانەی نمایشدا نەشونما و گەشە ناکەن | کەسایەتی شانۆنامەکان لە خەڵکانی واقیعییەوە نزیکترین، بەڵام هێشتا هەر باڵان، دەروونشیکاری بەرزە. کەسایەتییەکان گەشە دەکەن، و خالی بەرانبەر یەکن | کەسایەتی شانۆنامەکان مرۆڤی ئاساین. نەشونمایان زۆرە. دەرونشیکاری بەرزە، بە تایبەتی لە وێنەگرتن و وەسفی ژناندا. جەخت لە سەر تاك دەکرێتەوە. |

| ٨ | پلوتەکان سادەن، جوڵە کەمە، بەردەوامی هەندێ جار نوقستانە، سوودی کەم لە شێوەی گرێکردنەوە بە دەستی خودایان | پلۆتەکان ئاڵۆزترن، جوڵە زۆرترە، هۆکار و پەیوەستەکی بەرز، سوودوەرگرتن لە گرێکردنەوە بە یارمەتی خودایان | پلۆتەکان یەجگار ئاڵۆزن، جوڵە هەندێجار توندو پڕخرۆش و پڕ هەستە. بونیادی شانۆنامە هەندێجار ستە، هۆکارو لاوازە، سودوەرگرتن لە شێوەی گرێکردنەوە بە دەستی خودایان لە دوازدە شانۆنامەدا. |
|---|---|---|---|
| ٩ | زمان بتەو، شکۆدار،و هەندێ جار ئاڵۆزە | زمان ئەرستۆکراتی، بتەو و روون | زمان سادە، راستەوخۆو رەوان |
| ١٠ | سوود وەرگرتنی کەم لە تەنزی دراماتیکی | سود وەرگرتنی زۆر لە تەنزی دراماتیکی | هەندێ جار سوود وەرگرتن لە تەنزی دراماتیك و هەندێجار لە نوکتە |
| ١١ | بابەتەکان کەمتر بابەتی رۆژن، تەنیا یەك شانۆنامە (ئێرانییان) دەربارەی رووداوەکانی رۆژە | سوودوەرگرتنی کەم لە بابەتێن رۆژانە یا سوود وەرنەگرتنی تەواو | زۆربەی شانۆنامەکان دەربارەی بابەتی باوی سەردەمن: شەرحی جەنگ و سیاسەتی رۆژە |
| ١٢ | بێ گاڵتە و شۆخی | گاڵتە و شۆخی کەم | گاڵتەو شۆخی زۆرو هەبوونی دیمەنی تەواوی پێکەنیناوی |
| ١٣ | ناوداری عەسری خۆیەتی. سیازدە خەڵاتی یەکەمی پێشبڕکییانی بردۆتەوە | ناوداری زۆر گەورەی عەسری خۆیەتی، خاوەنی ٢٤ خەڵاتە | تا رادەیەك لە رۆژگاری خۆیدا گومناو بووە، خاوەنی تەنیا ٤ خەڵاتە. بەڵام لە سەردەمانی پاش خۆیدا، زۆر لەو دووانەی دی پتر کاریگەری بەسەر درامای لاتینی و درامای کلاسیکی فەرەنساوییەوە هەبووە. |

# کۆمیدیای کۆن

## سەرەتا و سەرهەڵدان:

سەرەتا و گەشەکردن و پەرەسەندنی کۆمیدیای یۆنانی بە تەواوەتی دیار نییە. بە گوێرەی بۆچوونی ئەرەستۆ کۆمیدیا درەنگ هاتۆتە ئاراوە، و یەکەمین ئەکتەرانی کۆمیدیاش خەڵکانێکی خۆبەخش بوونە، دیار نییە کە چ کەسێك دەمامك و دەروازەی هێناوەتە ئاراوە و چ کەسێك ژمارەی ئەکتەرانی زیاد کردووە. بە رواڵەت کۆمیدیا لە دوو سەرچاوەوە هەڵدەقوڵێ. یەکەم: کوموس-ی ئاتینی (رەگ و ریشەی وشەی کۆمیدی) یا ئاوازی شادمانی بۆدیونوسوس، کە لە بۆنە جۆراوجۆرەکاندا خوێندوویانە. کوموس بە تایبەتی لە دوو جەژنی گەورەی ساڵانەدا، واتە جەژنی لنیی لە مانگی ژانویەدا، و دیونوسیای شار (جەژنانی تایبەت بە دیونوس) لە هەیڤی مارسدا، خوێنراوە و گوتراوە. ئەم ئاوازو گۆرانییانە پتر پاڕانەوە بووە بو دەفعی بەڵا، یان دوعای بەرەکەت بوونە، ئەکتەران جلوبەرگی سەیر و غەریبیان لەبەر دەکرد و بە کۆمەڵ بە دەوری شاردا دەگەڕان، لە حاڵی هەڵگرتنی نیشانەکانی فالیکدا"٢٩" ، گۆرانییان بۆ دیونوسوس دەچڕی و وشە و دەستەواژەی بازاڕی و پڕ تەوس و توانجیان بە تەمەشاڤان دەگوت، پاشان ئەکتەران دەبوون بە دوو دەستەوە و وەڵامی یەکتریان دەدایەوە. دووەم: دووەم سەرچاوەی کۆمیدیا بریتی بووە لە دەمەلاسکێ و لاسایی کردنەوە یا نمایشی خەندەداری سیسیلی کە بە شێوەیەکی گشتی بۆ پێکەنیناندنی ئامادەبووان بووە، دیارە روون نییە کە چ کەسێك کوموس و ئەدا و دەمەلاسکێ و لاسایی کاری سیسیلی بۆ ئەنجامدانی هەوەڵین کۆمیدیاکان بەکار هێناوە. ئەوەی دەگێڕدرێتەوە ئەوەیە کە ئەم کۆمیدیایانە یەکەمین جار لە شاری میگارا، یان ئاتیندا ئەنجامدراون.

## دیمەنسازی و دەرهێنان:

کۆمیدیای یۆنانی لەرووی دیمەنسازی و شانۆسازی و دەرهێنانەوە زۆر لە تراجیدیای یۆنانی دەچێت. لە جەژن و بۆنەکاندا، پاش هەر شانۆنامەیەکی تراجیدی، پێنج کۆمیدیای پێنج نووسەر نمایش دەکرا و خەڵات بۆ باشترینیان تەرخان دەکرا، ئەکتەرەکان سوودیان لە دەمامك و پێڵاوی پاژنە نزم وەردەگرت. گرووپی کۆراڵ لە ٢٤ پیاو پێك دەهات کە زۆربەیان جلوبەرگی سەیر و سەمەرەیان لەبەر دەکرد.

## ئاریستوفانس (٤٤٨- ٣٨٥ی پێش ز):

گەورەترین کۆمیدیانووسی یونانییە. لە بنەماڵەیەکی سەنگین و ئابڕومەند، لە دەوروبەری ئاتین هاتۆتە دنیاوە. زۆر زوو روویکردە نووسینی کۆمیدی، یەکەم بەرهەمی لە ساڵی ٤٢٧ی پێش ز دا نمایش کراوە. رەنگە وەکو ئەکتەر لە چەند شانۆنامەیەکی خۆیدا بەشداری کردبێ.

**بونیادی کۆمیدیاکانی ئاریستۆفانس:**

بونیادی کۆمیدیاکانی ئاریستوفانس یەجگار جۆراوجۆرن و پەیڕەوی هیچ نموونەیەك ناکات. ئەگەر چاوپۆشی لە وردەکارییەکان بکەین دەتوانین بڵێین شانۆنامەکانی ئاریستوفانس دوو بەش لەخۆ دەگرن: لە بەشی یەکەمدا (ئەندێشەی شاد ) دەخرێتەڕوو، و لە بەشی دووەمدا ئەم ئەندێشەیە ئەنجام دەدرێ. بەشە سەرەکییەکانی ئاریستۆفانس بریتیین لە:

١- سەرەتا و دەستپێك، کە باسی ئەو ئەندێشە شادە یان هزرە هۆشمەندانەیە دەکات کە لە زەینی ئەکتەردا گەڵاڵە بووە، ئەم ئەندیشەیە عادەتەن نابەجێ و ناواقیعییە.

٢- رێگە، یەکەمین ئاوازی گرووپی کۆراڵە لە کاتی هاتنە سەر شانۆ.

٣- ململانێ، باسێکە لە نێوان لایەنگرانی پلۆتی شاد و نەیارانی پلۆتی شاد، هەمیشەش لایەنگران سەردەکەون.

٤- گۆرانی بە کومەڵ، کە گرووپی کۆراڵ لە پشووی نێوان پەردەکانی شانۆدا بەرانبەر تەماشاڤانان دەیخوێنن و دەربڕی بۆچوونەکانی نووسەرە.

ئەم گۆرانییە دەستەجەمییە عادەتەن لە نێوان ململانێ و پاشماوەی کۆمیدیادا ئەنجام دەدرێ، لێ هەندێ جار لە کۆتایی شانۆدا دەخوێنرێ.

٥- رووداوی تێهەڵکێش، زنجیرە رووداوێکە کە لە دوای گۆرانی دەستەجەمییەوە دێت و ئەندێشەی شاد وێنە دەگرێ و بەرجەستەی دەکات، ئەم واریقاتە تێهەڵکێشانە هەندێ جاریش لە یەکتر جیان و سەربەخۆن.

٦- مەقام، ئەو گۆرانییە لیریکییە دەستەجەمییانەیە کە لە نێوان دوو رووداوی تێهەڵکێش دەخوێنرێن.

٧- دەرچوون، دوا سروودی گرووپی کۆراڵە لە کۆتایی شانۆنامەدا. هەر شانۆنامەیەکی کۆمیدی چەندین گۆرانی و سروودی جدی یان پێکەنیناوی لەخۆ دەگرێت.

**بەرهەمەکانی:**

ئاریستوفانس نزیکەی چل شانۆنامەی کۆمیدی نووسیوە. کە تەنیا یازدە دانەیان ماوەتەوە، لەوانە:

**ئاخارنەییەکان (٤٢٥ی پێش ز):**

ئەمە کۆنترین شانۆنامەی کۆمیدییە، و لە پێشبڕکێیەکانی ئاتین خەڵاتی یەکەمی پێدراوە، تیمەی شانۆنامەکە بریتییە لە داواکردنی ئاشتی لەگەڵ ئەسپارتەدا، و لاسایی

کردنەوەیەکی هەجونامێزی لایەنگری یوریپیدسە لە جەنگ (رۆڵەکانی هەرکول و ئاندروماك).
لەم کۆمیدیایەدا پێشەوای ماندوو و بێتاقەت لە جەنگی ئاتین کەلکەڵەی ئەوەی دەکەوێتە سەر کە بە دزییەوە سوڵح لەگەڵ ئەسپارتەدا بکات، بەڵام رووبەڕووی نارەزایی توندی جەنگخوازان دەبێتەوە.

ئارخانییەکان شانۆنامەیەکی جوانە و گەلێك دیمەنی دلگیری تێدایە (وەکو فرۆشتنی کیژانی برسیی میکارایی، یان گۆرانی و هەلپەرکێ لە ئاهەنگ و جەژنی دیونوسوس لە کۆتایی شانۆنامەکەدا). ئەم شانۆنامەیە لەرووی هارووژاندنی هەستەوە، شانۆنامەیەکی یەجگار بەهێزە.

**دلاوەران (٤٢٤ی پێش ز):**

براوەی خەلاتی یەکەمە، بابەتی شانۆنامەکە هەجوی تەرەفدارییە لە دیموکراسی. باسی ئەو گەندەلّییەیە کە لە پرێکا رەگ و ریشە لە هەموو شوینێ دادەکوتێ و رابەرانی گەندەڵ یەك لە دوای یەك دەفەوتێنێ. لەم کۆمیدیایەدا جارێکی دیکە داوای ئاشتی و مەسلەتی نێوان ئاتین و ئەسپارتە دەخرێتەروو. "ئەندێشەی شاد": نیسیاس "[٣٠]" لێدەبڕێ بە عەوام خەلەتێنی و نێرەنگێکی زۆرتر لە کلێون "[٣١]" ببێ بە جێگری ئەو. ئەم شانۆنامەیە، کۆمیدیایەکی تاڕادەیەك ناقەتبەرە، بەلام لە دیمەنانی دلگیر، پشکنینی وردی پێگە و پایەی سیاسی، و تەنزی بەهێز بەدەرنییە.

**هەوران (٤٢٣ی پێش ز):**

ئەم کارە دەستکاری کراوە و دارێژراوەتەوە. بابەتی شانۆنامەکە گاڵتەکردنە بە سوکرات و سوفستاییەکان. "ئەندێشەی شاد": ستریسیادس-ی ساویلکە لە دەستبلاوی کورەکەی بێ تاقەت دەبێ و بریاردەدا کە بینێرێ بۆ قوتابخانەکەی سوکرات تا فێری هونەری ئەنجامگیری و بەلگەهێنانەوە ببێ و بتوانێ بە باس و گەنگەشە لە چنگی خودان قەرزان رزگار بێ، هەوران بە ناودارترین و کاریگەرترین کۆمیدیای ئاریستوفانس دێتە ژماردن. چوار دیمەنی سەرەکی و یەك ململانێی لەخۆ گرتووە. بونیادی تان و پۆی شانۆنامەکە شاشە. رەنگە ئەم شانۆنامەیە دەوری لە توندرەی عەسەبییەتی ئاتینییەکاندا هەبووبێ، کە بووە مایەی مەحکومیەتی سوکرات.

**زەردەزیران (٤٢٢ی پێش ز):**

ئەم شانۆنامەیە باسی پەرۆشی شێتانەی یونانییەکانە بۆ بوونە ئەندام لە هەیئەتی دادوەریدا- ئەو پەرۆشییە شێتانەیەی کە زیادکردنی هەقدەستی ئەندامانی هەیئەتی نێوبراو لەلایەن کلیون-ەوە دروستی کردبوو. "ئەندێشەی شاد": فیلوکیون-ی دۆستی کلیون، کە

پیرەمێردێکی بەدخووی دڵناسکە و مکوڕە لەسەر ئەوەی کە لە هەینەی دادەوەریدا کار بکات دەنا لە داخا دیق دەکات. کوڕەکەی کە لە سوور بوونی ئەو بێ تاقەت دەبێ دادگایەکی تایبەتی دادەنێ و بە مەحکەمەی سەگەکەی ماڵەوە، کە بە پەنیردزی تاوانبارە، سەرگەرمی دەکات. زەردەزیپران شانۆنامەیەکی خۆشە، بەڵام رەنگە لەبەر ئەوەی کە لەرادەبەدەر پابەندی بابەتە تایبەتییەکانی سەردەمی خۆیەتی، بۆ رۆژگاری ئەمڕۆ ئەوەندە مایەی سەرنج و پەسند نەبێ.

**<u>سوڵح (٤٢١ی پێش ز):</u>**

بابەتی ئەم شانۆنامەیەش بریتییە لە داوای سوڵح و ئاشتی لە نێوان ئاتین و ئەسپارتەدا، "ئەندێشەی شاد": تروگایوس لێدەبڕێ بچێ بۆ لای زیوس و داوای سوڵح و ئاشتی بکات. ململانێی دراماتیکی لەم بەرهەمەدا کەمە.

**<u>باڵندەکان (٤١٤ی پێش ز):</u>**

ناوەڕۆك و هەوێنی شانۆنامەکە ئیراد و رەخنە هەڵدەگرێ هەندێ لە لێکدانەوەکان گازاندەی ئەوە دەکەن کە ئەم کۆمیدیایە تەنیا نەخشەیەکی خەیاڵییە، شتێکی پێکەنیناوییە دەربارەی لەشکرکێشی سیسیلییە چاو چنۆك و تەمەعکارەکان، یان بەرگرییەکە لە شۆڕشێکی واقیعی یان گۆڕینی حکوومەت "ئەندێشەی شاد": دوو پیاوی بێزار لە ئاتین، دەکەونە گەڕان لە ژیانێکی نموونەیی لە سەرزەمین و وڵاتی باڵندانـدا، ئەم شانۆنامەیە لەڕووی وێنەسازی جوان، ناسکی خەیاڵ، پلۆتی بەرز و کاراکتەرسازییەوە زۆر بەجێزە. هیچ شوێنەوارێکی رەگەزێن کۆمیدیای میللی و عەوام پەسندی تێدا نابینرێ. بە شێوەیەکی گشتی بە شاکاری ئەریستوفان دادەنرێ.

**<u>ژنان لە تسموفوریا (٤١١ی پێش ز):</u>**

ئەم بەرهەمە لاسایی کردنەوەیەکی هەزەلیاتەکانی ئورپیدس و هەجووی ژنانی ئاتینە. "ئەندێشەی شاد": ئورپیدس پاش ئەوەی دەزانێ کە چەند ژنێك لە هەوڵی ئەوەدان باشترین تۆڵە لەو بکەونەوە بە هۆی ئاشکراکردنی خەوشی سێکسی وان، بێهودە هەوڵدەدا تا ئاگاتون"٣٢" کە تراژیدیانووسێکی دیکەیە، ناچار بکات کە خۆی بخاتە شێوەی ژنێکەوە و بەرەڤانی لە ئورپیدس بکات. لەم شانۆنامەیەدا بە مەبەستی شۆخی و تەوس و توانج لاساییەکی زۆری شێوازی ئورپیدس کراوەتەوە، زۆربەی ئەو رەخنانەی لەم بەرهەمە گیراون، دروست و بەجێن، بەڵام تاڕادەیەك زێدەڕەوییان تێدایە.

**لوسیسترات (٤١١ی پێش ز):**

ئاریستوفانس، لەم شانۆنامەیەدا جارێکی دی داوای ئاشتی و سولحی نێوان ئاتین و ئەسپارتە دەخاتەڕوو، "ئەندێشەی شاد": لوسیسترات کە لە رابەرانی ئاشتیخوازی ئاتینە، بۆ ئەوەی پیاوان مل بدەنە ئاشتی لەگەڵ ئەسپارتەدا، داوا لە ژنان دەکات کە کاری سێکسان لەگەڵدا نەکەن، یانی لەگەڵیان نەخەون. ئەنجام، ئەمە کۆمیدیایەکی جەماوەری پڕ هەرا و هەنگامە و لێوان لێوە لە بێشەرمی و پڕرووبی، ئەخشە و دارشتنێکی هونەرمەندانەی هەیە، ئەم کۆمیدیایە ئەمڕۆکە لە ریزی باشترین کۆمیدیاکانی ئاریستوفانس دایە.

**قورباقان (٤٠٥ی پێش ز):**

ئەم بەرهەمە براوەی خەلاتی یەکەمە. بابەت و تیمەی شانۆنامەکە رەخنەیە لە ئاسخیلوس، سوفوکلیس و بە تایبەتی ئورپیدس. هەروەها هێرشێکە بۆ سەر گەندەڵی سیاسی و ئەدەبی ئاتین. "ئەندێشەی شاد": دیونوسوس کە دەبینێ تراجیدیانووسان زۆر لاوازن لێدەبڕێ بچێ بۆ هادیس و تراجیدیانووسێکی شایستە بۆ ئەم دنیا بگەڕێنێتەوە. ئاریستوفانس لەم شانۆنامەیەدا ئاسخیلوس و ئورپیدس دەخاتە بەر رەخنەی لوژیکی، لێ لایەنگری ئەو لە ئاسخیلوس دیار و خوپایە، شانۆنامەی قورباقان دواهەمین و رەنگە جوانترین نموونەی کۆمیدیای کۆن بێ.

**ئەنجوومەنی ژنان (٣٩٣ ی پێش ز):**

ئەم شانۆنامەیە هەجویەکی تەبیعەتی بێ قەرار و کەلکەڵەی نوێخوازی ئاتینییەکانە. "ئەندێشەی شاد": ژنان بەڕا و تەگبیری پراکساگورای رێبەریان، خۆ دەکەن بە پیاو، کورسییەکانی پەرلەمان داگیردەکەن، و حکوومەتی دڵخوازی خۆیان دادەمەزرێنن کە لەو حکوومەتەدا ژن، مناڵ و سامان هاوبەشە. ئەم شانۆنامەیە لە چاو شانۆنامەکانی دیکەی ئاریستوفانسدا ناپوختەیە، هەندێ رەگەزی کۆمیدیای تازە و ناوەڕاستی تێیدا بەدی دەکرێت.

**پلوتوس (٣٨٨ی پێش ز):**

بابەتی شانۆنامەکە هێرشە بۆ سەر تیرەی بەشەر بەگشتی و ئاتینییەکان بە تایبەتی، کە لە پێناوی کۆکردنەوەی سەروەت و ساماندا پەناوەبەر شێوازی بێدادگەرانە و نزم دەبەن. "ئەندێشەی شاد": کرمولوس-ی قارەمانی هەژاری دەستکورت بەڵام شەریف و ئابڕومەند، داوا لە ئەسکلپیوس-ی خوای پزیشکی دەکات کە چاوانی پلۆتوس-ی خوای سەروەت و سامان بداتەوە تا بتوانێ جارێکی دی بەشێوەیەکی دادپەروەرانە سەروەت و سامانان دابەش بکاتەوە. ئەم شانۆنامەیە هەجویەکی گشتی و خۆشە، و تارادەیەك ناسکە و شۆخی و حەنەکچیاتییە

توندوتیژەکانی کۆمیدیاکانی پێشووتری ئاریستوفانس-ی تێدا نییە. ئەو گۆڕانکارییەی کە لە بونیادی شانۆنامەکەدا کراوە هەنگاوێکە بەرەو کۆمیدیای تازە (وەکو ئەو دیمەنەی کە کۆیلەیەك دەورێکی گرینگ دەبینێ).

**ئەندێشەکانی ئاریستوفانس:**

ئاریستوفانس کەسێکی موحافیزکار بووە و باوەڕی بەڕێزگرتنی کەلەپور هەبووە، لە زۆربەی هەرە زۆری کۆمیدیاکانیدا کەڵکەڵە و ئارەزووی ڕۆژە خۆشەکانی ڕابردوو ئاشکرایە و هەمیشە ئیعترازی لەسەر شتە نوێیەکانی وەکو داب و نەریت و مەزهەبی نوێ، فەلسەفەی نوێ، ئەدەبیاتی نوێ هەبووە. ئەو هەستی دەکرد هەر شتێك نوێ بێ لەوەیە بێهودە و بێ کەڵکیش بێ، بە کورتی دراماکانی وی ئیعترازێکە لەسەر گەندەڵی سەردەم و زەمانی وی.

**تایبەتمەندییەکانی کۆمیدیاکانی ئاریستوفانس:**

تایبەتمەندییە بەرچاوەکانی کۆمیدییەکانی ئاریستوفانس بریتییە لەوەی کە: بابەتەکانی بابەتی باوی ڕۆژ بوون، تەنزبێژی، ڕاشکاوی، بەدزمانی و جوێنـدان، تەوس و توانج، پلـۆتی سووك و تاڕادەیەك کەم بایەخ، وێنەگرتنی کاراکتەرەکان هەم بە شێوەی فەرد و هەم بە شێوەی نموونە، سوود وەرگرتن لە دوو جۆرە شیعری لیریکی: شیعری زیرەکانە و ئاسان و سووکی کۆمەڵایەتی، و شیعرێن لیریکی قووڵ و پڕ هەست و جوان، ڕوودانی کاری پێشبینی نەکراو و نەگونجاو، پەنابردنە بەر هەستێن وروژێنەر لە جیاتی پەیڕەوی کردنی ئەقڵ و لۆجێك، و ئەنجام ڕەچاو نەکردنی سێ یەکێتییە کلاسیکەکە و (یەکێتی کات، یەکێتی شوێن، یەکێتی کار) و پرەنسیپی حەقیقەت نمایی.

**کورتەیەکی ڕەخنەکان:**

هەر چەندە کۆمیدیاکانی ئاریستوفانس پڕن لە شۆخیی زۆر مەکشوف، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا مایەی پێکەنین و خۆشین، هەر چەندە ئاریستوفانس توندە تەبیعەتە و لە ڕەخنەگرتندا توند و بێ پەروایە و لەخودەگیریدا دەکەوێتە موبالەغەبێژی، بەڵام وێڕای ئەمەش قامك لەسەر کەم و کوڕی و کێماسییە واقیعییەکان دادەنێ. پلۆتی شانۆنامەکانی ئەگەرچی زۆربەی کات سست و نامەنتیقییە، بەڵام دەکرێ، هەمان پلۆتێن سست و لاواز وەکو قاڵبی دەربڕینی هەجوو شوخی بێژی وی قەبووڵ بکرێ و لە قەڵەم بدرێ. هەروەها، وێڕای ئەوەی کە کاراکتەرسازی ئاریستوفانس ناتەواو و نوقستانە (چەند دانەیەك لە کاراکتەرەکانی بەرجەستە و زیندوون، و زۆریان کاریکاتێر ئاسان یان نموونەی گشتین) بەڵام لە واری لاسایی کردنەوەی هەجونامێزدا بەهرەیەکی درەخشان و پرشنگداری هەیە.

## کۆمیدیای ناوەڕاست

کۆمیدیای میانە یا ناوەڕاست کە لە ماوەی نێوان ساڵانی ٣٨٠- ٣٣٦ی پێش ز بەرەوی سەندووە، پردێکە لەنێوان کۆمیدیای کۆن و کۆمیدیای تازە و هەندێك لە تایبەتمەندییەکانی هەریەکێك لەو دووانەی لەخۆ گرتووە. کۆمیدیای ناوەڕاست ئەو جورئەت و بوێرییەی کۆمیدیای کۆنی تێیدا نەبوو، و کەمتر سەروساختی دەگەڵ سیاسەت و مرۆڤانی زیندوودا هەبوو. لە جیاتی ئەوە لە عەلەیی ئەفسانە و تراجیدیان دەدوا. لەم جۆرە کۆمیدیایەدا ئاوازێن گرووپی کۆراڵ شێوە و قاڵبی نمایشی بەینی پەردەکانی وەرگرت، هیچ جۆرە نموونەیەکی کۆمیدیای ناوەڕاست لەبەر دەست دا نییە، مەگەر ئەنجوومەنی ژنان، و پلوتوس-ی ئاریستوفانس بە کۆمیدیای ناوەڕاست دابنەین.

## کۆمیدیای تازە

کۆمیدیای تازە کە لە ساڵانی ٣٣٦- ٢٦٢ی پێش ز، برەوی پەیدا کرد، لە بنەڕەتدا کۆمیدیای رەفتاران بوو، کە بە درێژەی کۆمیدیای ناوەڕاست دەژمێردرێ، لەم شانۆنامانەدا کۆمیدیای پلۆت و کەسایەتی ناو ژیانی رۆژانە بەرە بەرە جێی کەسایەتییانی ئەفسانەیی تراجیدی ئورپیدس-یان گرتەوە، ئاوازێن گرووپی کۆرس یان کۆراڵ هەر بە شێوەی نمایشی نێوان پەردەی باوی سەردەمی کۆمیدیای ناوەڕاست بە دەقی خۆیەوە مایەوە و بەردەوام بوو، ئەنجام ژمارەی ئەم نێوان پەردانە لە چوار نمایشدا جێگیر بوو. بەمجۆرە شانۆنامە بەسەر پێنج پەردەدا دابەش بوو.

**<u>تایبەتمەندییەکان:</u>**

**<u>کۆمیدیای تازە سێ خەسڵەت و تایبەتمەندی بەرجەستەی هەیە:</u>**

**<u>١- پلۆتی رێك و پێك:</u>**

پلۆتی کۆمیدیای تازە لەسەر پایە و بنەمای دەسیسە و ئەشقبازی نهێنی، شاراوەیی و پەنهان ناسنامان، کەشف و ناسینەوەی دۆستان یان کەسوکارێن گوم بووی کۆن، یان پێکهاتەیەك لەم سیانە رۆنراوە و رۆدەنرێ. وەزع و حاڵەکان بە زۆری پێکەنیناوی و نابەجێ دێتە بەرچاو، و بە زۆریش لە پاڵ نەخشە و پلۆتی سەرەکیدا، نەخشە و پلۆتێکی لاوەکیش قوت دەبێتەوە.

**<u>٢- کاراکتەرێن نموونەیان تیپیك:</u>**

لەو نموونانەی کە لە کۆمیدیای تازەدا بەرچاومان دەکەون، دەکرێ ناوی مێردی سافیلکە، بابی رەزیل و پیسکە، کوری بەدرەفتار بەلآم لایەق، قەحپە، کۆیلەی بێ شەرەف، مێمڵ و مشەخۆر، نۆکەر و خولآمی دەسیسەکار، و سەربازی فشەکەر، ببرێ.

**٣- کەم هەوێنی:**

کۆمیدیای تازە سەروساختی دەگەڵ بەشێکی بچووکی کۆمەڵگەدا هەیە و لە بری خۆی لە قەرەی مەسە قووڵە ئەخلاقییەکان بدات و لە باری هونەرییەوە مامەڵەیان دەگەڵ بکات، زیاتر رەفتار و داب و نەریت و بۆنەکان دەخاتەڕوو.

**کۆمیدیانووسان**

**دیفیلوس (لە دەوروبەری ساڵی ٣٠٠ی پێش ز ژیاوە):**

لە سینوپ"٣٣" هاتۆتە دنیاوە، و پاشان بۆ ئاتین کۆچی کردووە. دیفیلوس نزیکەی سەد شانۆنامەی نووسیووە کە تەنیا بەشێك لە یەك شانۆنامەی وی گەییوەتە دەستی ئێمە. کاریگەری بەسەر پلاتوس-ەوە هەبووە.

**میناندیر (٣٤٣- ٢٩١ی پێش ز):**

خەڵکی ئاتینە (ئەسینا) بە چاکترین و مەنشورترین نووسەری کۆمیدیای تازە دەژمێردرێ، لە بنەماڵەیەکی دەوڵەمەندی گوندی سفیزیا-ی نزیکی ئاتین لە دایك بووە. میناندیر لە لاویدا لە ژێر کاریگەری کۆمەڵێك شاعیردا بووە لەوانە: ئالکسیس-ی مامی کە شاعیرێکی بەرجەستەی کۆمیدیای ناوەڕاست بووە، تیوفراستس، ئەپیکوروس، و بە تایبەتی ئورپیدس. یەکەمین شانۆنامەی لە ساڵی ٣٢١ی پێش ز نووسیوە و لەوساوە و تا کاتی مردنی پتر لە سەد شانۆنامەی نووسیوە. میناندیر لە ژیانا وەکو شانۆنامەنووس شۆرەتی کەمی هەبووە. (تەنیا هەشت جار لە پێشبڕکێیاندا سەرکەوتنی بەدەست هێناوە). بەڵام شاعیرێکی کۆمیدیایی خۆشەویستی یۆنان و رۆم بوو. میناندیر بوو، نەك ئاریستوفانس، کە شێوازی کۆمیدی لاتین و کۆمیدی رەفتارانی لە ئەورووپای باکووردا دامەزراند. تەنیا یەك کۆمیدیای تەواو لە پاش میناندیر بەجێ ماوە و ناوی (دووسکالوس-ە، ٣١٦ی پێش ز).

پلۆت و بابەتی کۆمیدیای ناوبراو دەربارەی نموونەیەکی تایبەتیە: باوکێکی بەدخوو سەرەنجام ناچار دەبێ بە شووکردنی کیژەکەی بە خوازبێنی کوڕێکی لاوی دەوڵەمەند قایل ببێ.

ئەو بەشەی کە لە دراماى داوەری (٣٠٠ی پێش ز) ماوەتەوە، دەربارەی پیاوێکە کە گومانی بێ وەفایی لە ژنەکەی دەکات و زۆر تووڕە دەبێ. پاشان پەی بە بێ تاوانی ژنەکەی دەبات و لە گەڵیا ئاشت دەبێتەوە. میناندیر تاڕادەیەك بە راشکاوی ئەو پرەنسیپ و یاسا و رێسا ئەخلاقییانە دەخاتە بەرباس و لێکۆڵینەوە کە لەسەر جیاوازی نەژادی، بە تایبەتی سەبارەت بە رەگەزی ژنان رۆنراون.

## ڕەوانبێژی و وتاربێژی

### مامۆستایانی کۆنی زانستێن ڕەوانبێژی:

کوراکس، و تیزیاس-ی شاگردی (٤٣٠ی پێش ز) بە دامەزرێنەرانی هونەری بەلاغەت و ڕەوانبێژی دژمێردرێن ئەم دووانە بە قسە قوتی و زیرەکی و حازر وەلامی و شوخی بازی بەناوبانگ بوون، ئەم مامۆستایانە کاریگەری گەورەیان بەسەر خوتبەبێژانی ئاتینەوە هەبووە.

### سوفستاییان:

سوفستاییەکان کۆمەلێك موعەلیمی پیشەیی بوون کە لە سەدەکانی پێنجەم و چوارەمی ی پێش زاییندا لە ئاتینەدا ناوبانگیان پەیدا کرد. ئەوانە فێرکردنی هەموو لقەکانی زانستیان، کە یەکێك بوو لە پێداویستییەکانی سەرکەوتنی لاوان لە ژیانی کۆمەلایەتیدا، کردبوو بە ئەرك و پیشەی خۆیان. شۆڕەت و (هەروەها بەدناوی) سوفستاییەکان دەگەڕێتەوە بۆ زیرەکی، سەرڤە سەرڤەڕوانی، جلوبەرگ و هەلس وکەوتی نەشاز، وردبینی، و شێوەی گەنگەشە و موناقەشەی حیلەئامێزیان کە دەیکردە کارێك خراپترین شێوەی باس و گەنگەشە لەلای خەلکی بە باشترین شێوە بنوێنن. گەورە ناودارانی سوفستایی بریتی بوون لە:

١- پروتاگوراس، کە خەلکی ئابدرا و لەدایکبووی سالی ٤٨٠ی پێش ز، مرۆڤ دۆستێکی گەورە و دامەزرێنەری دەستووری زمان بوو.

٢- هیپیاس، خەلکی ئلیس بووە و لە دەوروبەری ٤٥٠ی پێش زدا ژیاوە، پیاوێکی فرە زانیاری بووە و مامۆستای ئەستێرەناسی و جوگرافیا بووە.

٣- گورگیاس، خەلکی سیراکوز بووە، لە دەوروبەری سالی ٤٢٥ی پێش زدا ژیاوە، خەتیب و خوتبەبێژێکی مەزن و مامۆستای زانستە ڕەوانبێژییەکان بووە.

### وتاربێژان:

لە سەردەمی کۆندا پەیڤی ڕەوان و سوار و کاریگەر لەشەهامەت و بوێری پتر مایەی سەرنج بووە و بە ئەندازەی ئازایەتی و بوێری شایانی قەدرزانی بووە. (پلیوس"٣٤"، سیمورخ ڕادەسپێرێ کە ئاسخیلوس فێر بکات کە هەم ئەهلی گوتار بێ و هەم پیاوی کردار)،

ڕابەران و پێشەوایانی کۆنی وەکو تیستوکلیس"٣٥" و پریکلس"٣٦" هەر سەرداری جەنگی نەبوونە بەلکو وتاربێژیش بوونە.

خیتابەت (وتاربێژی) وەکو هونەرێك لە سایەی چاودێری و سەرپەرشتی مامۆستایانی کۆنی زانستە رەوانبێژییەکان و سوفستاییەکاندا رووەو پەرەسەندن و گەشەکردن چوو، لە دەوروبەری ساڵی ٤٥٠ی پێش ز بوو بە لقێك لە ئەدەبیات.

دیموستن (٣٨٥- ٣٢٢ی پێش ز):

خەڵکی ئاتینە و گەورەترین خەتیب و وتاربێژی کۆنە. دیموستن لە هەوڵی تەمەنییەوە لێدەبڕێ لەواری وتەبێژی و زمانڕەوانیدا خۆی پەروەردە بکات تا بتوانێ لە بەردەم دادگادا بوەستێ و بەشە میراتی خۆی لەو سەرپەرشتکارانەی کە لێیان داگیر کردبوو، وەربگرێتەوە. دەگێڕنەوە دەڵێن گوایە دیموستن زمانی گرتووە، وردە بەردێکی دەخستە ناو زاری و مەشقی قسەکردنی دەکرد، تا لە ئەنجامدا بەسەر ئەو زمانگرتنەدا زاڵ دەبێ، و هەروەها لە بەرانبەر خرۆش و هاژەی شەپۆلانی دەریادا هاواری دەکرد و بەوجۆرە توانای دەنگی خۆی زیاد کردووە، لە پاش پێنج وتاربێژیی پاشاوەی سەروەت و سامانە زەوتکراوەکەی خۆی بە دەست هێناوەتەوە. ئیدی لەوە بە دواوە وتاربێژیی کردووە بە کار و پیشەی خۆی، لە بەردەم دادگا و ئەنجوومەنی پیراندا وتاربێژی دەکرد و لە کاروباری وڵاتداریدا بەشداری دەکرد، پاشان دیموستن کەوتە هێرش کردن بۆ سەر ئارمانجەکانی فیلیپی مەقدونی و قەناعەتی بە خەڵکی تب کرد تا پەیوەندی بە ئاتینەوە بکەن، پاش سەرکەوتنی فیلیپ لە خارونەئا (٣٣٨ی پێش ز)، دیموستن لە ئاتین هەڵات و لە ئەنجامدا بۆ رزگار بوون لە دەستی مەقدونییەکان ژەهری خوارد و لە ساڵی ٣٢٢ی پێش ز، لە دورگەی کالوریادا مرد.

وتارە گرینگەکانی:

شۆرەت و ناوبانگی دیموستن لە بنەڕەتدا دەگەڕێتەوە بۆ خوتبەکانی کە بریتیین لە: دەربارەی ئازادی رودس (٣٥٣ی پێش ز): کە بەرەڤانی و داکۆکییە لە دیوکراسی. سێ فیلیپیك (٣٥١- ٣٤١ی پێش ز): دژی فیلیپ-ە، سێ ئولونتیاك (٣٤٩- ٣٤٨) ئەمەشیان دژی فیلیپ-ە، و دەربارەی تاج (٣٣٠ی پێش ز)، کە بەرەڤانی و داکۆکییە لە رێبازی سیاسی ئەو و بە شاکاری وی (دیوستن) دەژمێردرێ.

شێوازی دیموستن:

دیموستن لەواری زانستی بەلاغەت و رەوانبێژیدا تەواو کارامە و پڕ ئەزموونە. خوتبە و وتارەکانی بە جۆش و خرۆشن، شێوە و شێوازی دەربڕینەکانی لە هێزە مەزنەکانی تەبیعەت و سروشتەوە وەرگرتووە. وەکو هێزێن ئوقیانوس، هەورە تریشقە و تۆفان و بۆران، زۆربەی خوتبە

و وتارەکانی بەووردی رازاندوونەتەوە. بە دووبارەکردنەوەی هەندێ برگـە و پـەرەگرافی تـەرجیع بەند ئاسا و، هەمە جۆری رستە و دەستەواژان بەناوبانگە. سوودی لـە شـێوە رەوانبێژییـەکانی وەکو تیباق و پرسیار و وەڵام، جۆرەکانی رەگەز دۆزی، وەزن و کێشی هەمەجۆر وەرگرتووە.

## فەلسەفە

یونانییەکان یەکەمین خەڵکانێك بوون کە کەوتنە بیری دامەزراندنی سیستەمێکی فیکـری دەربارەی جیهان، ئەوەندەی لە توانایاندا بوو کەوتنە دژایـەتی بیروبـاوەڕێن خـورافی و پـوچ، و هەوڵیاندا لەبەر رۆشنایی دیتن و تێفکرین پەی بە نهێنییەکانی دۆز و مەسـەلەێن مینـا پەیـدا بـوون و جەوهـەر و ماهیـەتی مـاددە، هـزر، باشـی، حەقیقـەت، جـوانی و واقیعـی ببـەن، مەتریالیستانی کۆن بەو ئەفسانانە قایل نەبوون کە لافی ئەوەیان لێدەدا کە گوایـە سەرچـاوەی پەیدا بوون و نەسڵی شتەکان بـوون. بۆیـە بـە پـشتیوانی هەسـت وەکـو سـەرەتای ئیـدراك، هەوڵیانـداوە جیهـان بـە گـوێرەی رەگـەزە مەتریالیـستییەکانی بناسـن، لەلایـەکی تـرەوە، خەیالگەراکان باوەڕیان وابوو کە سەرەتا و سەرچاوەی حەقیقەتەکانی جیهانی بـوون، زەیـن یـا خەیاڵی نادەمیزادە.

**هەوەڵێن پەیڕەوکارانی ڕێبازی ئەساڵەتی ماددە:**

**تالیس (٦٤٠ – ٥٤٦ی پێش ز):**

خەڵکی ئاتینە و بە "باوکی فەلسەفە" ناسراوە و باوەڕی وابوو کە رەگـەزی ئەسـڵی پەیـدا بوونی جیهان ئاوە.

**هیراکلیتوس (٥١٣ی پێش ز):**

لە ئیفسوس لە دایك بووە. بەبۆچوونی هیراکلیتوس هەرچی شتێك هەیە لە حاڵی جوڵەدایـە- هەموو شتەکان دەجوڵێن و ئاگر رەگەزی بنەڕەتی پەیدابوون و دروستبوونی جیهانە.

**ئانالسیمنس (٥٠٠ی پێش ز):**

خەڵکی میلوتوسە [٣٧]، پێی وایە کە هەوا رەگەزی بنەڕەتی پەیدا بوونی جیهانە

**ئامپدوکلس (٤٤٤ی پێش ز):**

خەڵکی ئاگریجنتویە [٣٨]، پێی وایە جیهان بەرهەمی هەر چوار رەگەزی خاك، هـەوا، ئـاو و ئاگرە، رەگەزە ئەسڵییەکان لە ناو ناچن و هەر دەمێنن، هێزی ئەشـق ئـەو رەگەزانـە ئاوێتـەی یەکدی دەکات، و رق و کینە لێکدییان جیا دەکاتەوە.

**هەوەڵین پەیڕەوکارانی ڕێبازی ئەساڵەتی خەیاڵ:**

**فیثاغورس (٥٨٢- ٥٠٧ی پێش ز):**

خەڵکی ساموس"٣٩"ە. باوەڕی بە دۆنای دۆنی روحان هەیە، لە ئەنجامی توێژینەوە دەربارەی ژماران دەگاتە ئەم ئەنجامەی کە ژماران دوا حەقیقەتی شتانن.

**کسنوفانس (٥٧٦- ٤٨٠ی پێش ز):**

خەڵکی ئیلیا"٤٠"یە و لەوەشە یەکەمین فەیلەسووفی یەکتاپەرستی یونان بێ.

**ئاناکساگوراس (٥٠٠- ٤٢٨ی پێش ز):**

خەڵکی کلازومن ـە و یەکەمین فەیلەسووفە کە ئەقڵ و ئاوەز بە ڕێکخەری کاروباری جیهان دەزانێ.

**سوکرات (٤٧٠- ٣٩٩ی پێش ز):**

خەڵکی ئاتینە، بە باوکی زانستی ئەخلاق و بە گەورەترین کەسایەتی مێژووی هزر و بیری یۆنانی دەژمێرن، سوکرات، وێڕای ئەوەی کە هەرگیز هیچی نەنووسیوە"٤١"، بەڵام کاریگەرییەکی قووڵی بەسەر ڕەوتی فەلسەفییەوە هەبووە، سوکرات ماوەیەکی سەرەتای تەمەنی بەسەربازی و بەردتاشی بردۆتە سەر، لێ دوای ئەوە ئەو هەموو تەمەنی خۆی وەقفی بیرکردنەوە و تێفکرینی فەلسەفی کردووە. لە هەر شوێنێ گوێگرانی دەستکەوتبا تێکەڵاویان دەبوو چونکە پێی وابوو کە لە ژیاندا ئەرکێکی خوایی لەسەرە کە خەڵکی لە جەهالەت و نەزانی خۆیان بێدار بکاتەوە و تاسەی حەقیقەتزانییان لەلا دەمەزەرد بکاتەوە. هەمیشە دەستە گەنجێکی تاسەداری زانست لە دەوری خڕ دەبوونەوە. (لەوانە کسنوفانس و ئەفلاتوون)، سوکرات بەوپەڕی بێ فیزی دەکەوتە فێرکردنیان. زانیارییەکانی پتر لە شێوەی پرسیار و وەڵامدا دەخستەڕوو.

سوکرات پشتی کردە زانست و ماددەگەرایی. بە شێوەیەکی تایبەتی شەیدای حیکمەتی عەمەلی و پراکتیکی بووە، سوکرات لەگەڵ یاسای ئەساڵەتی ئەزموونی ماددەگەرایاندا نەبوو. سوکرات لە هەوڵی ئەوەدا بووە کە پرەنسیپ و یاسا و ڕێسایانی ئەخلاقی بنجبڕ بەرقەرار بکات و دابمەزرێنێ. ئەو بە ئاشکرا خواوەندانی یونانی کۆن ئینکار ناکات، بەڵام باوەڕی بە یەك بوونەوەی باڵا هەیە کە ڕێنوێنی بەشەرە لە واری ئەخلاقیاتدا، و هەروەها باوەڕی بە نەمری روح هەیە.

تیۆرییەکانی سوکرات دەربارەی ریفۆرمی بنەڕەتی و شێوە و شێوازی بانگەشەکردن بۆ ئەو تیۆرییانە، دوژمنانێکی زۆر دەوروژێنێ و سوکرات هەرزوو دەکەوێتە بەر هێرش و پەلاماری

ئەیاران. لە سەرەتای ساڵی ٤٢٨ی پێش ز ئاریستوفانس لە شانۆنامەی هەورآندا گاڵتەی (بە سوکرات) پێ دەکات. پاش بیست و چوار ساڵ لەوەو دوا سوکرات بە لە رێ دەرکردنی لاوان و بیدعەتکاری لە ئاییندا تاوانبار دەکرێ، ئیدی دادگایی دەکرێ و حوکمی مەرگی دەدەن. سوکراتیش بە ناچاری ژەهراو دەخواتەوە و شەهید دەبێ.

**ئەفلاتوون (٤٢٧- ٣٤٧ی پێش ز):**

ئەفلاتوون، فەیلەسووف، سیاسەتوان، مامۆستا، نووسەر و شاعیرە، لە بنەماڵەیەکی دەوڵەمەندی ئاتینی لە دایك بووە، خوێنەوارییەکی بەرزی هەبووە و پاشان رێبازی موریدانی فەیلەسووفی هیراکلیتی، کراتیلوس، و دواتر رێبازی سوکراتی گرتووەتەبەر، ئەفلاتوون لە گەنجیدا چەندین وتار و شیعری نووسیوە. ماوەیەکیش خووی داوەتە سیاسەت، بەڵام لە ساڵی ٣٩٩ی پێش زدا تەرکی کردووە. ئیدی لەوە بە دواوە نزیکەی دە ساڵێکی بە جیهانگەری بردۆتە سەر، و سەفەری میسر، ئیتالیا و سیسیل-ی کردووە. لە دەوروبەری ساڵی ٣٨٩ی پێش ز بۆ ئاتین گەڕایەوە و ئاکادیمیای (یەکەمین زانستگەی جیهان)ی دامەزراند، و دوو جاری دیکەش سەفەری سیسیل-ی کرد و هەوڵی دا بۆچوونە سیاسییەکانی خۆی لەوێندەر لەواری پراکتیکیدا ئەنجام بدات، بەڵام هیچ سەرکەوتنێکی بە دەست نەهێنا، ئەفلاتوون دووبارە بۆ ئاتین گەڕایەوە و تامردن هەر خەریکی دەرسگوتنەوە و نووسەری بوو.

**بەرهەمەکانی:**

**نامەکان:**

سیازدە نامەی ئەفلاتوون لەبەر دەستدایە، کە رەنگە تەنیا یەك نامەیان بە راستی هی ئەو بێ.

**بەرەڤانی لە سوکرات (ئاپۆلوژی):**

سەربوردەیەکە لە قاڵبی مەنەلۆگدا دەربارەی دادگایی سوکرات، ئەفلاتوون لەم نووسینەدا وێنەیەکی نموونەیی ژیان و پەیامی مامۆستاکەی دەگرێ و بەرجەستەی دەکات.

**گفتوگۆکان:**

ئەم بەرهەمە لە قاڵبی گفتوگۆ و دیالۆگێکی شانۆییدایە و بە شێوەی پرسیار و وەڵامە.

گفتوگۆکاران سوکرات و موریدانی سوکراتن، چل و دوو گفتوگۆ دراوەتە پاڵ ئەفلاتوون کە رەنگە تەنیا بیست و شەشیان بەڕاستی هی ئەوبن، گرنگترین گفتوگۆکانی ئەفلاتوون بریتیین لە:

١- فیدون:

کە سەربهووردی مەرگی سوکرات و بۆچوونەکانی ئەفلاتوون دەربارەی ئەمری باس دەکات.

مامۆستایانی کۆنی زانستە ڕەوانبێژییەکان بە بەرهەمەکانیەوە دیارە، بەشێوەیەکی گشتی نووسینەکانی ئەفلاتوون روون، خۆش، جوانن و دڵگیر.

**ئەرەستۆ (٣٨٤- ٣٢٢ی پێش ز):**

ئەرەستۆ فەیلەسووف، مامۆستا و نووسەرە، لە ستاگیر-ی باکووری یونان لە دایك بووە. نیکوماخوس-ی باوکی پزیشکی ئامینتاس-س دووەمی شای مەگدونیا بوو. ئەرەستۆ لە موریدانی ئیسوکراتیس "٤٢"-ی وتاربێژ و پاشان (لە دەوروبەری بیست ساڵیدا) بوو بە موریدی ئەفلاتوون.

ئەرەستۆ، پاش مردنی ئەفلاتوون ئاتینی بەجێ هێشت و بۆ ماوەی سێ ساڵان لە ئاترنیوس و ئاسوس ئاکنجی بوو. لەسەر داوای فیلیپ-ی مەقدونی، وەکو مامۆستای ئەسکەندەری مەقدونی چوو بۆ مەقدونیا و لە ساڵی ٣٤٢- ٣٣٥ لەم پۆستەدا مایەوە و خزمەتی کرد. ئەرەستۆ لە ساڵی ٣٣٥ لوکیون "٤٣" ی کە دووەم زانستگەی جیهان بوو، لە ئاتیندا دامەزراند. پاش مردنی ئەسکەندەر لە ساڵی ٣٢٣ی پێش زدا، کاردانەوەی ئاتین دژی مەقدونیا، ئەرەستۆی ناچار کرد کە بۆ خالسیس هەڵێت و لە ساڵی ٣٢٢ی پێش زدا مرد.

**بەرهەمەکانی ئەرەستۆ:**

گەلێك لە نووسین و بەرهەمەکانی ئەرەستۆ لەناوچوون، بەڵام ئەو بەرهەمانەی کە ماونەتەوە (نزیکەی سی و دوو بەرهەمە) زۆر بوار دەگرنەوە و ئەوە نیشاندەدەن ئەرەستۆ شارەزای هەموو زانست و زانیارییانی زەمان و سەردەمی خۆی بووە و هەوڵیداوە هەموو ئەپستمولۆژیا مرۆڤانییەکان ریزبەندی بکات و بەسیستەمێکی تایبەتی پۆلێنیان بکات. هەندێ لە بەرهەمە گرنگەکانی بریتین لە:

**ئۆرگانون:**

سەرناوی کۆی بەرهەمەکانی ئەرەستۆیە لە بواری لۆژیکدا. ئۆرگانون لە چەند نووسینێك پێکهاتووە کە بەم ناوانەن: کاتیگوریاس، تۆپیکا، قارەمانانی غەڵەتکاریان، کە دەربارەی لۆژیکی ئەنجامگیری و خوێندنەوەن، هەروەها نامەی شیکاری ئانالوتیکا، کە دەربارەی پێوانە و سەلماندنە.

**هونەری شیعر (پۆتیکا):**

کۆنترین نووسینە دەربارەی رەخنەی ئەدەبی. ئەرەستۆ لەم کتێبەدا پاش پێشەکییەك دەربارەی ماهیەت و نێوەڕۆك و جۆرەکانی شیعر، دەکەوێتە باسی تراجیدیا و بەش و

کۆڵەکەکانی شیعر، پێی وایە هەر تراژیدیایەك دەبێ شەش کۆڵەکەی سەرەکی هەبێ- پلۆت، کاراکتەر، فیکر، دەربڕین، دیمەنسازی و مۆسیقا. لەم کتێبەدا باسی ئەم مەسەلانە کراوە: مەلحەمە، هۆو هاندەر، یەکێتی کات و یەکێتیی کردار، ماهیەت و سروشتی کاراکتەران، کاروباری ماقووڵ و لەگوین، و پاکبوونەوە.

نۆرگانون لە سەرچاوە گرینگەکانی هونەری شیعر و رەخنەیە و لە سەدەی شازدەیەم بە دواوە کارێکی بێ ئەندازەی کردۆتە سەر رەخنەی دراما لە ئیتاڵیا، فەرەنسا و ئینگلتەرا.

**بەرهەمەکانی دیکەی ئەرەستۆ:**

ئەخلاقی نیکوماخوس، روح، کتێبی سیاسەت، کتێبی وتاربێژی و (ئەرەستۆ داهێنەری هونەری وتاربێژییە، لەم کتێبەدا لە بنج و بناوان و بەکارهێنان، و زاراوەکانی هونەری رەوانبێژی، بەکارهێنانی باری دەروونی، شێواز و پێکهاتەی وتاربێژی دەکۆڵێتەوە).

**بیروبۆچوونەکانی ئەرەستۆ:**

**دەرونزانی و فەلسەفەی میتافیزیك.**

ئەرەستۆ تێوری ئایدیالی ئەفلاتوون رەتدەکاتەوە، و لە جیاتی ئەوە بە ئەساڵەت و ئەولەویەتی واقیع قائیلە و باوەڕی وایە کە شتە هەست پێکراوەکان بوونی دەرەکیان هەیە و دەکرێ پەیان پێ ببرێ. وێنە (ئایدیال) بەبێ بوونی ماددە بوونی نابێ، بە هەمان شێوە ماددەش بەبێ وێنە نابێ. هەر بە هەمان شێوە روح و بەدەنیش لە یەکتر جیا نین، بەڵکو تەواوکەری یەکترن. خوا ئامانج و سەرچاوەی جیهانە. جیهانیش لەسەر مەیل و تاسە بۆ خوا، دەسوڕێتەوە.

**ئەخلاقیات:**

ئەرەستۆ باوەڕی وایە کە شادمانی خێری باڵایە و تەنیا لەڕێگەی شتانی دەرەکی، ئەقڵ، فەزیلەتی ئەخلاقی، میانڕەوییەوە دەتوانرێ پێی بگەی. مرۆڤ خودانی ویست و ئیرادەی ئازادە و پێویستە هوشیارانە عەودالی فەزیلەت بێ.

**بیروبۆچوونە سیاسییەکانی ئەرەستۆ:**

ئەرەستۆ لەچاو ئەفلاتووندا کەمتر بایەخی بە ژیانی هاوبەش داوە. بە باوەڕی ئەو دەوڵەت لە شارۆچکانی بچووك پێکدێ و خێزان بەردی بناغە و هەوێنێتی. ئەرستۆ کۆیلەداری بەڕەوا دەزانێ و پەروەردە و فێرکردنی بەلاوە زۆر گرنگ بووە.

**شێوازی ئەرستۆ:**

زۆربەی ئەو بەرهەمانە کە لەپاش ئەرستۆ بەجێ ماون، شێوە و فۆرمی یاداشتیان هەیە، دەڵێی کورتەو سەرە قەڵەمی هەندێ بابەتن کە بە شێوەی یاداشتێن دەرسی تۆمار کراون و لەوەش دەچێ بە نیازی بڵاوکردنەوە نەنووسرابن، تەنیا بەهەرمی (یاسای بنەڕەتی ئاتین) لەم حاڵە بەدەرە، ئەم بەرهەمە روون، راشکاو و سادەیە.

ئەرستۆ زۆری مەیل لەسەر پۆڵێن و پێناسە هەبووە. بەرهەمەکانی ئەرستۆ لەچاو بەرهەمەکانی ئەفلاتووندا کەمتر شاعیرانە، و کەمتر عاتیفین، و ئەو رەوانییەی شێوازی ئەفلاتوونیشیان نییە.

# پەراوێز:

١- سەردەمی ئاتیك: ئاتیك ناوچەیەك بووە لە بەشی رۆژهەلاتی یونانی ناوەندی کۆن، لە دەوروبەری ئاتین.

٢- کلیس تینیس، سیاسەتوانێکی یونانی بووە لە دەوروبەری ساڵی ٥٠٧ی پێش زدا ژیاوە.

٣- پریکلیس، سیاسەتوانێکی ئاتینی بووە، لە ساڵی ٤٢٩ی پێش زدا ژیاوە.

٤- نیسیاس، سەردار و سیاسەتوانێکی ئاتینی بووە و لە دەوروبەری ٤١٣ی پێش زدا ژیاوە.

٥- کورونیا: شارێکی کۆنی یونانی بووە لە باکووری رۆژئاوای تب دا کە مەیدانی دوو جەنگی گەورە بووە.

٦- ئابرادا تاس: فەرمانڕەوای شوش بووە، کە لە شەڕی ئاشورییەکان لەگەڵ کورشدا، هاوپەیمانی ئاشـور بوو، پانتەئا-ی خێزانی بەدیلی دەکەوێتە دەستی سوپاییانی کورش، و بە هۆی رەفتـاری جوامێرانـەی کـورش لەگەڵیا، ئابراداتاس پەیوەندی بە کورشەوە دەکات.

٧- ساتیرەکان Satyrs (لە ئەفسانەکانی یۆناندا) لـە خواوەنـدانی جـەنگی بـوون کـە لاقـی بزنیـان هەبووە. ئەم بوونەوەرانە پتر کـاتی خۆیـان بەسـورِ و سـەما و رابواردنـەوە دەگوزەرانـد و لـە موریـدان و خولامانی دیونوسوس بوون.

٨- تسپیس (دەوروبەری ٥٣٤ی پێش ز): شاعیرێکی یونانییە. بە داهێنەری تراجیـدیا دەژمێـردرێ، و یەکەمین ئەکتەرە کە لە شانۆییدا بە تاقی تەنیا دەوری بینیوە.

٩- ساتیریك: جۆرە شانۆییەکە، ئەمە پتر گەمەی پێکەنیناوی بووە و ئەکتەران بەدەم سەما و سازەوە و بەجل وبەرگی ساتیرانەوە لە ستایشی دیونوسوسدا ئەنجامیان داوە.

١٠- سلینگ: لە هەندی نمایشی یونانی کۆندا لە ساتی بڕیـاردراودا خودایانیـان بـەهۆی ئـامێری وەکـو سلینگەوە دادەبەزاندە سەر شانۆ تا قارەمان لە تەنگانە رزگار بکەن و گرێیەکان بکەنەوە.

١١- یەکێتیی کات و شوێن: لەو شانۆنامانەدا یەکێتیی کات رەچاو دەکرێ هەموو کارەکان لە ماوەیەکی ٢٤ سەعاتەدا روو دەدەن. لەو شانۆنامانەدا کە یەکێتیی شوێن رەچاو دەکرێ گۆڕینی جـددی دیکـۆر و دیمـەن زۆر پێویست نییە. لەو شانۆنامانەدا کە یەکێتیی کار رەچاو دەکرێ، پلۆت و نەخشەکەشی سادە و تایبەتە.

١٢- تروکایك: شیعرێکە کە کێشەکەی لە برگە برگە کردندا لە هیجایەکی درێژ و لە هیجایەکی کورت پێك بێ.

١٣- ئیلیوسیس: شارێکی کۆنی ڕۆژهەلاتی یونانە لە ئاتیك کە وێران بووە.

١٤- هیرۆ، فەرمانڕەوای زۆرداری سیراکوز بووە و لە ساڵی ٤٦٦ی پێش. ز. دا مردووە.

١٥- دانایوس: یەکێکە لە کەسایەتییە ئەفسانەییەکانی یونان کە پەنجا کیژی بەناو دانائیدەکان هەبووە.

١٦- تانتالوس: کوڕی زیوس و بابی پلوپس بوو. ئەمە پاشای لیدیا بووە و چونکە کوڕەکەی خۆی بۆ خواردنی خودایان کردە قوربانی بە توندی سزای خۆی وەرگرت.

١٧- ئاتریوس: بابی ئاگامەمنونە.

١٨- ئورستیس: کوڕی ئاگامەمنون و کلی تمنسترایە.

١٩- خواوەندانی تۆڵە: ئەمانە بەشێوەی سێ کیژی باڵداری گێسو بەمار بەرجەستە دەکران و تاوانبارانیان ئاقیب دەکرد و ئەشکەنجەیان دەدان.

٢٠- دژانیر: لە قسان کیژی پاشای کالیدون و هاوسەری هەرکولە، نسوس کە یەکێکە لە سەنتوران و (خەڵقەندەیەکی سەیرە کە نیوەی بەدەنی ئادەمیزادە و نیوەکەی تری ئەسپە) دەیەوێ دەست درێژی بکاتە سەر دژانیر، بە دەستی هەرکول دەکوژرێ، نسوس لە کاتی گیانەڵڵادا دەرمانێکی بە خوێنی خۆی ئاوێتە بەناوی (شەرابی ئەشق) دەداتە دژانیر، دژانیریش بۆ ئەوەی هەرکول بێنێتە سەر سۆز و ئەشق، لەڕووی سادەیی و نەزانییەوە چاکەتەکەی لەو دەرمانە هەڵدەکێشێ و بۆی دەنێرێ، هەرکول کە چاکەتە ژەهراویەکە لەبەر دەکات تووشی خارشت و سوتانەوەیەکی سەیر دەبێ و تەحەمول ناکات و لە کێوی ئوتای نزیکی تراخیس خۆی دەسوتێنێ، دژانیرش کە پەی بە ماهیەتی دەرمانەکە دەبات خۆی دەکوژێت.

٢١- لیر: پاشای ئەفسانەیی بەریتانیا و قارەمانی تراجیدیای (شالیر)ی شەکسپیرە.

٢٢- سەرکەوتنی مەزنی دەریایی: مەبەست لەسەرکەوتنی یونانە بەسەر هێزی دەریایی ئێرانی سەردەمی هەخامەنشی دا لەگەڵی سالامیس.

٢٣- ئاناکساگوراس (٥٠٠- ٤٢٨ی پێش ز) فەیلەسوفێکی یونانی بووە.

٢٤- پروتاگوراس (٤٨٥- ٤١٥ی پێش ز): فەیلەسوفێکی یونانی ڕەواقی بووە.

٢٥- ئارتیمیس: بە گوێرەی ئەفسانانی یونان خواوەندی مانگ و گیانلەبەرانی هۆڤی و شکار بووە.

٢٦- میناده‌کان: ژنانی نیمچە رووتی هاوڕێی دیونوسوس بوون، کە ژێراوژێر خەریکی مەی نۆشی و مۆسیقا بوون، روومییەکان پێیان دەگوتن باکانت.

٢٧- دیومیدس: لە جەنگاوەرانی ناوداری جەنگی تەروادەیە و لە (ئیلیاد)دا باسی دلاوەری و قارەمانییەتەکانی کراوە.

٢٨- کۆمیدیای کۆن: بە کۆمیدیای یونانی پێش ساڵی ٣٨٠ی پێش ز دەگوترێ و لە راستیدا مەبەست لە کۆمیدیای ئاریستوفانس-ە.

٢٩- فالیك: لە فالوسەوە وەرگیراوە کە بە مانای کێری پیاو دێت و لە یوناندا پەرستنی باو بووە.

٣٠- نیسیاس: سەردارێکی ئاتینی بووە.

٣١- کلیون: رابەری سیاسی ئاتین و دوژمنی سەرسەختی ئەسپارت بووە.

٣٢- ئاگاتون: (٤٤٥- ٣٩٩ی پێش ز): شاعیرێکی تراجیدی یونان بووە.

٣٣- سینوپ: لە شارە کونەکانی ئاسیای بچووك بووە، لە باکووری تورکیای ئێستا.

٣٤- پلیوس: پاشای مورمیدونەکان و بابی ئاسخیلوس بووە.

٣٥- تمیستوکلیس (٥٢٧- ٤٦٠ی پێش ز) سەردار و سیاسەتوانی ئاتینی بووە.

٣٦- پریکلیس (٤٢٩ی پێش ز): سیاسەتوانێکی ئاتینی بووە.

٣٧- میلوتوس= ملاتیە: شارێکی کۆنە لە رەخی رۆژئاوای ئاسیای بچووك.

٣٨- ئاگریجنتویە: شارێکە لە باشووری سیسیل کە لە رابردوودا لە شارە گەورەکانی یونان بووە.

٣٩- ساموس: دورگەیەکە لە یونان کەوتۆتە دەریای ئیجەوە، نزیکی کەناری رۆژئاوای ئاسیای بچووکە.

٤٠- ئیلیایە: شاری لوکیا-ی کۆنە، لە باشووری ئیتاڵیایە.

٤١- زانیارییەکانی ئێمە لەمەڕ سوکرات و بیروبۆچوونەکانی وی لەڕێگەی گەزنەفۆن و ئەفلاتوونەوەیە. وەڵامی ئەم پرسیارەش کە کام هزری فەلسەفی تایبەتن بە سوکرات و هی خودی سوکراتن، مەحاڵە.

٤٢- ئیسوکراتیس (٤٣٦- ٣٣٨ی پێش ز): خەتیب و وتاربێژێکی یونانی بووە.

٤٣- لوکیون: یەکەمین زانستگە، ئەکادیمیاکەی ئەفلاتوونە.

# سەردەمی ئەسکەندەرانی و رومی

## ١- سەردەمی ئەسکەندەرانی

## ٣٢٣- ١٤٦ی پێش ز

**پێشینەیەکی مێژوویی:**

ئەسکەندەری مەقدونی لە ساڵی ٣٢٣ی پێش ز مرد و ئیمپراتۆرییەتەکەی لە نێوان فەرمانڕەواکانیدا دابەش بوو. بەتلیموس-ی یەکەم، ناسراو بە سوتیر "١" بوو بە پاشای میسر و ئەسکەندەریەی گەورەترین شاری بازرگانی جیهانی کرد بە پایتەختی خۆی. ئەمە جگە لەوەی کە هەموو زانایان، هونەرمەندان و نووسەرانی گەورەی سەردەمی لە دەرباری خۆیدا خڕ کردەوە، بەتلیموس سەرەنجام کتێبخانەی ئەسکەندەرییەی دامەزراند کە بەلەز پەرەیسەند و ئەنجام کۆی کتێبەکانی گەییە حەوت سەد هەزار کتێب. هەڵبەتە پاشان جێنشینانی بەتلیموس درێژەیان بە ڕێگاکەی ئەودا.

**نوڕینێکی گشتی:**

قۆناغی شکۆداری ئەدەبیاتی یونانی لەگەڵ مەرگی ئەرەستۆدا ٣٢٢ی پێش ز دەگاتە کۆتایی و دەبڕێتەوە. چالاکییە ئەدەبییەکانی یۆنان بۆ ئەسکەندەرییە دەگوازرێتەوە. لە ماوەی قۆناغی ئەسکەندەرییەدا دەرفەتی فێرکاری و هونەری فرە و فراوان دەبێ. بەڵام خۆڕسکی و بلیمەتی کەمە. بەرهەمی ئەدەبی بۆ خەڵکانێکی کەم لە ئەهلی مەعریفەت و ڕۆشنبیری دەهاتە ئاراوە، نەك بۆ هەموو خەڵکی.

تیمون فیلوس-ی "٢" شاعیری تەنزنووس لەم بارەیەوە قسەیەکی جوانی هەیە: لە میسری پڕ هەرا و هەنگامە و ئاژاوەدا، کەسانێکی زۆر قەڵەو دەبن، نووسەرانی قرژاڵ و قورباغەنووس لەسەر لەبانان، قالە قالێکی بێ پایانیان لە ناو قەفەسی خواوەندانی شیعردا ناوەتەوە.

## کاراکتەرسازی

**تیوفراستوس (٣٢٧- ٢٨٧ی پێش ز):**

خەڵکی لسبوس بووە، شاگردی ئەرەستۆ و جێنشینی ئەو بووە لە لوکیون. هەر چەندە بەرهەمێکی زۆری نووسیوە، بەڵام تەنیا سێ بەرهەمی بە تەواوی ماونەتەوە و لەبەر دەستدان. دوو بەرهەمیان- مێژووی رووەکان (نۆ کتێبە)، و گیاناسی تیۆری (شەش کتێبە)- بۆ ئەمڕۆ بایەخێکی ئەوتۆیان نەماوە، بەڵام بەرهەمی سێیەم کە لەژێر سەرناوی کاراکتەران-ە بە درێژی چەندین سەدە بەناوبانگ و کارا و کاریگەر بووە.

کاراکتەران، کۆی سی کورتە وەسفە دەربارەی جۆری جیاوازی ئەو کاراکتەر یا کەسایەتییانەی کە تیوفراستوس لە کۆمەڵگەی ئاتیندا دەیبینین. پێدەچێت تیوفراستوس لە وێنەگرتن و بەرجەستەکردنی ئەم کەسایەتییانەدا لاسایی میناندیر-ی دۆستی خۆی کردبێتەوەو لە سایەی کاریگەری ئەودا بووبێ، چونکە هەندێ لەو کەسایەتیانە لەو کەسایەتییانە دەچن کە لە کۆمیدیاکانی میناندیردا بەرجەستە کراون.

ئەم کەسایەتییانە زۆربەیان سوحبەتچی و رووخۆش و خۆش تەبع و تەبیعەتن. هەر یەکێك لەم جۆرە کەسایەتییە وەسفکراو و بەرجەستە کراوانە لاوازی ئەخلاقی خۆی هەیە، و هەر یەکەشیان بەو لاوازییە ئەخلاقییەی خۆیەوە ناو دەنرێ و بانگ دەکرێ وەکو: خەبەرساز، ماستاوچی، دوو زمان، خانەگومان و کەودەن. شێوازی تیوفراستوس، کورت و سادە و راستەوخۆ و راشکاوانەیە. وەسفەکانی زۆرجاران لاسایی کراونەتەوە و دووبارە کراونەتەوە. زۆر نووسەرانی وەکو هال، ئێرل، ئوربری و لابرویر کەوتوونەتە ژێر کاریگەری وی.

## هۆزان

**تیوکراتیوس (٣١٥- ٢٦٤ی پێش ز):**

شاعیرێکی یۆنانی ئەسکەندەرانییە و زۆر هۆزانی شوانکارەیی هەیە. زانیاری زۆر کەم دەربارەی سەرەتاکانی ژیانی وی لە بەر دەستدایە. لە سیراکوز هاتۆتە دنیاوە، ماوەیەکی لە کاسدا بەسەر بردووە، ئەنجام چوو بۆ ئەسکەندەرییە و بەتلیموسی دووەم (فیلادلفوس) پشتیوانی لێکردووە.

**بەرهەمەکانی تیوکریتوس:**

**ئیپیگرام: کورتە قەسیدەی پەندئامێز:**

بیست سێ کورتە قەسیدەی پەندئامێز دراوەتە پاڵ تیوکرتیوس، بەڵام تەنیا نۆ دانەیان ساغ بوونەتەوە و بە تەواوەتی هی ئەون.

**گۆرانی شوانکارەیی:**

تیوکرتیوس، هەمووی سێ گۆرانی شوانکارەی گوتووە و ئەم جۆرانەی خوارەوەی لە خۆ گرتووە.

**شانۆنامەی بێ گفتوگۆ (Mimes):**

پێدەچێت ئەم کۆپلە نیمچە درامیانە، زیاتر بۆ خوێندنەوە نووسرابن تا نیشاندان و نمایش کردن.

لە نێو ئەم سروودانەدا (ژنانی سیراکوزی) و (ژنی جادووگەر) لە هەموویان بەناوبانگترن.

**شانۆنامەی دێهاتی:**

تیوکریتوس، باوکی شانۆنامەی گوندییە، و زۆربەی پرەنسیپ و رێساکانی داناوە:

١- ناوەڕۆك: پێشبڕکێی ئاواز، ئەشقی نەبەکام، مەرگی دۆست.

٢- زەمینە و هاماج: چەمەنزارانی جوانی کەناری جۆگە و جۆبارانی پڕشەپۆلان، درەختان، لەوەڕگەی پەزان.

٣- کاراکتەران:

شوانان

٤- خەڵات و دیاری:

جامێك لە عاج یان دار، گوڵ، بەرخ، کۆتر، میوە، شیر، خوری و ئەو جۆرە شتانە.

بەناوبانگترین کاری تیوکریتوس لەم وارەدا ((مەرگی دافینس))"٣" و (جەژنی درەوی دیمیتر"٤")ـە.

**وردە مەلحەمان:**

ئەمە کۆمەڵە شیعرێکی داستانی کورتن کە بابەتی رەزمی (مەلحەمی) یا ئەفسانەییان لەخۆگرتووە. کە بەناوبانگترینیان (هیلاهس"٥")، کە باسی خەم و پەژارەی هەرکول لە دووری هیلاس دەگێڕێتەوە.

**شێوازی تیوکریتوس:**

بەرهەمەکانی تیوکریتوس زۆربەیان ئاڵۆز و دەستکردن، بەڵام هەندێ جار ئاسایی و سروشتین. خۆشەویستی سروشت، بەهرەی شانۆنامەنووس، تەنز و تەوس، و کاراکتەرسازی لە سەرانسەری ئەم بەرهەمانەدا ئاشکرایە.

**گوڵبژێری ئەدەبی یۆنان:**

ئاگا "٦" سیاس-ی خەڵکی ئایولیا، لە سەدەی شەشەمی زایینیدا دەستی بە کۆکردنەوەی کۆمەڵە شیعرێك کرد کە ئەمڕۆ بە (گوڵبژێرێك لە ئەدەبی یونان یان گوڵبژێری پالاتین "٧") بەناوبانگە. دوا ڕێکخستن و بڵاوکردنەوەی ئەم بەرهەمە لەلایەن سفالا "٨" س-ی خەڵکی بیزانسەوە لە سەدەی دەیەمی زایینیدا ئەنجام دراوە. ئەم گوڵبژێرە نزیکەی چوار هەزار شیعر و کۆپلەی نووسەرانی جیاوازی یۆنانی، لە سەدەی پێنجەمی پێش زایینەوە تا سەدەی شەشەمی زایینی لەخۆگرتووە.

## فەلسەفە

**زنون کیتیومی (لە دەوروبەری ٣١٠ی پێش ز لە دایك بووە):**

ئەم فەیلەسووفە یونانییە خەڵکی قوبرسە و دامەزرێنەری قوتابخانە و ڕێبازی ڕەواقییە. باوەڕی وایە کە خۆشبەختی و بەختەوەری زادە و بەرەنجامی ڕەهایی لە لەزەتە بەدەنییەکان و پەیڕەویکردنی ویستی خودایانە. فەزیلەت خێری باڵایە، و دەبێ چاوپۆشی لە ڕەنج و زەحمەت بکرێ، زنون، کاریگەری بەسەر سنکا، ئیپیکتتوس "٩"، مارکوس ئولیوس، و زۆر نووسەری دیکەوە هەبووە.

**ئیپیکوروس (٣٤٢- ٢٧٠ی پێش ز):**

خەڵکی ساموس ـە و دامەزرێنەی ڕێبازی ئەساڵەت و ئەولەویەتی لەزەتە (Hedonism). ئیپیکوروس بەختەوەری بەشەر لە شادی و شادمانی و ڕزگاری لە ڕەنج و زەحمەتدا دەبینێتەوە. بەبێ ئەوەی بە ئاشکرا نکۆڵی لە بوونی خودایان بکات باوەڕی وابوو کە خودایان کەمتر خەمی جیهان و مرۆڤ دەخۆن، کەم بایەخ و نە ئەخلاقین، و بۆیە نابێ لێیان بترسی.

لایەنگری گۆشەگیری و دوورەپەرێزی لە هەرا و هوریای جیهانە، هەڵبەتە سەرچاوەی لەزەتگەری و لەزەتخوازی وی تەنیا لەسەر بناغەی ئامانجێن نەفسپەرستانە و لەزەتێن بەدەنی، وەکو هەندێك لە پەیڕەوکارەکانی دوایی دەیانگوت، ڕۆ نەنرابوو، بەپێچەوانەوە ئیپیکوروس پێی وابوو کە فەزیلەت، ئاوەز، ڕاستگۆیی و ناسینی تەبیعەت مرۆڤ دەگەیەننە لەزەت، ئەو هاوار دەکات کە لەزەتێن بەدەنی دەبێ سادە بن و مرۆڤ دەبێ میانڕەو بێ، ئیپیکوروس کاریگەرییەکی زۆری بەسەر فەلسەفە و فەیلەسووفانی جیهانەوە هەبووە، بە تایبەتی بەسەر هوراس، و لوکرتیوس.

## ٢- سەردەمی رۆمی
## ١٤٦- پێش ز – ٥٢٩ ز

**پێشینەیەکی مێژوویی:**

روم لە ساڵی ١٤٦ی پێش ز کورنت-ی گرت و بەمەش یونانی بە تەواوەتی فەتح کرد و ئیدی لەمە بە دواوە مێژووی یونان پەیوەندییەکی زۆر نزیکی لەگەڵ مێژووی رومدا پەیدا کرد. داخستنی قوتابخانە کفرپەروەرەکان بە دەستی ژوستی نین (٥٢٥ ز)، نیشانەی کۆتایی ئەدەبیاتی کۆنی یۆنانە.

**نۆڕینێکی گشتی:**

لە سەردەمی رومیدا نووسراوانی پڕ بایەخ تاڕادەیەك کەم بوو. شیعری گەورە نەنووسراوە، ژمارەی پەخشاننووسانی پلە یەك-یش کەم بووە. پەخشانی ئەم قۆناغ و سەردەمە زیاتر بایەخی بە مێژوو، ژیاننامە، فەلسەفە، تەنز، و رەخنە داوە.

## مێژوو

**پولوبیوس(٢٠٥- ١٢٥ی پێش ز):**

خەلکی مێگالوپولیس-ە، لە ساڵی ١٦٧ی پێش. ز. دا وەکو بارمتە بۆ روم نێردرا، لەوێندەر ئاشنایەتی دەگەڵ کۆمەڵێك دۆستی فەرماندەی رومی و پیاوی ئەدەب پەروەر سیپیوئافریکانوس مینوردا "١٠" پەیدا کرد، و لەوەش دەچێت هەر لە رێگەی کۆمەکی سیپیو وە زەمینەی بۆ خۆشکرابێ کە لە ساڵی ١٥٠ی پێش. ز. دا بۆ یۆنان بگەڕێتەوە. پۆلوبیوس، لەو ماوەیەدا کە لە روم ئاکنجی بوو، زۆربەی بەشەکانی کتێبەکەی (مێژووی گشتی) لە چل بەرگدا نووسی، کە تەنیا پێنج بەرگی بە تەواوەتی ماوەتەوە، ئەم بەرهەمە کە باسی گەورەیی و شکۆی روم دەکات، مێژووی ئەو سەرزەمینەی لە ساڵی ٢٦٦ی پێش. ز. وە تا ساڵی ١٤٦ی پێش ز لەخۆگرتووە. ئەم کتێبە کتێبێکی تاقەتبەرە و دوورە لە هەر هونەرییەتێك، لەڕادەبەدەر بایەخی بە حەقیقەتە رووتەکان داوە. رستەکانی درێژ و ئالۆزن، ناوەکان نابەجێن و لە شوێنی خۆیاندا نین، بەڵام وێڕای ئەمەش رەوشی لێکۆڵینەوە، گشتگیری مێژوویی، و بێ لایەنی رەچاو کردووە.

**یوزفوس(٣٧- ١٠٠ی ز):**

یوزفوس لە ئۆرشەلیم هاتۆتە دنیاوە و بە رەوشی یەهودییان پەروەردە کراوە و گەورە بووە، پاشان لەگەڵ ئیمپراتۆر تیتوس "١١" دا بۆ روم رۆیی، یوزفوس فێری زمانی یونانی بوو و مێژووی

جەنگی جولەکەی، کە شەرح و شرۆڤەیەکی جوانی راپەڕینی جولەکان و دامرکاندنەوەیەتی بە دەستی تیتوس (٦٦- ٧٠ی ز) بە یونانی نووسیوە.

بەرهەمی دووەمی وی (میژووی کۆنی جولەکەیە) کە میژووی قەومی جولەکە لە سەرەتای بوونەوە تا سالی ٦٦ی ز تۆمار دەکات و نیشاندەدات. ئەم بەرهەمە لە بەرهەمی یەکەمی یوزفوس تاقەتبەرتر و لاوازترە.

## ژیاننامە

**پلوتارك (٤٦- ١٢٠ی ز):**

لە خارونەئا هاتۆتە دنیاوە، لە ئاتین خویندویەتی، پاشان چووە بۆ روم و لەوێندەر خەریکی دەرس دانەوە بووە، بەرهەمی گەورەی وی بریتییە لە (ژیانێن هاوتەریب) کە بریتییە لە پەنجا ژیاننامەی پیاوانی ناودار، چوار ژیاننامەیان بەجیا و سەربەخۆن و ئەوانی دی دوو بە دوون لە هەر جوتە ژیاننامەیەك ناودارێکی یۆنان لەگەڵ پیاوێکی رومدا بەراورد دەکرێ، وەکو دیموستن و سیسرون، ئەسکەندەر و ژول سزار، پلوتارك لەم بەرهەمەیدا ئەدیبان پشتگوێ دەخات، هەوڵ دراوە لە هەر جووت ژیاننامەیەکدا دەرسێکی ئەخلاقی دابدرێ. ئەم ژیاننامانە تاڕادەیەك بێ ئیحتوبارن و متمانەیان پێ ناکرێ، بەڵام لەڕووی لێهاتوویی دراماتیکی و گێڕانەوەوە، ناسك و جوان و تەڕ و تازەن و پڕن لە مەسەلەێن مرۆڤانی و لایەنی ئەقڵانی بەرجەستە. وەرگێڕانی ئەم بەرهەمە (وەرگێڕانەکانی نورت) سەرچاوەیەك بوو بۆ شەکسپیر.

## فەلسەفە

**مارکوس ئورلیوس ئانتونینوس (١٢١- ١٨٠ی ز):**

ئورلیوس-ی ئیمپراتۆری روم (١٦١- ١٨٠ی ز) دوا فەیلەسووفی گەورەی رەواقی بوو. یەکێك بووە لە ئەیارانی مەسیحییەت و چەوسێنەری مەسیحییان. بەرهەمی هەرەگرنگی ئەو دەربارەی (خود ئەندێشە)یە، ئەم بەرهەمە دوانزە بەرگە، کۆمەڵێك تێفکرین و بیر ئانینە، ئورلیوس باوەڕی وایە کە روحی مرۆڤ رێنوێنی باتینییە- باقی شتەکان هەموو بەتاڵن، مرۆڤ دەبێ گوێ بە ئازار و چەوسانەوە نەدات و چاوپۆشی لێبکات، مرۆڤان بە برا بزانێ، زەحمەت و رەنج و مەرگ بە سەبر و حەوسەلەوە تەحەمول بکات، ئورلیوس شێوازێکی توند و زبر و ئاوێتە بەزاراوەێن لاتینی هەیە، بەڵام نێوەرۆکی بەرهەمەکانی رەسەن و مرۆڤانییە.

**پلوتینوس (فلوتین ٢٠٥- ٢٧٠ی ز):**

خەڵکی لوکوپولس"١٢"-ە. خاوەنی بەرهەمی نۆمینەیە کە بریتییە لە پەنجا و چوار کتێب. دەربارەی فەلسەفەی ئەفلاتوونی"١٣"، و باوەڕی بە یەکتایی هەبووە و خودای وەکو حەقیقەتی باڵا کرد بە جێگرەوەی تێوری ئایدیالی ئەفلاتوونی، ئەو تێوری ئەفلاتوونی دەربارەی شەیتانان، یا پێناوانی بەینی خودا و ئادەمیان پێ قەبووڵە و ئەوانە بە باعیسی سەرەکی شەڕ لە جیهاندا دەزانێ. نووسین و بەرهەمەکانی پلوتینوس شاعیرانە و ڕەمزین و کاریگەرییەکی زۆریان بەسەر هنری مور، هنری وان، سپنسەر، میلتون و وردز ورس ەوە هەبووە.

## شیعری ئاوێتە"١٤"
## Satire

**لوکیانوس (لوسین ١٢٥- ٢٠٠ ز):**

هەجونووسێکی یونانییە کە لە سمیسات (ساموساتا) کە شارێکی کۆنی سوریایە هاتۆتە دنیاوە، سەفەری میسر، ئیتالیا و یونانی کردووە و تەجرەبەیەکی زۆری لەم سەفەرانە وەرگرتووە و بە تەواوەتی خووی بە ڕۆشنبیریی یونانییەوە گرتووە.

**بەرهەمە گرینگەکان:**

**دیالۆگی خودایان:**

بریتییە لە گفتوگۆیەکی خەیاڵی کە گاڵتە بە باوەڕبوون بە خودایانی یۆنانی دەکات.

**دیالۆگی مردووان:**

گفتوگۆیەکی خەیاڵییە لە هەجوی فەیلەسوفان و هاوچەرخان، ئەم دیالۆگە جۆرە وریاکردنەوەو ئاگادار کردنەوەیەکە لە گەوجایەتی ژیان.

**مێژووی راستەقینە:**

سەفەرنامەیەکی خەیاڵییە کە هەجووی ئەفسانان و مێژووی یونان دەکات. قارەمانانی حیکایەت و چیرۆکەکانی لوکیانوس لە ئەنجامدانی کارێن غەریب و سەیردا لە هەموو قارەمانانی یونانی پێشوو باڵاترین، قارەمانەکانی وی بۆ هەتاو، بۆ مانگ و دوڕگەکانی بەهەشت"١٥" سەفەر دەکەن.

**مێژوونووسین:**

وتارێکە کە گاڵتە بە زێدەوێژی، نادروستی و تەعەسوبی مێژوونووسان دەکات.

**تایبەتمەندییەکان:**

لوکیانوس، فریو و ریاکاری لە ئاین و لە ئەدەبیات و لە کۆمەڵگەدا سەرزەنشت و ریسوا دەکات، بەڵام زمانەکەی زۆر توند و تیژ و تاڵ نییە، بەڵکو رەخنەگرێکی ئارام و خۆشتەبع و تەبیعەت و تاڕادەیەك رەشبینە، هەندێ جار خەمینە، بەڵام هیچ کاتێك جڵەوی بۆ هەست و سوز شل نەکردووە و زۆربەی کات هەر رووخۆش و حەنەکچی و سوعبەتچی بووە، لەواری نووسین و نووسەرایەتیدا متمانەی تەواوی بە خۆی هەبووە و لاسایی هۆمەر، سوفستاییان، ئەفلاتوون، گەزنەفۆن، و کۆمیدیای یۆنانی دەکردەوە، بەڵام پتر حەزی لە لاسایی کردنەوەی کار و بەرهەمە جدییەکان بووە. هەڵبەتە کاری زۆری کردووەتە سەر ئاپولیوس، ئیراسموس، لاندور، و رەنگە کاری کردبێتە سەر سویفت-ش.

## رەخنەی ئەدەبی

**لونگینوس یادیونوسیوس (دەوروبەری ٨٠ی ز):**

فەیلەسووف، رەخنەگر و دانەری نامەیەکی رەخنەیی بەرز و مەزنە، هیچ زانیارییەك لەمەر ژیانی وی لەبەر دەستدا نییە، توێژەرانی ئەمڕۆ چیتر دانەری ئەم نامەیە لەگەڵ دیونوسیوس کاسیوس لونگینوسدا (٢٧٣ی ز) کە دانەری شابانو زەنوبیای پالمیرایی بوو، تێکەڵ ناکەن.

لونگینوس پێی وایە کە ئەدەبیاتی بەرز و باڵا لە هەر کات و شوێنێکدا بێ پێویستە ببێتە مایەی خۆشحاڵی، بۆیە دەبێ هەڵقوڵاوی روحێکی مەزن و هاندەرێکی روحی گەورە بێ، شێوازی بەرز و باڵا تاڕادەیەکی زۆر دەکاتە دەربڕینی روون و کاریگەر، سوورە لەسەر لاسایی کردنەوەی نووسەرانی کۆنی یۆنان، بە تایبەتی هۆمەر، ئەفلاتوون، دیوستن، و هەر سێ تراجیدیا نووسە گەورەکانی یۆنان (ئاسخیلوس، سوفوکلیس و یوریپیدس).

رەخنەگرانی ئیتالیایی، فەرەنساوی و ئینگلیزی قۆناغی رینیسانس و نەو کلاسیزم[١٦]، نامە مەزنە رەخنەییەکەی ئەو بە پڕئیحتوبارترین و پڕبەهاترین رێنوێن دەزانن. هەندێك لەو نووسەرانەی کە بە تەواوەتی کەوتوونەتە ژێر کاریگەری قووڵی ئەم نامە رەخنەییەوە بریتیین لە: بوالو، درایدن و ئەلگزاندەر پۆپ.

# پەراوێز و ژێدەران:

١- سوتێر (٢٨٣ی پێش ز): یەکەمین پاشای مەقدونی میسری کۆنە، و دامەزرێنەری خانەدانی بەتالیسەیە. وشەی "سوتێر" بە مانای رزگارکەر دێ.

٢- تیمون فیلوسی (دەوروبەری ٢٨٠ی پێش ز):

شاعیرێکی یونانییە و شیعری تەنزئامێزی گوتووە.

٣- مەرگی دافینس:

لە ئەفسانە یونانییەکاندا دافینس شوانێکی سیسیلییە کە بە دامەزرێنەری شیعری شوانکارەیی دەژمێردرێ.

٤- دیمیتر: دیمتر لە ئەفسانانی یۆنانی دا خواوەندی بەرەکەت و بەپیتییە.

٥- هیلاس:

لاوێك بوو لە هاورێیانی هەرکول کە لە یەکێك لە لەشکرکێشییەکاندا، جوانییەکەی سەرنجی خواوەندان رادەکێشێت و بۆ لای خۆیان بانگی دەکەن تا جاویدان و نەمری بکەن.

٦- ئاگاسیاس (٥٣٦- ٥٢٨ی ز): مێژوونووس و شاعیرێکی بیزانسی بووە.

٧- گوڵبژێری پالاتین:

چونکە دەستنووسی (گوڵبژێری ئەدەبی یونان) لە کتێبخانەی پالاتین، لە ئیتالیا دۆزراوەتەوە بە (گوڵبژێری پالاتین)یش بەنێویانگە.

٨- سفالاس (سەدەی دەیەمی ز) زانایەکی بیزانسی بووە.

٩- ئیپیکتتوس (٦٥- ١٣٥ی ز):

فەیلەسووفێکی رەواقی یونانی بووە.

١٠- ئافریکانوس مینور (١٨٥- ١٢٩ی پێش ز):

فەرماندەیەکی رومییە.

١١- تیتوس (٤٠- ٨١ ی ز):

ئیمپراتۆری روم بووە (٧٩- ٨١ی ز).

١٢- لوکوپولس: ناوی کۆنی شاری ئەسیوت-ی میسرە کە کەوتووەتە رەخی روژئاوای رووباری نیل.

١٣- نەو ئەفلاتوونی: یەکێکە لە قوتابخانەی فەلسەفییەکانی دنیای کۆن کە داکۆکی لە باوەڕێن ئایینی و فەلسەفی لە هەنبەر مەسیحیەتدا کردووە.

١٤- Satire (شیعری ناوێتە):

ئەم زاراوەیە بە شیعر یان بەیتێك دەگوترێ کە لە نێوەرۆکی جیاواز پێك هاتبێ، رەگ و ریشەکەی (Saturac)ـە لوسیوس داهێنەری ئەم زاراوەیە و پاشان هوراس تەواوی کردووە. رۆژئاواییان لە سەدەکانی دواتردا بە هەڵە پێیان وابووە کە لە ریشەی Satyrەوە وەرگیراوە، و سەرچاوەی هەڵەکەش ئەمەیە کە پیتی یونانی Y بە شێوەی U دەگوترێ، بۆیە ئەم دوو ریشەیە تێکەڵ بە یەکتر بوون.

١٥- دورگەکانی بەهەشت Elysium:

(لە ئایینی یونانی)دا شوێنی قارەمانان و روحانی چاکی پاش مەرگە.

١٦- نیوکلاسیزم (نەوکلاسیزم):

راپەڕینی گەڕانەوی کلاسیسزمی کۆن و بەرهەمی کلاسیکی کۆن، واتە یۆنان و روم، ئەم راپەڕینە پاش رینیسانس روویدا و لە سەدەی هەڤدەدا گەییە لوتکەی خۆی. لێرەدا سەرنجی خوێنەران بۆ ئەوە رادەکێشم کە هەندێ جار راپەڕینی نێوبراو تەنیا بە کلاسیزم ناو دەبرێ و زاراوەی نەو کلاسیسزم بە گەڕانەوەی ژمارەیەك لە نووسەرانی سەدەی بیستەم بۆ سەر هەندێ تایبەتمەندی کلاسیك دەگوترێ کە لە سەرووی هەموویانەوە دەبێ نێوی جیمزجویس-ی گەورە نووسەری ئیرلەندی ببەین.

# بەشی سێیەم

## ئەدەبیاتی رومی کۆن

## سەردەمی کۆماری

## (٢٤٠- ٢٧ی پێش ز)

**پێشینەیەکی مێژوویی:**

بە گوێرەی بۆچوونی هوراس، ئەدەبیاتی روم یان لاتین لەسالی ٢٤٠ی پێش. ز. ەوە، واتە لە سالی پاش کۆتایی یەکەمین جەنگی کارتاژی، لەگەڵ لیویوس ئاندرو نیکوس دەست پێدەکات. روم لەوە بە دواوە بۆ ماوەی دوو سەدە سەرگەرمی جەنگ و چەسپاندنی دەسەلاتی خۆی بەسەر هێزەکانی رۆژهەلاتی ناڤینی وەکو مەقدونییە، سوریا، یۆنان، کارتاژ، نومیدیا، ئەسپانیا، گول و میسر دەبێ، لە سالی ١٤٦ی پێش. ز. دا یۆنان و کارتاژ دەست لە بەرخودان و بەرەڤانی هەڵدەگرن. لەگەڵ فەتحی گول لە سالی ٥٠ی پێش ز بە دەستی ژول سزار، روم دەبێ بە بووکی بێ هەڤرکی ولاتانی مدیترانە (رۆژهەلاتی ناڤین) هەڵبەتە پێویستە ململانێ چینایەتی و جەنگە ناوخۆییەکانیش بخەینە سەر ئەم قۆناغ و سەردەمە پڕ ئاژاوە و نائارامییە.

ئەگەرچی روم بە رواڵەت خودانی رژێمی کۆماری بوو، بەلام لەڕاستیدا حکوومەت و دەسەلات بەدەستی چینە ئەرستۆکرات و دەولەمەندەکان بوو. دەسەلاتی ئەنجوومەنی سینا (پیران) هەمیشە لە رێگەی پۆمپی"١"، ژول تزار، و خەلکانی ترەوە کەم دەکرایەوە. خۆ لە سالی ٢٧ی پێش. ز. دا ئوکتاڤیوس تزار رژێمی کۆماری بۆ ئیمپراتۆری گۆڕی.

**نۆڕینێکی گشتی:**

تاوەکو پێش سەردەمی لیویوس ئەدەبیاتی ئیتالیا بریتی بوو لە وێرد و دوعایان، ئاوازی جەژن و ئاهەنگان، هۆزانێن تەنز ئامێز، و کورتە شانۆنامانی پێکەنیناوی سەرەتایی. هەڵبەتە تەنیا چەند پارچەیەك لەم ئەدەبیاتە ماوەتەوە. لیویوس و جێگرانی وی کەوتنە وەرگێڕان، وەرگرتن و لاسایی کردنەوەی نموونەکانی ئەدەبیاتی یونانی. تا پێش ساڵی ٢٧ ی پێش ز بە دەگمەن بەرهەمێکی لاتینی، چ لە هۆزان و چ لە پەخشان بەرچاو دەکەوێ کە کارێگەری ئە دەبیاتی یونانی پێوە دیار نەبێ. یەکەمین نموونەێن تراجیدیا، کومیدیا، مەلحەمە، هۆزانی لیریکی، وتاربێژی و مێژووی روم بەریز لە بەرهەمەکانی یورپیدس، میننانذیر، هومەر، سافۆ، دیموستن، و توسیدیدسەوە وەرگیراون. تاقە فۆرمێکی ئەدەبی کە لە سەردەمی کۆماری دا سەری هەڵدا. تەنزە کە شیعرێکی تەواو رومی بوو.

## شانۆنامە

**لیویوس(لوسیوس لیویوس ئاندرونیکوس ٢٧٢-٢٠٧ی پێش ز):**

مامۆستا و ئەکتەر و یەکەمین شانۆنامەنووسی لاتینییە لیویوس لە بنەچەوە یونانی و خەڵکی تارانت بوو کە لەساڵی٢٧٢ی پێش ز وەکو زیندانی جەنگی بۆ روم براوە. لەوێندەر بوو بە کۆیلەی پیاوێك بەنێوی لیویوس. ئیدی ناوی خۆی لە ناوی ئەوەوە وەرگرت و یونانی و لاتینی فێری منداڵەکانی ئەو کرد.

لیویوس پاشان ئازادی خۆی وەرگرتەوە. لە ساڵی ٢٤٠ی پێش. ز. دا ئودیسەی بە شێوەی وەرگێڕانی ئازاد کرد بەلاتینی کە بە یەکەمین بەرهەمی ئەدەبی لاتینی دەژمێردرێ. لەم وەرگێڕانە، کە بە شێوەی شیعری ناهەمواری ساتورنی[٢] یە چەند کۆپلەیەك ماوەتەوە. سەرناو و کۆپلەی نۆ تراجیدیا و کۆمیدیای لیویوس-یش لەبەر دەستدان کە وەرگێڕانی ئازادن لەبەرهەمێن یونانییەوە. هۆزانی شانۆنامەکانی لیویوس لە وەرگێڕانی ئودیسەکەی باشترن، بەڵام ئەم شیعرانەش دژوار و مردوون.

**ناڤیوس (گینوس ناڤیوس ٢٣٥- ٢٠١ی پێش ز):**

خەڵکی کامپانی و پیاوێکی سوپایی بوو، بە دووەمین شانۆنامەنووسی لاتینی دەژمێردرێ. سی و چوار کۆمیدیا و حەوت تراجیدیای نووسیوە، کە تەنیا چەند کۆپلەیەکیان ماون، شانۆنامەکانی کێشێکی ئازادتر و زمانێکی زیندووتریان لە شانۆنامەکانی لیویوس هەیە.

ناڤیوس یەکەمین شاعیری مەزنی رومی و یەکەمین شانۆنامەنووسە کە بابەتی نووسینەکانی لە رومەوە وەرگرتووە و هەڵێنجاوە.

**ئینوس (کوینتوس ئینوس ٢٣٩- ١٦٩ی پێش ز):**

ئەم شاعیرە سێیەمین شانۆنامەنووسی لاتینییە. ئینورس کۆمەڵێك بەرهەمی لە وارە جۆراوجۆرەکانی وەکو کۆمیدیا، تراجیدیا، شانۆنامەی مێژوویی، بەرهەمی هیجایی و مەلحەمی نووسیوە و لە پاش بەجێماوە. سەرناو و کۆپلەی بیست و دوو شانۆنامەی وی لەبەردەستدایە. ئینوس بە یەکەمین ئەدیبی تەواو لە جیهانی رۆژئاوادا و بە باوکی شیعری لاتینی دەژمێردرێ. ئەم شاعیرە یەجگار پابەندی هونەرە شیعرییەکان بووە.

**پلاوتوس (تیتوس ماسیوس پلاوتوس ٢٥٤- ١٨٤ی پێش ز):**

ئەم شاعیرە کۆمیدیانووسە رومییە لە ماڵباتێکی هەژار لە ناوچەی ئومبریا"٣" هاتۆتە دنیاوە. چووە بۆ روم و پێدەچێت لەوێندەر کاری ئەکتەری یا دارتاشی دیکۆری شانۆیی کردبێ. سەروەت و سامانێکیش پێکەوە دەنێت، بەڵام لە کاری بازرگانیدا ئەو سەروەت و سامانەی لە دەست داوە و ئەوسا بووە بە شاگرد نانەوا، شوێنی خوێندنی دیار نییە. کاتێ کەوتۆتە شانۆنامەنووسین، زۆر زوو دەوڵەمەند بووە، پلاوتوس لە روم کۆچی دوایی کردووە.

**بەرهەمەکانی:**

پلاوتوس نزیکەی چل یا چل و پێنج شانۆنامەی نووسیوە، بەڵام سەد و سی شانۆنامە دەدەرێتە پاڵ وی. بیست شانۆنامەی کۆمیدی لە پاش بەجێماوە کە هەر هەمووی لە بەرهەمەکانی میناندیرەوە هەڵێنجراوە و وەرگێراوە.

**شانۆنامەێن تەزویر و گۆڕینی ناسنامە:**

**ئامفیتریون:**

ئەم شانۆنامەیە لەسەر بناغەی ئەفسانەیەکی کۆن رۆنراوە. زیوس خۆی دەخاتە پێستی ئامیفیتریون-ەوە و لەگەڵ ئالکمەن-ی هاوسەری ویدا دەکەوێتە ئاشقێنی و ئەشقبازی.

**میر کوڕی"٤":**

میرکوڕی لە شێوەی سوسیادا کە کویلەیە دەردەکەوێ. ئەم کۆمیدیایە بە شێوازێکی شاد و زیندوو نووسراوە و پڕە لە ریسوایی. زۆر نووسەرانی وەکو مولیر، روترو، درایدن، کلیست، و ژیرودو کومیدیان لەو بەرهەمەوە وەرگرتووە و نووسیوە.

## شانۆنامەیین دەسیسە و پیلان:

### یەخسیرانی جەنگی:

دوو یەخسیری جەنگی، یەکێکیان کۆیلە و ئەویتریان ئەرباب و ئەشراف، دەکەونە گۆڕینی سیما و جلوبەرگی خۆیان تا زەمینە بۆ هەڵاتنی کابرای ئەرباب (ئەشراف) خۆش بکەن. هۆیو کە هەردووکیانی کڕیوە پەی بەوە دەبات کە کۆیلەکە کوڕە گوم بووەکەی خۆیەتی. لەم شانۆنامەیەدا میملێك بە ناوی ئیرگاسلوس، بە دەم شۆخییەوە جۆرە خۆشی و ناسکییەك بە شانۆنامەکە دەبەخشێت.

نووسەر سوودێکی زۆری لە تەنزی دراماتیکی وەرگرتووە، ئەم بەرهەمە عەوام پەسندە (میللی) رووداوە ناشیرینەکانی زۆر کەمە، و لایەنە کۆمیکییەکەشی لە چاو بەرهەمەکانی دیکەی پلاوتوسدا زۆر کەمە، سێبەر و کاریگەی ئەم بەرهەمە بەسەر زۆر نووسەرەوە دیارە لەوانە: ئاریوستو، جانسون، و رونزو.

### بازرگان:

لەم سوکە کۆمیدیایەدا باوك و کوڕێك لەسەر خۆشەویستی کیژێك دەکەونە رکابەری. ئەم شانۆنامەیە زۆر دیمەنی خەندەداری تێدایە. پلۆت و بابەتەکەی بەخێرایی دەچێتە پێشێ، و لوتکەیەکی یەجگار جوان و دڵگیری هەیە.

### ماڵی روحان:

ئەم بەرهەمە سوکە کومیدیایەکی خۆشە کە لاوێکی خۆشگوزەران هەوڵدەدات بادەنۆشییەکانی لە بابی بشارێتەوە. پلۆتی ئەم شانۆنامەیە زۆر لاوازە.

شەکسپیر، هیود، رنیارد و هولبرگ "٥" ئیلهامیان لەم کۆمیدیایە وەرگرتووە و لە بەرهەمی خۆیاندا سوودیان لێوەرگرتووە.

### نێرەنگباز:

یەکێکە لە کۆمیدیا خۆش و میللییەکان. بابەتی شانۆنامەکە بریتییە لە دەسیسەکاری و پیلانگێڕی ئاشقێکی لاو کە بۆ رزگارکردنی ماشوقەکەی خۆی لە چنگی رەقیب پێویستی بە پارە دەبێ. رووداوەکانی شانۆنامەکە بە خێرایی روو دەدەن، بەڵام نەخشە و پلوتەکەی هەندێ ناکۆکی لاوەکی تێدایە. دوا دیمەنی شانۆنامەکە بە مەستی قارەمانەکەوە جوان و دڵگیرە.

**ستیخوس:**

ئەم شانۆنامەیە ئەگەرچی فۆرمێکی دیاری نییە بەڵام جوانە و ژیانی ئاسوودە و سادەی کۆیلە نیشاندەدات. نە نەخشە و پلۆتێکی ئەوتۆی هەیە و نە حاڵەتی چاوەڕوانی لەلای بینەرو تەمەشاڤان دروست دەکات. باوکێك هەوڵدەدا کە دوو کیژەکەی قایبل بکات کە بە ئومێدی گەڕانەوەی هاوسەرەکانیان، کە دەمێکە بێ هەواڵن، نەبن. بە هەر حاڵ ئەو جووتە هاوسەرە بە دەوڵەمەندی دەگەڕێنەوە و بە گەرمی پێشوازییان لێدەکرێ.

**ترینوموس:**

ئەم شانۆنامەیە دەربارەی پیاوێکی گەنجە کە ناتوانێ جیازی بۆ خوشکەکەی فەراهەم بکات. یەکێك لەلایەنە غەریبەکانی ئەم شانۆنامەیە ئەوەیە کە دەوری ژنی تێدا نییە.

**دووباکید:**

ئەم شانۆنامەیە پلۆت و نەخشەیەکی کۆن و سواوی هەیە کە بریتییە لە حیلەیەك بۆ وەدەست هێنانی پارە. وەسفی کاراکتەری شانۆنامەکە زۆر سەرکەوتووە، بەڵام خودی شانۆنامەکە تارادەیەك ناپوختە دێتە بەرچاو.

**کاسینا:**

شانۆنامەیەکی دوور لە نەزاکەتە. لە بونیادی شانۆنامەکەدا گرێ کردنەوە بەسوود وەرگرتن لە دووبارە ناسینەوە ئەنجام دەدرێ. بونیادی شانۆنامەکە وەستایانە و تۆنەکەی مکوم و بتەوە.

**شانۆنامەی کاراکتەر (کەسایەتی):**

سەربازی خۆ هەڵکێش: ئەمە درامایەکی ناپوختەیە و لەسەر بنەمای کەسایەتی سەربازێکی فشەکەر رۆنراوە. کاریگەری ئەم درامایە بەسەر ترنس، یوداڵ، دولچی، بانیف، مارشال، گریفیوس، و هولبرگ-ەوە بە زەقی دیارە.

**گەنجی تەڵا:**

کۆمیدیایەکی وەستایانەیە کە بە دەوری تەوەری کەسایەتییەکی پیسکەدا دەسوڕێتەوە. هەندێ کەس پێیان وایە ئەم بەرهەمە لاسایی کردنەوەی شانۆنامەیەکی ونبووی میناندیرە. سلکردنەوە و پارێزی لەڕادەبەدەر دەبێتە هۆی ئەوەی کە کابرای پیسکە گەنجەکە لە دەست بدات. تانوپۆو چنینی پلۆتی دراماکە لوژیکییە.

**شانۆنامەێن ناسینەوە:**

**کارتۆنی جەواهێرنیشان:**

ئەم شانۆنامەیە نەخشە و پلۆتێکی بازاڕی و سواوی هەیە، کارتۆنێکی چکۆڵە ناسنامەی کیژێکی کۆیلە کە لە بنەماڵەیەکی ئەسلزادەیە ئاشکرا دەکات، هەنگێ باوکێك قاییل دەبێ کە کوڕەکەی لەگەڵ ئەو کیژەدا زەماوەند بکات. ئەم کوڕە بە بوێرترین ئاشقی ناو کۆمیدیای تازە دەژمێردرێ. هەڵبەتە چەند دیمەنێکی ناشیرین و ناپەسندیشی تێدایە.

دەقی شانۆنامەکە دەستکاری زۆر کراوە.

**جمکانان:**

ئەم بەرهەمە بەناوبانگترین شانۆنامەی پلاوتوسە جیابوونەوەی جمکانەکان دەبێتە مایەی هەڵەی سەیر و سەرنج ڕاکیش. سەرەنجام گرێی شانۆنامەکە بە یەکتر ناسینەوەی ئەم دووە، دەکرێتەوە. شەکسپیر لە دانانی شانۆنامەی (کومیدیای هەڵەکان)دا لە کاریگەری ئەم شانۆنامەیە بەدەر نەبووە، بەڵام کۆتایی ئەم دوو شانۆنامەیە چوونیەك نییە.

**پەت:**

بابەتی شانۆنامەکە ڕزگاری ژنێکی ئابرومەندە لە چنگی کابرایەکی دڵڕەشی پۆرخز. پیاوێك بەدیتنی ئەو پەتەی کە بە جانتای ژنی قارەمانی چیرۆکەکەوە بەستراوە، پەی بە ناسنامەی ئەو دەباتەوە و بۆی دەردەکەوێ کە ئەمە کیژە ونبووەکەی خۆیەتی. ئەم درامایە لەڕووی هاماجیرۆمانتیکی، کاراکتەرسازی لوژیکی، ڕووداوی دراماتیکی، هونەری تەوس و توانج و زیندوویەتییەوە زۆر سەرکەوتووە، هیوود دڵبەندی ئەم بەرهەمە بووە و لە کاریگەریی بەدەر نەبووە.

**شانۆنامەکانی دیکەی پلاوتوس:**

گوندی، کۆمیدیای باج، ئیپیدیکوس، ئیرانیان، کارتاژیان، قالۆنچان.

**تایبەتمەندییەکانی شانۆنامەکانی پلاوتوس:**

١- لێکدانی ڕەگەزانی یونانی و رومی (دیمەنەکان لە یونان-ن، بەڵام شوێن و داب و نەریتەکان هەموو ڕوومییە.

٢- پلۆتی گونجاو و سفت چنراو (بەڵام نەك هەمیشە).

٣- کاراکتەرانی قەراردادی (تەقلیدی).

٤- کێش و وەزنی ئازاد و هەمە جۆر، پتر تروکائیکی حەوت یا هەشت کۆلەکەیی، و هەندێ جار ئیامبیك.

٥- دیالۆگ لەگەڵ روحاندا.

٦- تۆن و ئاوازی زۆر.

**کورتەیەکی رەخنەکان:**

رەنگە گەورەترین کەم وکوڕی بەرهەمەکانی پلاوتوس کۆنی و دووبارە کردنەوە بێ، بۆ نموونە نەخشە و پلۆتی چوار شانۆنامە لە کۆی بیست شانۆنامەکەی وی لەسەر بناغەی ئەو فەند و فێڵانە رۆنراون کە ئاشقان بە مەبەستی فەراهەمکردنی پارەو پۆل پەنایان بۆ بردوون. هەروەها کەم و کوڕییەکی دیکەی بەرهەمەکانی پلاوتوس سوود وەرگرتنە لە کاراکتەرانی تەقلیدی، وەکو ئاشق و ئەڤینداری لات و دەستکورت، مێمڵ، کۆیلەی پیلانگێڕ. هەندێ تەگبیری دیکەش کە بۆ نیشاندانی روخۆشی و شۆخ تەبعی بەکار براون، کۆنن وەکو ترساندنی کۆیلەیەك و لەو بابەتە شتانە. بەڵام وێڕای ئەمەش، لە چۆنیەتی مامەڵە کردن لەگەڵ پلۆت، کاراکتەرسازی، و شێوەکانی پیشاندانی شۆخی و سوعبەتدا، هەمە رەنگییەکی ئاشکرا لە بەرهەمەکانیدا بەرچاو دەکەوێ.

پلاوتوس، بایەخ بە یەك گۆشەی ژیان —بەشێوەیەکی گشتیش بە گۆشەیەکی بێ بایەخ- دەدات، هەڵبەتە نابێ ئەوە ژبیر بکرێ کە ئەو بە مەبەستی فێرکردن نانووسێت، بەڵکو بە مەبەستی سەرگەرمکردن دەنووسێت و لەم کارەشدا سەرکەوتووە.

پلاوتوس، پابەندی یەك جۆرە تەکنیك نییە، پەلەکاری پلاوتوس لە واری نووسیندا دووچاری زۆر ناکۆکی و دووبارە کردنەوە و کاوێژکردنەوەی کردووە، بەڵام وێڕای ئەمەش لە واری کێش و وەزن، حاڵەتی سروشتی دیالۆگ، زمانی زیندوو، سادە، رەوان و دوورەپەرێزی لە زاراوەێن یۆنانی، مایەی ستایشە.

دوا قسە سەبارەت بەوەی کە پلاوتوس بە هۆی زبری و شاشی و ناپەسندی وشەوە بووە بە مایەی سەرزەنشت و گازاندە، دەتوانین بڵێین کە بە خۆشتەبعی بەردەوام و (جگە لە شانۆنامەی گوندی) زیتەڵی و چەلەنگی و خۆشڕەفتاری خۆی، ئەوەی قەرەبوو و پڕکردۆتەوە.

**ترنس (پوبلیوس ترنتیوس ئافر ١٨٥- ١٥٩ی پێش ز):**

شاعیرێکی کۆمیدیانووسی رومییە، لە کارتاژ هاتۆتە دنیاوە، ترنیتوس بوکانوس ئەوی بە کۆیلەیەتی بۆ روم هێناوە، فێری خوێندەواری کردووە و پاشان ئازادی کردووە. وا باوە کە ترنس

لە دۆستانی نزیکی سیپیوئافریکانوس مینور بووە، ئەمیش شانۆنامەی نووسیوە کە لە چەپۆکی ڕۆژگار دەرباز بوون، ترنس لە رومەوە بۆ یونان چووە و پێدەچێ مەبەستی لەم سەفەرە کۆکردنەوەی شانۆنامەکانی میناندیر بووبێ. هەندێ پێیان وایە لە یۆنان مردووە و هەندێکی دی لایان وایە لە دەریادا، لە کاتی گەڕانەوەی بۆ روم مردووە.

**بەرهەمەکانی ترنس:**

هەر هەموو شانۆنامەکانی ترنس ماونەتەوە. چوار شانۆنامەی لە بەرهەمەکانی میناندیرەوە وەرگیراون و دوو شانۆنامەیشی لە بەرهەمەکانی ئاپولودوروس"٦"-ی خەلکی کاریستوس-ەوە وەرگیراون کە بەخۆی لە موریدان و پەیڕەوانی میناندیر بووە.

**ژنی ئاندروس (ئاندریا):**

ئەم کۆمیدیایە لە بنەڕەتدا وەرگێڕانی یەکێك لە شانۆنامەکانی میناندیر-ە، پلۆت و نەخشەکەی سادەیە: لاوێکی ئاتینی حەز لە کیژێکی بیانی دەکات، بەڵام ناچار دەبێ لەگەڵ کیژێکی دیکەدا زەماوەند بکات. سەرەنجام ناسنامەی کیژە بیانییەکە، کە ئاتینییە، ئاشکرا دەبێ. سێبەری ئەم کۆمیدیایە بەسەر ستیل، بلامی، و تورنتون وایلدەرەوە دیارە.

**خود ئازاری:**

ئەم شانۆنامەیە لە میناندیرەوە وەرگیراوە، پلۆت و نەخشەکەی کۆن و سواوە، میندیوس باوکێکە کە لە بەدگومانی دەربارەی کوڕەکەی ژێوان دەبێتەوە و گیرۆدەی عەزاب دەبێ. کوڕە ئاشقی کیژێك دەبێ و بە ڕەزامەندی بابی زەماوەند لەگەڵ کێژەدا دەکات. کرمیس باوکێکی دیکەیە و لە ڕادەبەدەر متمانە بە کوڕەکەی دەکات و لاف و گەزافێکی زۆری پێوە لێ دەدا بەڵام کاتێ پەی بەوە دەبات کە کوڕەکەی ئاشقی ژنێکی سوزانی بووە، ئەویش گیرۆدە و گرفتاری عەزاب دەبێ. سەرەنجام بووکەکەی میندیوس کچی کرمیس دەردەچێ، ئەم درامایە پەیامێکی جددی لەخۆگرتووە کە: مرۆڤ دەبێ خۆی لە بیر و خەمی کاری خۆیدا بێ، ترس لەڕێگەی رووبەڕووکردنەوەی باب لەگەڵ باب، و کوڕ لەگەڵ کوڕدا تایبەتمەندی کاراکتەرانی جۆراوجۆر ئاشکرا و بەرجەستە دەکات.

**خواجە:**

ئەم کۆمیدیایە لە شانۆنامەیەکی میناندیرەوە بە هەمان سەرناو وەرگیراوە. سەرکەوتووترین شانۆنامەی ترنس-ە، ئەگەرچی لەڕووی ئەخلاقییەوە هەندێ جار ئیرادی لێدەگیرێ، بەڵام شانۆنامەیەکی شادیبەخش و سەرگەرمکەرە و لە باری هونەرییەوە پوختەیە. لە نەخشە و

پلۆتی شانۆنامەکەدا ئەشقبازی، رووداو، گۆڕینی ناسنامە و ئاشکرا بوون و ناسینەوە زۆر وەستایانە ئاوێتە کراوە. کاراکتەرسازی شانۆنامەکەش مایەی سەرنجە. ئەم کۆمیدیایە کاری کردۆتە سەر یودال، شەکسپیر، و کۆمیدیای تازە.

**فورمیو:**

لە شانۆنامەیەکی ئاپولودروس-ەوە وەرگیراوە. کۆمیدیایەکی خەندەدارە کە ئاشکرا بوون و ناسینەوە و پارە، بابەتی سەرەکی پلۆتەکەی پێك دەهێنن. کەسایەتی ئانتیفو و دەمیفۆ زۆر سەرکەوتووانە وێنە گیراون.

نێرەنگەکانی سکاپین-ی مولیر لە ژێر کاریگەری ئەم درامایەدا نووسراوە.

**برایان:**

ئەمەش لەسەر شێوەی شانۆنامەیەکی میناندیر نووسراوە. بە زەنی ترین بەرهەمی ترنس دەژمێردرێ، کە پلۆتێکی دوو لۆنەی هەیە، بەڵام نەدەسیسە لە ئارادایە و نەناسینەوە: بابەتی شانۆنامەکە لە سەرەتاوە بریتییە لە باس و خواس و گەنگەشە و لایەنگری لە زەبت و رەبت لە هەنبەر بێ موبالاتی لەواری پەروەردە و فێرکردندا، شانۆنامەکە بە وەرچەرخانێکی سەرسامکەر کۆتایی دێ، کاراکتەرسازی زۆر وەستایانە ئەنجامدراوە. یەکێك لە لایەنە ناباوەکانی ئەم بەرهەمە بەکارهێنانی زۆری مەنەلۆگ و گفتوگۆ لەگەڵ خوددایە. سێبەری ئەم کۆمیدیایە بە قوتابخانەی مێردان-ی مۆلیر و باوکان-ی فیلدینگ-ەوە دیار و ئاشکرایە.

**تایبەتمەندییەکانی شانۆنامەکانی ترنس:**

واری بابەتی شانۆنامەکانی ترنس سنووردارە، بنەمای پێنج لەسەر شەشی شانۆنامەکانی وی بریتییە لە زەماوەند و زەوجینی نابەکام، لەم پێنج شانۆنامەیەش گرێی چواریان بە ئاشکرا بوونی ناسنامەی کیژێك وەکو هاووڵاتییەکی ئاتینی، دەکرێتەوە. لە شانۆنامەکاندا زنجیرەی رووداوەکان وەستایانە پێکەوە دەچنرێ و کاراکتەرسازی زۆر دڵگیر و سەرکەوتووە. غیابی هەموو شت زانێك کە کاراکتەرانی شانۆنامەکە بەرەو چارەنووسی حەتمییان ئاراستە بکات، یەکێکە لە تایبەتمەندییە هەرە گرینگەکانی شانۆ نامەکانی ترنس.

**کورتەیەکی رەخنەکان:**

بەشوشی و رووخۆشی لە بوونی ترنسدا کەمە، شانۆنامەکانی لە ئەندازە بەدەر جدین، شادمانیان کەم تێدایە و لە توانای پێکەناندن بەدەرن، ئەگەرچی پلۆتەکانی بونیادی بتەویان هەیە، بەڵام زۆر بازاڕی و سواو و دووبارەن، بەڵام وێڕای ئەمەش شانۆنامەکانی ترنس لایەنی

ئیجابی زۆریان هەیە: ناسکی و رازاوەییان مایەی سەرنجە. مەسەلە و بابەتی واقیعی دەخەنە بەر باس. وێنەگرتنی کەسایەتی و کاراکتەرەکان وردو لوژێکییە. زمانی ترنس سروشتی، سادە، پوختە، راشکاو و راستەوخۆ و کورتبڕە.

**بەراوردی نێوان پلاوتوس و ترنس:**

شێواز: شێوازی ترنس پوختەتر، یەکپارچەتر و هونەرمەندانەترە.

تۆن: ترنس تۆنێکی ناغرانەتر، خۆشتر، و مرۆڤانی تری هەیە.

پرەنسیپی ئەخلاقی: ترنس لە چاو پلاوتوسدا هیچ جۆرە رێگەیەکی پێشڤەچوونی پرەنسیپی ئەخلاقی نادات.

خۆشتەبعی: بەرهەمی ترنس کەمتر پێکەنین ناوەرە. شانۆنامەکانی سوعبەت و شۆخییان تێدایە بەڵام ئەم شۆخییانە مولائیم و ناغرانەیە و لە چاو شانۆنامەکانی پلاوتوسدا جدیترن.

پلۆت: پلۆتی شانۆنامەکانی ترنس لەڕووی هەمە جۆرییەوە هەژارە، بەڵام هاوئاهەنگی و روونی و یەکێتی و یەکپارچەیی زیاتریان تێدایە.

کاراکتەرسازی: هەمە جۆری کاراکتەرەکان لە بەرهەمی ترنسدا کەمترە، و نۆڕینی وی سنووردارترە، بەڵام کاراکتەرسازی وی دیارتر و گونجاوترە.

**دەربڕین و گوزارشت:**

زمانی ترنس سادەتر و رازاوەترە و کەمترین نزیکی لە زمانی خەڵکی کوچە و بازاڕەوە هەیە.

## Satire ((تەنز))

### لوسیلیوس (گایوس لوسیلیوس ١٨٠- ١٠٢ی پێش ز):

ئەم شاعیرە رومییە بە دامەزرێنەری بەرهەمێکی ناوەڕۆك جیاواز وەکو ژانرێکی ئەدەبی سەربەخۆ دەژمێردرێ. وتاربێژی کۆڕی سیپیو (سەرداری بەناوبانگی رومی) بوو. سی بەیتی ناوەڕۆك جیاوازی داناوە کە تەنیا هەندێ پارچە و کۆپلەی (نزیکەی ١٣٠٠ بەند) ماوەتەوە. لوسیلیوس شیعرەکانی بۆ خەڵکی ئاسایی و رەمەکی مەردم داناوە. زیاتر لە روح و گیانی کۆمیدیای کۆن نزیك بووە. لە هەندێ شیعریدا هێرش دەکاتە سەر خەڵکانێکی دیار، یان لاوازی ئەخلاقی مەردم دەداتە بەر پلار و توانج. بەڵام گەلێك لە شیعرەکانی دیکەی وی بە مانا و چەمکی تازە ناچنە خانەی هەجووەوە. بەڵکو بریتیین لە هەواڵی سەفەران، ستایشی سیپیو و شەرح و شرۆڤەی دادگاییەکان. ئەم شاعیرە دوژمنی دووڕوویی و ریاکارییە. زمانێکی

تیژ و توند و راشکاوو ئەباوی هەیە. لوسیلیوس وەزنی تروکائیکی حەوت سیلایی، ئیامبیك، یان شین و لاوانەوە بەکار دەبات، ئەو شێواز و قالبی شیعری تێکەڵی لاتینی بونیادنا و سوودوەرگرتنی لە حیکایەت و ئەفسانە و رووداونووسی و گفتوگۆ کرد بەباو.

## فەلسەفە

### لۆکرتیوس (تیتوس لوکرتیوس کاروس ٩٩- ٥٥ی پێش ز):

شاعیر و فەیلەسووفێکی رومییە، لە روم لە دایك بووە، ئێمە شتێکی ئەوتۆ دەربارەی ژیانی نازانین، وا دیارە لە بنەماڵەیەکی خانەدان و لە دۆستانی سیسرون و میموس "٧" (پەنا و هاندەری شاعیران، لەوانە کاتولوس) بووە، وا باوە کە لوکریتوس لە ئەنجامی خواردنەوەی شەرابێکی ئەشق ناوەردا تووشی جۆرە شێتییەکی ناو بەناو بووە و کە جار جارە بەهۆش هاتووەتەوە لەو بەینەدا بەیتێکی دەربارەی سروشتی شتان نووسیوە و سیسرون-ی وتاربێژی بەناوبانگ بەو بەیتەدا چووەتەوە و راستی کردووەتەوە. لوکرتیوس لە تەمەنی چل و نۆ ساڵیدا خۆی دەکوژێت.

**بەرهەمەکانی لوکرتیوس:**

**دەربارەی سروشتی شتان:**

بەیتێکی تەواو نەکراوی فەلسەفییە لە شەش بەرگدا (٧٤١٥ بەیتە) لەسەر وەزنی شەش کۆڵەکەیی سێ سیلابی هۆنراوەتەوە. کاریگەری دیموکرتیوس، ئەمپدوکلیس، هۆمەر، ئەنیوس و ئەپیکوروس بەم بەرهەمەوە دیار و ئاشکرایە. کوکرتیوس لەم بەیتەدا هەوڵدەدا بەشەر لە ترسی خودایان رزگار بکات، و ئەوە بسەلمێنێ کە روح شتێکی ماددییە لەگەڵ لە دایك بوونی بەشەردا لە نێو دەچێت. ئەم بەرهەمە هەندێ مەزەندە و پێشبینی سەیر و وردی لەخۆ گرتووە (بە گوێرەی تێورییە زانستییەکان و کەشفیاتی سەد ساڵی رابردوو) دەربارەی بونیاد و پێکهاتەی ئەتۆم، پەرەسەندن، مرۆڤ ناسی، و گۆڕانکاری رێکەوتەکی لە زیندەوەرزانێدا.

**بیرە بونیادییەکان:**

تێوری ئەتۆمی: (پتر لە کتێبی یەکەم و دووەم دا هاتۆتە دەربڕین، و تەقریبەن بە شێوەیەکی گشتی لە دیموکریتوس و ئەپیکوروس-ەوە وەرگیراوە).

هیچ شتێك لە نەبوونەوە نایەتە ئارا و هیچ بوونێك لەنێو ناچێت. جیهان بێ کۆتاییە، و لە هاماج و گەردیلەی بێ کۆتایی، واتە لە ئەتۆمان پێکهاتووە. ژمارەی ئەتۆمان بێ کۆتاییە

بەڵام جۆرەکانی ئەتۆم کۆتاییان هەیە. جیاوازی ئەتۆمان لە کێشدا، ئەندازە و فۆرمی ئەتۆمانە. ئەتۆمان نەگۆڕ و پایەدارن و هەمیشە لەجوڵەدان.

**تیۆری روح و گیان (کتێبی سێیەم):**

روح دەبێ بەتەواوەتی بە گوێرەی ماددە بێتە رونکردنەوە- ئەتۆمانی زۆر ناسك، نەرم و جوڵەدار، یەکەیەك دێننە ئاراوە کە لە دوو بەش، لە ئانیما و لە ئانیموس پێك دێت. ئانیما چەق و هۆی ژیانە، و ئانیموس شوێنی ئاوەز، هەست و ویستە. ئەتۆمانی روح لە کاتی لە دایك بووندا دەبن بە بەشێك لە بەدەن، لە کاتی مردندا بەدەن بە جێ دەهێڵن تا ببنە پاژی تر لە تەبیعەتدا (لوکرتیوس بیست و هەشت بەڵگە بۆ سەلماندنی مردنی روح دێنێتەوە.).

**باوەڕێن ئایینی:**

باوەڕی بنجبڕ بە خودایانی یونانی و رومی- خواوەندانێ بە توانای داهێنانی مەزن و بەهرەی ئەخلاقی کەمەوە- باوەڕێکی درۆیە، و لە ترس و خورافاتەوە هەڵدەقوڵێ. چونکە ئەم جۆرە خودایانە هەرگیز بوونیان نییە. (ئیدی ئایا لوکرتیوس باوەڕی دروستی بە یەك خوا یان چەند خوایەك هەبووە، ئەمە روون و ئاشکرا نییە- چونکە هەندێ جار بە خودایانی گۆشەگیر، تەواو ئارام و خۆشحاڵ، و بێ خەبەر لە کاروباری دنیا، کە لە فەزای درەخشانی نێوان دنیایەکان ئاکنجین، هەندێ جاری دی بەهێزین سروشتیان دەزانێ کە لە شێوەی ئەتۆماندان و لەهەموو شوێنێکی جیهان بوون و ئامادەگییان هەیە):

**ئەخلاق:**

لوکرتیوس مورید و پەیڕەوی پرەنسیپی لەزەتخوازی-ی ئەپیکورە. خۆشبەختی و بەختەوەری لە رەهایی و رزگاربوون لە ترس لە خودایان، ترس لە مردن، و ترس لە ژیانی پاش مردن و باوەڕی وایە مرۆڤ بۆ ئەوەی بگاتە شادی و بەختەوەری دەبێ خۆی لە کۆمەڵگە بە دوور بگرێ و رێگەی ئەقڵ و فەزیلەت بگرێتە بەر. هەڵبەتە ئەو هەرگیز خۆی لە قەرەی پێناسە کردنی فەزیلەت نادات، بەڵام ژمارەیەکی زۆر لە فەزیلەت و لە رەزیلەت دەژمێرێ.

شێواز: شێوازی لوکرتیوس لەڕادەبەدەر راستەوخۆ و تاقەتبەرە، بەڵام هەندێ جار هەست و سوزی بەگەڵ دەکەوێ و جوان و دڵگیر دەبێ. سوودی زۆر لە زاراوەێن کۆن، دەستەواژەی غەریب و گونجانی حەرف و پیتان، حەرفی هاودەنگ و هاوسەدا و رەمز و خواستن وەردەگرێ.

**کاریگەری لوکرتیوس:**

لوکرتیوس، کاریگەرییەکی زۆری بەسەر کارتولوس، هۆبس "٨"، روسو، و ڤولتیرەوە هەبووە.

## هۆزانێن لیریکی

### کاتولوس (گایوس ڤالیریوس کاتولوس ٨٤- ٥٤ی پێش ز):

شاعیرێکی رومییە، لە بنەماڵەیەکی دەوڵەمەند، لە ڤیرونا "٩" هاتۆتە دنیاوە، کاتولوس لە دەوروبەری ساڵی ٦٢ی پێش ز کلودیا (لسبیا، ئیلهامبەخشی شیعرەکانی) لە روم بینی، نزیکەی پێنج ساڵ پەیوەندی ئەڤینداری لەگەڵدا هەبوو، و زۆربەی ئەم ساڵانەی لە روم گوزەراندو بەسەر برد، لە ساڵی ٥٧ی پێش. ز. دا وەکو ئەندامی گرووپی میموس سەفەرێکی بتینیا "١٠"-ی کرد، پاش گەڕانەوەی بۆ ئیتالیا لە سیرمیو "١١" و ڤیرونادا نیشتەجێ بوو، و جار جارێ سەفەری روم-ی دەکرد.

#### بەرهەمەکانی:

کاتولوس، لە ژێر کاریگەری راستەوخۆی گەورە شاعیرانی لیریکی وەکو سافو، ئالسیوس، کالیماکوس، شاعیرانی ئەسکەندەرانیدا بووە، هەروەها قەرزارباری شاعیرانی لاوی رومی و موریدانی قوتابخانەی ئەسکەندەرییە-ی وەکو سینا "١٢" و کالڤوس "١٣"ـە، کاتولوس سەد و شازدە شیعری لە پاش بەجێماوە.

#### شیعرە درێژەکانی:

شیعرە درێژەکانی کاتولوس بریتیین لە دوو شیعری شایی و زەماوەند (٦١- ٦٢)، شیعرێکی غەزەل (٦٣)، بەیتێکی مەلحەمی کورت (٦٤)، و پێنج شیننامە "١٤" (٦٥، ٦٨، ٧٤). بە شێوەیەکی گشتی شیعرە درێژەکانی شاعیر لە چاو شیعرە کورتەکانی دا زیاتر بایەخ بە دیوی دەرەوە دەدەن و کەمتر سۆز و سۆزداری لەخۆ دەگرن، بابەتە شیعرییەکانی تری کاتولوس (شیعری زەماوەندی، مەلحەمی و لاوانەوەن) ئەگەرچی لە شیعرە لیریکییەکانی دوورن، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بابەت و تیمەی لیریکی فرەیان لەخۆگرتووە.

#### شیعرە کورتەکانی:

#### هۆزانێن لیریکی (نزیکەی ٦٥ غەزەلە):

بە ئاسانی دەتوانرێ شیعرە لیریکییەکانی کاتولوس لە چوار گرووپدا ریزبەندی بکرێن:

١- دەربارەی ئەڤینی (بەتایبەتی بۆ لسبیا) کە بە گرنگترین بابەت دەژمێردرێ، ئەم شیعرانە باسی پەیوەندی کاتولوس لەگەڵ کلودیا-ی هاوسەری میتلوس سیلر-ی کونسوڵ و حوکمڕانی باکووری ئیتاڵیا دەکەن. کلودیا ژنێکە زیرەك، جوان، بێ موبالات و سەربەست. غەزەلەکانی کاتولوس لێوان لێون لە هەستێن جۆراوجۆر و هەڵچوون و جۆش و خرۆشی توند

(٥٠، ٥١): ستایشی جوانی کلودیا (٨٦)، دوو دڵی لە ئەڤینداری ئەو (٨٥- ٩٢)، غیرە و حەسودی (٧٦- ٧٧)، بێ موبالاتی (١١).

٢- شیننامەکان:

ناودارترینیان شیوەنێکە بۆ براکەی (١٠١).

٣- کۆمەڵێك شیعر دەربارەی سەفەر و گەڕانەوە بۆ نیشتیمان (٣١- ٤٦).

٤- هۆزانێن جۆراوجۆر:

ئەم گرووپە بریتییە لە حیکایەت (١٠- ٥٣)، سەرزەنشتان (٣٠، ٣٨، ٤٠)، دوعا و درودان (٩، ١٣، ٢٨)، یەك تازیەنامە (٩٦)، یەك سروودی ستایش(٣٤)، گۆرانییەکی بادەنۆشی (٢٧)، هەندێ شیعری دیکە.

**شێواز و جۆری مامەڵە کردن:**

دەروونگەرایی، گەرمی، ناسکی، جوانی، جۆش و خرۆش و راستگۆیی خەسڵەتی شیعرەکانی کاتولوس بووە، دەربڕین و گوزارشتی وی ئاسایی و سادە و دیالۆگییە- پڕە لە کورتبڕی و خوازە و خواستن. کاتولوس نزیکەی دوازدە وەزنی جۆراوجۆری بەکار هێناوە، بەتایبەتی شیننامە، شەشینە (شەش سیلابی)، ئیامبیك، و یازدە سیلابی.

**کاریگەری کاتولوس:**

کاتولوس کاری کردۆتە سەر ئەدەبیاتی رومی (بەتایبەتی ڤیرجیل، مارشال"١٥" و ئوڤید). کاریگەری وی بەسەر ئەدەبیاتی رۆژهەڵاتەوە لە ساڵی ١٥٠٠ی ز بەدواوە و (بەتایبەتی بەسەر ویات، سیدنی، کمپیون، جونسن، ڤولتیر، هریك، سویفت، بایرون، لاندور، تینی سن، و سوین برن)ەوە ئاشکرا و دیارە.

**بایەخی کاتولوس:**

ئەگەرچی قەوارەی شیعرەکانی کاتولوس زۆر کەمە یان بچووکە (بە هەمووی نزیکەی ٢٣٠٠ بەیتە) لەگەڵ ئەمەشدا بە یەکێك لە سێ شاعیری گەورەی لیریکی لاتین (دووانەکەی دی هۆراس فیرجیل)ن دەژمێردرێ، شەقڵی مرۆڤانی، بتەوی و کۆکی، راستگۆیی، و هونەرییەتی شیعرەکانی دەیخەنە ریزی شاعیرانی وەکو سافو و شیلییەوە. میکاولی بە شاعیرێکی چاکی دەزانێ و تینی سن-ش بە حەساسترین شاعیری رومی دەزانێ.

## وتاربێژی

### سیسرون (مارکوس تولیوس سیسرون ١٠٦- ٤٣ی پێش ز):

خەتیب، سیاسەتوان، نووسەر، فەیلەسووف، نامەنووس و شاعیرە. لە ئاپینوم، لە بنەماڵەیەك لە چینی جەنگاوەران لە دایك بووە. خوێنەوارییەکی زۆر باشی هەبووە. لە ساڵی ٨٩- ٨٧ی پێش ز خزمەتی زۆر باشی کردووە. پاشان دەڕوات بۆ روم و خەریکی خوێندنی ماف، زانستە رەوانبێژییەکان و فەلسەفە دەبێت. سیسرون لە واری حیکمەتی تیۆریدا بەلای ئەفلاتووندا (لایەنگرانی گومانی میانڕەو) دایدەشکێنێ و لە واری حیکمەتی پراکتیکی و عەمەلیدا رێچکەی رەواقییەکان هەڵدەبژێرێ. سیسرون یەکەمین وتاربێژی گشتی خۆی لە ساڵی ٨١ی پێش ز ئەنجام دەدات.

لە ساڵی ٧٥ی پێش ز دەبێ بە کویستور"١٦"-ی سیسیل، و لە ساڵی ٦٦ی پێش ز دەبێ بە پرایتور"١٧" و لە ساڵی ٦٣ی پێش ز دەبێ بە کونسوڵ"١٨". لە ساڵی ٥٨ی پێش ز رەوانەی تاراوگە دەکرێ، بەڵام پاش هەژدە مانگ جارێکی دیکە دەگەڕێتەوە، لە ساڵی ٥١ ی پێش. ز. دا دەبێ بە حوکمڕانی کلیکیە"١٩". لە ساڵی ٤٩ی پێش. ز.دا دژی ژول تزار دەوەستێ و پەیوەندی بە پومپییەوە دەکات، بەڵام پاش تەواو بوونی جەنگی ناوخۆ تزار دەیبەخشێت، سیسرون لە ساڵانی ٤٤-٤٣ی پێش ز لەگەڵ مارك ئانتونی"٢٠"دا (مارکوس ئانتونیس) دەکەوێتە رکابەری و دوژمنایەتی، پاش ئەوەی ئوکتافیانوس (ئوگوستوس"٢١") دەستی بەسەر رومدا گرت، سیسرون نەفی دەکرێ و ئەنجام بە دەستی سەربازەکانی ئانتونینوس دەکوژرێ.

#### بەرهەمە گرنگەکانی:

#### کۆمەڵە نووسراوێك لەواری زانستە رەوانبێژەییەکاندا:

#### دەربارەی وتاربێژی (٥٥ی پێش ز):

ئەم بەرهەمە دیالۆگ و باسێکە لە سێ کتێباندا کە چۆنیەتی هەڵبژاردنی بابەت، دارشتن و رێکخستن، چۆنیەتی گوزارشت و دەربرین، بەکارهێنانی پەیڤان-ی لەخۆگرتووە. ئەم نووسراوە هەرگیز و نە لە دوور و نە لە نزیك خۆی لە قەرەی شێواز بەگشتی یا رەوانبێژی بەتایبەتی، نادات. بەڵام بایەخ بە رووداوە عەمەلی و پراکتیکییەکان دەدات. ئەم بەرهەمە رەنگدانەوەیەکی چاکی شێوازی سیسرون-ە.

#### بروتوس (دەوروبەری ٤٦ی پێش ز):

ئەمە دیالۆگێکە دەربارەی مێژووی وتاربێژی روم.

**وتاربێژ (٤٦ی پێش ز):**

بەڵگەنامەیەکی گرنگە لە شێوەی نامەیەکی کراوەدا کە باسی هونەرکارییەکانی جوانکاری، درکاندن، جۆری دەربڕین و گوزارشت، نەزمی پەیڤان، و وەزن و کێش دەکات.

**وتارە گشتییەکانی:**

**دەربارەی یاسای دابەشکردنی زەوی (٦٤- ٦٣ی پێش ز):**

ئەم بەرهەمە بریتییە لە چوار خوتبە یان وتار (سیانیان ماوەتەوە) کە هێرشن بۆ سەر دەسیسە و پیلانی دیموکراتەکان دژی دەسەڵاتی پومپی.

**دەربارەی کاتی لینا (٦٣ی پێش ز):**

چوار وتاری جوان و دڵگیرە کە پیلانی کاتی لینا"[٢٢]" ئاشکرا دەکات و سزایەك بۆ پیلانگێران پێشنیاز دەکات.

**فیلیپییەکان (٤٤- ٤٣ی پێش ز):**

فیلیپیك ناوێکە کە لە خوتبەکانی دیموستنەوە وەرگیراوە، ئەمە چواردە وتارە لە ئەنجوومەنی رومدا دژی مارکوس ئانتونیوس خوێنراوەتەوە.

**وتارە تایبەتییەکان:**

**بۆ ئارکیاس-ی شاعیر (٦٢ی پێش ز):**

ئەم بەرهەمە داکۆکینانەمەیەکە سەبارەت بە رومی بوونی ئارکیاس"[٢٣]"، ئەم بەرهەمە وەکو ستایشێکی ئەدەبیات بە شێوەیەکی سەیر مایەی سەرنجە.

**بۆ میلون (٥٢ی پێش ز):**

ئەمە داکۆکییەکە لە ئانیوس میلون"[٢٤]" لە هەنبەر قەتڵدا. ئەمە داکۆکییە لەو چەند شکستەی کە سیسرون لە دادگادا تووشی بووە.

دەقی خوتبەکە بەر لە بڵاوبوونەوەی دەستکاری و چاك کراوە.

**نووسراوە سیاسییەکانی:**

**دەربارەی کۆماری (٥٤- ٥١ی پێش ز):**

ئەم نامەیە (لە شەش کتێب) دایە دەربارەی دەستوور و حوکمڕانی وڵاتێکی بێ کەم و کوڕی، کە وەکو روم بە شێوەیەکی یوتوپیایی، لە ڕێگەی ئاوەز و نیشتیمانپەروەرییەوە ڕێبەرانی خۆی ئاراستە و ڕێنوێنی دەکات. شۆرەت و ناوبانگی ئەم بەرهەمە لەو وێنەیەدایە کە لەمەڕ دنیایەکی دیکە نیشانی دەدات (دەربارەی "خەونەکانی سیپیو").

**دەربارەی یاسا (٥٢ی پێش ز):**

ئەم نامەیە لە پێنج بەرگدایە (کە تەنیا سێ بەرگیان ماونەتەوە). بایەخی ئەم بەرهەمە لەو زانیارییانەدایە کە دەربارەی قانونی واقیعی و تیۆری قانونی رۆژ بە دەستیەوە داوە.

**نووسراوە ئەخلاقییەکان:**

**دەربارەی ئاکامی چاکی و خراپی (٤٥ی پێش ز):**

نامەیەکی رەسەن نییە، بەلاَم بە وردی بە شێوەیەکی دیالۆگ (لە پێنج کتێب) دا نووسراوە و تۆمار کراوە، ئەم بەرهەمە شرۆڤە و رەخنەیە لە قوتابخانەکانی ئەپیکوری، رەواقی و ئەرەستۆیی. سیسرون بە تەواوی لەگەلَ هیچ یەکێك لەم سێ قوتابخانەیەدا نییە، بەلاَم لەم سیانەدا زیاتر بەلای سێیەمدا دایدەشکێنێ.

**دەربارەی پیری (٤٤ی پێش ز):**

دیالۆگێکی جوان و دلَگیرە کە خۆشی و سوودەکانی رۆژانی پیری دەسەلمێنێ.

**دەربارەی دۆستایەتی (٤٤ی پێش ز):**

نامەیەکی کورت و دلَگیرە دەربارەی کرۆك و جەوهەری دۆستایەتی.

**دەربارەی فەرمان (٤٤ی پێش ز):**

نامەیەکە لە سێ کتێباندا کە سیسرون بۆ کورەکەی خۆیی نووسیوە، ئەم نامەیە زیاتر بیرو باوەری رەواقییەکانی لەخۆگرتووە و ململانێی نێوان فەرمان و وەزیفە و بەرژەوەندی شەخسی بەرجەستە دەکات و نیشاندەدات.

**نووسراوە پەیڤییەکان:**

**دەربارەی ماهیەتی خودایان (٤٥ی پێش ز):**

نامەیەکە دەربارەی بەرپەرچدانەوەی ئیلحاد و خوانەناسی دەربارەی ماهیەتی خودایان (٤٥ی پێش ز): قوتابخانەکانی ئەپیکوری، رەواقی و خواناسی دەخاتە بەر باس و لێکۆلَینەوە. ئەم بەرهەمە جگە لەوەی کە لە حیکمەتی رەسەن و قولَی خودایی بە دوورە، شاش و درشت و پچرپچرپیشە، و پێدەچێ بە پەلە نووسرابێ.

**نامەکانی سیسرون:**

نامەکانی سیسرون وەکو بەرهەمێن هونەری و سەرچاوەێن مێژوویی و بیۆگرافی یەکجار گرنگ و پرپایەخن.

**بۆ ئاتیکوس:**

زۆربەی نامەکانی سیسرون و گرنگترینیان لە شازدە کتێب)دا کۆکراوەنەتەوە. ئەم نامانە کە لە نێوان ساڵانی ٦٧- ٤٤ی پێش. ز.دا نووسراون، بە شێوەیەکی راستگۆ و دڵسۆزانە و نەرەسمی نووسراون.

**بۆ ئاشنایان (لە ساڵی ٤١ی پێش ز بڵاوبوونەتەوە):**

کۆمەڵە نامەیەکە (لە شازدە کتێب)دا کە خەلکێکی زۆر دەدوێنێ و دەربارەی بابەتێن جیاواز و جۆراوجۆرە. لەم کۆ نامەیەدا هەندێ وەڵامی ئەو کەسانەش کۆکراوەتەوە کە نامەکانیان بۆ نێردراوە.

**بۆ کوئینتوس (نامەکانی ساڵانی ٦٠- ٥٤ی پێش ز):**

کۆ نامەیەکە لە سێ کتێبدا، بۆ براکەی نووسەر.

**بۆ بروتوس و وەڵامەکانی وی (٤٤- ٤٣ی پێش ز):**

بریتییە لە دوو کتێب. ئەم نامانە هی دوا ساڵەکانی تەمەنی سیسرون-ە.

**شێوازی سیسرون:**

سیسرون هەوڵدەدات بە جۆرێکی سەرکەوتووانە رێگەیەکی میانڕەو لە نێوان شێوازە ئاسیایی و ئاتینییەکاندا بگرێتە بەر. خەسڵەتی دیاری شێوازی وی بریتییە لە رستە و دەستەواژەی کورت و وەزندار و هاوسەنگ، سەروا، رازانەوەی فراوان، بەهرەداری لە دەربڕینی مەبەستدا بە رستەی جیاوازو دەربڕینی شاعیرانە. بەڵام لە شێوەی ئاتینیدا هەوڵی ئەوە دەدرێ کە زمانی رۆژانە بەکار بهێنرێ و دووره پەرێزی لە هەر جۆرە توندڕەوی و دەستکردییەك بگرێ. سیسرون بەلای شێوازی ئاتینیدا دایدەشکێنێ و پێ لەسەر هەڵبژاردنی پەیڤان، وردی و دروستی بەکارهێنان، دووره پەرێزی لە وشەی بێگانە و نا باو و روونی و رەوانی زمان دادەگرێت. گەورەترین خەسڵەتی وی زاڵی و دەسەڵاتدارییەتی بەسەر زمانی لاتینیدا، ئەم دەسەڵاتدارییە یارمەتی دەدات کە لە لێکدانی سیلابێن کورت و درێژ وەزنی خۆش ئاهەنگ و نەوا دروست بکات، بەجۆرێ کە وەزنی خۆش ئاهەنگ و رازانەوەی زمان بە سنعەتە جوانکارییەکان بە تایبەتمەندیەکانی پەخشانی وی بێتە ژماردن.

گوتار و خوتبەکانی پڕن لە شۆخ تەبعی و حەنەکچێتی، تەوس و توانج و توانج پۆشی و زەین روونی. ئەویش مینا دیمۆستن زیاتر پابەندی هەست و سۆزە تا ئەقڵ و ئاوەز. نامە و نووسینەکانی سیسرون لە چاو بەرهەمە وتاربێژییەکانیدا کەمتر لایەنی وتاربێژییان لەخۆگرتووە

و پتر فۆرم و شێوەی دیالۆگییان هەیە. لێ ئەو هەمیشە پابەند و وەفاداری بایەخ و روونی و رەوانی و جوانی زمانە. شۆرەتداری سیسرون لە زمان و شێوازی وی دایە.

**کورتەیەکی رەخنەکان:**

سیسرون وێڕای زۆربێژییەکانی، لەڕووی رەوانی نووسینەوە لە پلە و پایەی کەماڵدایە و لە ئاستێکی بەرزدایە. زمانی وی بۆ ماوەی شازدە سەدە وەکو زمانی جیهانی شارستانییەت بەردەوام دەبێ، و ئەم زمانە دەخاتە خزمەتی شێوازێکەوە کە تا ماوەی نۆزدە سەدە هیچ شێوازێکی دیکە نەتوانێ جێی بگرێتەوە، و لە زۆر رووەوە گۆڕانێکی ئەوتۆ بەسەر ئەم زمانەدا نەیەت. بەبۆچوونی رەخنەگران، پەخشانی تازەی ئەورووپا لەسەر بناغەی شێوازی سیسرون دامەزراوە. سیسرون مرۆڤێکی خۆهەڵکێش و خۆپەسندە، بەڵام هەندێ جار جەوهەر و کرۆکی باسەکەی ئەم خۆهەڵکێشانە دەخوازێ، بۆ نموونە لە بەرەڤانی و داکۆکی لە پلانیکوس"[٢٦]". ئەو هەندێ جار لە ئەسڵی مەبەست دوور دەکەوێتەوە و پەنا وەبەر خەیاڵ، حەز و رق-ی نابەجێ دەبات، کە ئەمە خۆی لە خۆیدا سێبەر دەخاتە سەر بەرەڤانی و داکۆکییەکانی ئەو. سیسرون وەکو فەیلەسووفێك، نە توانا و بەهرەی داهێنانی هەیە و نە سیستەمێکی ئایدیۆلۆجی، بەڵام وەکو شرۆڤەکاری هزرە فەلسەفییەکان یەجگار بەتوانا و دەسەڵاتدارە.

بە هەرحاڵ لە واری نامەنووسیندا پایەیەکی گەورەی هەیەو بە سەرقافڵەی هەر هەموو هونەرمەندانی ئەو بوارە دەژمێردرێ.

## مێژوو

**سزار (گایوس یولیوس سزار ١٠٠- ٤٤ی پێش ز):**

سزار فەرماندە، سیاسەتوان، مێژوونووس، شاعیر و نامەنووسە.

**شرۆڤەکانی جەنگی گول:**

ئەمە بریتییە لە حەوت کتێب، کە جەنگی گول و بەریتانیا لە ساڵانی ٥٨- ٥٢ی پێش ز وێنە دەگرێت. سزار ئەم شرۆڤانەی دەربارەی داکۆکی لە سیاسەتی سوپایی خۆی لە گول و هەروەها پێگەی قانونی خۆی لە ساڵی ٥٢ی پێش ز نووسیوە. ئەم شرۆڤانە لە هەر جۆرە بەخۆفشینێك، ئەگەر بە ئاماژەش بێ دوورە، بەڵام پڕن لە بەڵگەی قەناعەت بەخش دەربارەی شێوەی رابەرایەتی وی.

شۆرەت و نێوبانگی ئـەم شـرۆڤانە دەگەڕێتـەوە بـۆ سـادەیی، راسـتگۆیی گوتـار، وردی، کورتبڕی و روونی و راشکاوی کە بوون بە نموونە بۆ نووسـەرانی دواتر.

**شرۆڤەکانی جەنگی ناوخۆ:**

ئەم شرۆڤانە لەسێ کتێبدا تۆمار کراون، کە گەنگەشە و کێشمانەکێشی نێـوان تـزار و پـومپی ٤٩- ٤٨ی پێش ز لەخۆ گرتووە. ئەم شرۆڤانە لە ساڵی ٤٤ی پێش ز نووسراوە و لە چاو شرۆڤەکانی جەنگی گولدا ناپوختەیە و رەنگە نووسەر پێیدا نەچووبێتەوە و پاکنووسی نەکردبێتەوە.

**سالوست (گایوس سالوستیوس کریسپوس، ٨٦- ٣٤ی پێش ز):**

سیاسەتوان، و مێژوونووس و مورید و پەیڕەوی توسیدیدس-ە. تایبەتمەندییەکانی شـێوازی سالوست بریتییە لە: سادەیی، ناکۆکی، کورتبڕی، بەکارهێنانی زاراوەێن کـۆن، و پـەیڕەوکردنی رۆشنبیریی یونانی. سالوست لە واری مێژوونووسیدا بێ ئەندازە ئەمین و بێ لایەنە، لێ هەنـدێ جار دەربارەی شرۆڤە و شـەرحی رووداوە مێژووییـەکان جـۆرە بـێ موبـالاتی و خەمـسارییەك دەنوێنێ و سالوست ئاشق و شەیدای لە بنج و بناوانکردنی هۆکاری رووداوەکانە.

**دەربارەی جەنگی یوگارتا"٢٧":**

ئەم مێژووە راپۆر و هەواڵنامەیەکی زیندووە دەربارەی جەنگ و شەڕی نێوان ئـەفریقاییانی باکووری بە سەرکردایەتی یوگارتا و رومییەکان بە سـەرکردایەتی متلـوس"٢٨"، مـاریوس"٢٩" و سولا"٣٠" (١١١- ١٠٦ی پێش ز) شۆڕەتی ئەم کتێبە لە جوانی وێنـەگرتن و بەرجەسـتەکردنی سەرانی سوپایی و وەسفی زیندووی داب و نەریت-ی نومیدیا"٣١" دایە.

**دەربارەی پیلانی کاتی لینا:**

تاقە نووسراوی سیاسییە کە دەربارەی رەتکردنەوە و بەرپەرچدانەوەی هاودەسـتی تـزار، لە دەسیسە و پیلانی کاتی لین نووسراوە. لەم بەرهەمەدا سیـسرون بـە زیرەکـی و ناسـکی مەحکوم دەبێ.

**مێژوو:**

راپۆر و هەواڵنامەیەکە کە دە ساڵ پاش مەرگی سولا (ز- ٧٨ی پێش ز) لـەخۆ دەگرێـت. تەنیا چەند پەرەگرافێك لەم بەرهەمە ماوەتەوە.

**ڤارۆ (مارکوس تزیتوس ڤارو ١١٦- ٢٧ی پێش ز):**

تەنزنووس، مێژوونووس، و دانەری شەش سەد یا حەوت سەد کتێبە، کە زۆربەیان لە بـەین چوون. ئەوەی ماوەتەوە شەش کتێبە دەربارەی زمانی لاتینی، و نووسراوێکە دەربارەی مەسەلە

گوندییەکان. ئەم بەرهەمانە تاقەتبەرن و دوورن لە هەر توانا و بەهرەیەکی وەسفکاری و دراماتیکی، بەڵام وەکو سەرچاوە زۆر بایەخدارن. بەرهەمێکی دیکەی نێوبراو کە فەوتاوە بریتییە لە ژیاننامەکان (دەربارەی ناودارانی یونانی و رومی)یە کە بە یەکەمین کتێبی وێنەداری جیهان دەژمێردرێ. نزیکەی شەش سەد بەند-یش لە تەنزی مینیپوس[٣٢] ماوە.

# ژێدەر و پەراوێز:

١- پومپی: (١٠٦- ٤٨ی پێش ز):

فەرماندە و سیاسەتوانێکی گەورەی رومی بووە.

٢- ساتورنی بەناوی ساتورن-ەوە (زوحەل و خوای کشتوکاڵ لە رومی کۆن) ناونراوە. جۆرە شیعرێکی لاتینییە کە لیویوس یەکێك بووە لە پێشەنگە دیارەکانی و پاش وی نافیوس ئاڵاکەی هەڵگرتووە.

٣- نومبریا: ناوچەیەکە لە ئیتاڵیای ناوەندی.

٤- میرکوری: خواوەندێکی رومییە، خواوەندی وتاربێژی و بازرگانی و زمانپاراوییە. یونانییەکان هرمسن-ی پێ دەڵێن.

٥- هولبرگ (١٦٨٤- ١٧٥٤): ئەدیب و دامەزرێنەری ئەدەبیاتی دانیمارکییە.

٦- ئاپولودوروس (لە دەوروبەری ساڵی ٢٨٥ی پێش ز ژیاوە):

شاعیر و ئەفسانەناسێکی یونانی بووە.

٧- میموس (٥٤- ٦٦ی پێش ز)

شاعیر و خەتیبێکی رومی بووە.

٨- هۆبس (١٥٨٨- ١٦٧٩ی پێش ز)

فەیلەسووفێکی ئینگلیزی بووە.

٩- ڤیرونا:

دەڤەرێکە لە باکووری رۆژهەڵاتی ئیتاڵیا.

١٠- بتی نیا:

وڵاتێکی کۆنە لە باکووری رۆژئاوای ئاسیای بچووك.

١١- سیرمیو: گوندێکە لە باکووری ئیتالیا.

١٢- سینا (٧٠- ٤٤ی پێش ز): شاعیرێکی رومییە.

١٣- کالڤوس (٨٢- ٤٧ی پێش ز): خەتیب و شاعیرێکی رومی بووە.

١٤- شیننامە Elegy: جۆرە شیعرێکە تایبەت بە لاوانەوە کە بەیتێکی شەش برگەیی و ئەویتری پێنج برگەیی بووە.

١٥- مارشاڵ: ناوە لاتینییەکەی (Marcus Valerius martalis)

١٦- کویستور: لە رومی کۆندا، ئەو مامورانە بوون کە لە سەردەمی پاشایەتیدا، قازی و یاریدەدەری کونسولان بوون لە کەشفکردنی خەتا و تاوانان و پاشان پۆستی خەزنەدارییان پێ سپێردراوە.

١٧- پرایتور: لە رومی کۆندا، پرایتور یەکێك بووە لەعینوانی کونسولان و پاشان بووە بە عینوانی کارگێران و بەرێوەبەرانی کاروباری دادوەری.

١٨- کونسول: لە رومی کۆن، هەر یەکێك لە دوو پۆستی گەورە کە پاش سەردەمی پاشایەتی دەسەڵاتی بەرزی بەرێوەبردنی ولاتیان گرتە دەست.

١٩- کلیکیە: ناوچەیەکە لە باشووری تورکیای ئەمرۆ.

٢٠- مارك ئانتونی (٨٣- ٣٠ی پێش ز) خەتیب و فەرماندەیەکی رومی بووە.

٢١- ئوگوستوس (٦٣ی پێش ز- ١٤ی ز): یەکەمین ئیمپراتۆری روم بووە (٢٧ی پێش ز- ١٤ی ز).

٢٢- کاتی لینا (١٠٦- ٦٢ی پێش ز):

سیاسەتوانێکی پیلانگێری رومی بووە.

٢٣- ئارکیاس (١٢٠- ٦١ی پێش ز):

شاعیرێکی یونانی بووە کە دەبێت بە هاوولاتی رومی.

٢٤- ئانیوس میلون (ز- ٤٨ی پێش ز): سیاسەتوانێکی رومی بووە.

٢٥- ئاتیکوس (١٠٩- ٢٣ی پێش ز): سەردارێکی رومی بووە.

٢٦- پلانیکوس: سیاسەتوان و خەتیبێکی رومی بووە.

٢٧- یوگارتا (- ١٠٤ پێش ز): شای نومیدیا بووە لە ساڵانی ١١٣- ١٠٤ی پێش ز.

٢٨- میتلوس (٩٩ پێش ز) سەرکردەیەکی رومی بووە.

٢٩- ماریوس (١٥٥- ٨٦ی پێش ز): فەرماندەیەکی رومی بووە.

٣٠- سولا (١٣٨- ٧٨ی پێش ز): سیاسەتوان و فەرماندەیەکی رومی بووە.

٣١- نومیدیا: سەرزەمینێك بووە لە ئەفریقای کۆن لە نێوان کارتاژ و موریتانیدا.

٣٢- مینیپوسی: بەو تەنزانە دەگوترێ کە بە شێوازی مینیپوس-ی فەیلەسوفی یونانی نیوەی یەکەمی سەدەی سێیەمی پێش ز نووسراون.

# سەردەمی ئوگوستوس

## (٢٧ی پێش ز- ١٣ی ز)

**پێشەکییەکی مێژوویی:**

ئوکتافیانوس تزار ئوگوستوس لە ساڵی ٢٧ی پێش ز دامەزراندنەوەی دووبارەی رژێمی کۆماری روم رادەگەیەنێ، بەڵام لەو زەمانەوە تاکاتی مردنی لە ساڵی ١٤ی ز، بە کردەوە دەسەڵاتی ئیمپراتۆرێکی پیادە دەکرد، ئەم قۆناغ و سەردەمە، قۆناغی ئاشتی و ئاسایشێکی سەپێنراو بوو، هەڵبەتە ئەم ئەمن و ئاسایشە دەرفەتێك بۆ بیرکردنەوە و هزرین فەراهەم دەکات و دەرەخسێنێ. جۆرە هوشیاربوونەوە و بێدارییەك دەربارەی شکۆداری رابردوو و ئێستای روم دێتە ئاراوە، و جۆرە هیوا و ئومێدێك بە ئایندەیەکی شکۆدارتر دڵ و دەروونان رووناك دەکاتەوە.

**نۆڕینێکی گشتی:**

ئاشتی، ئاسایش، دەستبەتاڵی، بایەخدان بە رۆشنبیری رابردوو و نەتەوەپەروەری کاریگەرییەکی زۆر دەکاتە سەر ئەدەبیاتی سەردەمی ئوگوستوس.

نووسەرایەتی وەکو پیشەیەکی تەواو بایەخ و ئیحتوبار پەیدا دەکات، و دەوڵەمەندان و دەسەڵاتداران-و خودی ئوگوستوس- دەبن بە هاندەر و پشتیوانی ئەدیبان. کەمبوونەوەی باس و موناقەشەی سیاسی دەبێتە مایەی نەمانی وتاربێژی و سنووردارBوونی بازنەی مێژوو. ئەم سەردەمە لە واری شیعر و شاعیری دا لە قۆناغە بەرجەستەکان بووە. دەستبەتاڵی تەواو دەرفەت بۆ شاعیران دەرەخسێنێ تا زیاتر بایەخ بە رازاندنەوە و خەملاندنی هونەرە شیعرییەکان بدەن.

## مەلحەمە

**ڤیرجیل (پوبلیوس ڤیرجیلیوس مارۆ ٧٠- ١٩ی پێش ز):**

ڤیرجیل گەورەترین شاعیری رومییە. لە گوندی ئەندیز-ی نزیکی مانتوا"١"، لە بنەماڵەیەکی گوندیی تاڕادەیەك دەوڵەمەند هاتۆتە دنیاوە.

لە ڤیرونا، میلان و روم خویندویەتی و دەستووری زمان، زانستە رەوانبێژییەکان، فەلسەفە و زمانی یونانی فێر بووە. هەڵبەتە لە سایەی کاریگەری فەلسەفەی ئەپیکوری دا بووە. لە ساڵی ٤١ی پێش ز مولکەکانی ڤیرجیل لە نزیکی مانتوا، لەلایەن ئوکتاڤیانوسەوە زەوت کراوە، بەڵام پاشان میسیناس"٢"-ی سیاسەتوانی دەسترۆ و زەنگین کە لە دڵبەندان و هاندەرانی ڤیرجێل بوو، بۆی تێدەکەوێ و مولکەکەی بۆ وەردەگرێتەوە.

ڤیرجێل کە دەچێتە تەمەنەوە موحافەزەکارتر دەبێ و دەست لە هەندێ پرەنسیپی ئەپیکوری هەڵدەگرێت، ڤیرجیل لە سەفەرێکیدا بۆ یونان بە مەبەستی کۆکردنەوەی کەرەستە و بابەتی تازە بۆ بەیتی مەلحەمی ئەنئید، کۆچی دوایی دەکات.

**شیعرە لاوازە هەوەڵینەکان:**

چەند شیعرێکی لاواز و کەمبایەخ دراونەتە پاڵ ڤیرجیل، کە لەوەیە ئەم کارە بە هەڵە کرابێ، لەوانە: کاتالپتون، پریاپیا، بەردەنووسەکان، دیرایە، سیریس، کولکس، ئایتنا، کوپا، و مورتوم. هەندێ شیعری دیکەی ئەم قۆناغە کە بایەخی زیاتریان هەیە بەمجۆرەیە:

**شیعرێن شوانکارەیی (بوکولیك):**

بریتییە لەو شیعرانەی کە لە دەوروبەری ساڵانی ٤٢- ٣٩ی پێش ز وتراون و بڵاوکراونەتەوە. ئەم شیعرە کورتانەی کە بوونەتە مایەی شۆرەت و نێوبانگی ڤیرجیل، رەنگە لەبەر رۆشنایی هاندانی میسیناسدا هاتبنە ئاراوە و نووسرابن. ڤیرجیل لەم شیعرانەیدا لاسایی تیوکریتوس و شاعیرانی دیکەی شیعری شوانکارەیی یونانی کردۆتەوە. گەلێك لە شاعیرانی وەکو پروپرتیوس، سپنسر، میلتن، شیللی و ئارنولد راستەوخۆ لە ژێر کاریگەری ئەم شیعرانەدا بوون، گرنگترین تاك شیعری ڤیرجیل لەم مەیدانەدا بریتییە لە:

**ژمارە ٢:**

شیعرێکی لیریکییە لەسەر وەزنی شەش پایەیی سێ سیلابییە . نێوەرۆکی ئەم غەزەلە ئەڤینی لاوێکی شوانە، و شیعری (پۆلوفموس-ی ئاشق)ی تیوکریتوس وەبیر دێنێتەوە.

**ژمارە ٤: "مەسیح"**

بەناوبانگترین شیعری شوانکارەیی ڤیرجیل-ە کە مژدەی لەدایکبوونی منالێکی سەیر دەدات کە ئاشتی و سەردەمێکی زێرینی تازە بۆ جیهان بەدی دێنێ، زۆر مەزەندە لە ناسنامەی ئەم منداڵە دراوە، لەوانە:

١- منالی ئوکتافیانوس و سکریبونیا"٣" (کە نزیکترین و باشترین مەزەندەیە).
٢- منداڵی ئانتونی و ئوکتافیا"٤"-ە
٣- منداڵی ئوکتافیا و مارسلسو"٥"-ە
٤- منداڵی کونسول پولیو"٦"-ە
٥- عیسا مەسیحە.
٦- منداڵی خەڵکی ئاساییە.

**ژمارە "٥":**

لاوانەوەیەکی شوانکارەییە. موپسوس بۆ مەرگی دافنیس دەلاوێتەوە، مینالکاس بە ئاوازی شاد وەڵام دەداتەوە کە دافنیس نەمدگە، بەڵکە چووەتە پێستی خوای چاکە و پشتیوانییەوە، ئەم شیعرە ئاماژەیەکە بۆ مەرگ و خوداسازی رەسمی ژولی تزار، ڤیرجیل لەم شیعرەدا لاسایی تیوکریتوس، بیون، و ماسکوس-ی کردووەتەوە.

**ژمارە ٩:**

نێوەڕۆکی ئەم شیعرە دەربارەی کۆیلەیەکە بە نێوی مینالکاس، کە خەمباری مسادەرەی زەوییەکەی خۆیەتی.

**ژمارە ١٠:**

ئەم شیعرە دەربارەی گالوس-ی شوانە کە لە سۆێی جەور و جەفای دولبەرەکەی لە جێدا دەکەوێ و بەدەم چاوەڕوانی مەرگەوە لێدەبرێ هۆزانێن شوانکارەیی بلێ.

لە ئەنجامدا ڤیرجیل ماڵاوایی لە شیعری شوانکارەیی دەکات، و دەگەڕێتەوە سەر شیعر و گۆرانی کشتوکاڵی کە پێشتر دەستی پێکردبوو.

**دەربارەی کشتوکاڵی:**

بەرهەمێکی پروپاگەندیی و بانگەشەییە لە چوار بەرگدا، لە دەوروبەری ساڵانی ٣٦- ٣٠ی پێش ز لەسەر داوای میسیناس دانراوە. ڤیرجیل لە هەندێ مەبەست و بابەتی ئەم کتێبەدا قەرزاریاری هسیود و لوکرتیوس-ە. مەبەست و ئامانجی کتێبەکە هاندانی خەڵکی ئازادە بۆ

گەڕانەوە بۆ سەر کێڵگە کەم دانیشتووانەکانی ئیتالیا، بەڵام وەکو بەرهەمێکی بانگەشەیی پێناچێت سەرکەوتوو بێت. ئەم بەرهەمە ستایشێکی فرەی ئوکتافیانوس-ی لەخۆگرتووە، و باسێکی زۆری کشتوکاڵ و ژیانی شادی دێهاتییانش دەکات، ئەم چوار بەرگە بەریز دەربارەی ئەم بابەتانەن: دەربارەی بەروبوم و پێشبینی جەوی، باخی مێو و رەزان، ئاژەڵداری، و هەنگ بەخێوکردن.

## ئانیئید:

## کاریگەری ئەدەبی و ژینگە:

ژیانی دێهاتییانەی ئارامی ڤیرجیل لە قوناغی منداڵیدا، هاونشینی وی لەگەڵ کۆڕ و مەجلیسی میسیناسدا، و ژینگەی دەرباری ئوکتاڤیانوس کاریگەرییەکی ئاشکرایان کردۆتە سەر ئانیئید.

لەڕووی کاریگەرییە گرینگە ئەدەبییەکانیشەوە دەبێ ئاماژە بۆ هۆمەر، پیراندز"٧"، بەیتە مەلحەمییە وەرزییەکان، شانۆنامەنووسانی یونانی (بەتایبەتی ئوریپیدس) ئاپولونیوس رودسی"٨"، رۆشنبیریی یونانی، ئانیوس، کاتولوس، و لوکرتیوس، دیارە کاریگەری هۆمەر لە هەر هەموو ئەوانی دی پترە، ڤیرجیل رووداوان و شێوەی جۆراوجۆری لە ئودیسەوە بۆ هەر شەش بەرگی هەوەڵی ئانیئید وەرگرتووە، و گەلێك لە بابەتەکانی شەش بەرگی دووەمی ئەم مەلحەمە لاتینییەش لە ئیلیادەوە وەرگیراوە. ڤیرجیل هەموو ئەو کێش و وەزنە رەزمی و پرەنسیپە مەلحەمییانەی بەکار هێناوە کە هۆمەر دایناون.

## چیروك:

پاش ئەوەی کە یونانییەکان تەرواده دەسوتێنن، ئاینیاس-ی زاوای پریام شا، لەگەڵ هێزەکانیدا بە بیست و یەك کەشتی هەڵدێن و بۆ حەوت ساڵان لە دەوروبەری میدیترانە ئاکنجی دەبن. ئاینیاس و هاورێکانی زەحمەت و رەنجێکی زۆر دەکێشن، بەڵام لە ئەنجامدا دەچنە کارتاژ، لەلایەن دیدۆ-ی شابانۆی ئەوێندەرەوە پێشوازی گەرم دەکرێن و ئاشقی ئاینیاس دەبێ و ئاینیاس هاندەدا کە وەکو جێگری حوکمڕان لە کارتاژدا ئاکنجی ببێ، بەڵام ئاینیاس دەزانێ کە چارەنووسی لە جێگەیەکی دیکەدا پەنهانە و بەدزییەوە رێگەی سیسیل دەگرێتەبەر. دیدو-ش خۆکوژی دەکات.

ئاینیاس پاش سەردانێکی جیهانی ژێرین (کە لەوێندەر دامەزراندنی روم بە دەستی منالانی ئاینیاس و شکۆداری ئایندەی روم پێشبینی دەکرێ) بەرەو لاتیوم لە ئیتالیا دەچێ و لەوێندەر لەلایەن لاتینوس پاشاوە بە گەرمی پێشوازی لێدەکرێ. لاتینوس بەڵێن بە ئاینیاس

دەدات کە لاڤینیا-ی کیژی بداتێ، بەڵام کیژێ لەلایەن دایکییەوە بە تورتوس-ی شازادەی روتولی دەدرێ. لاتینوس داوا لە هەردوو هەڤرکەکە دەکات کە دوئێل لەگەڵ یەکتردا بکەن. پاش شەڕێکی بێهودە و بێوەر، تورتوس بۆیەکلاکردنەوی مەسەلەکە، پێشنیازی جەنگی تەن بە تەن دەکات. ئاینیاس قابیل دەبێ و تورتوس دەکوژرێ. ئاینیاس لەگەڵ لاڤینیادا زەماوەند دەکات و دەبێ بە میراتگری تەخت و تاج.

## ئامانج و تۆن:

یەکێك لەو هۆیە سەرەکییانەی کە وای لە ڤیرجیل کردووە بەیتی ئانیئید بهۆنێتەوە ئەوە بووە کە پێشینەیەکی پرشکۆی مێژوویی لەگەڵ کەسایەتییەکی نیمچە خودایی وەکو قارەمانی نەتەوەیی بۆ روم دروست بکات و دابهێنێ، جا ئەم قارەمانە هەم دلێرە هەم ئاقڵ، بەڵام ئەم دلێری و ئاقڵییە، وەکو چۆن دلێری ئاخیلوس و هکتوریا، ئاقڵی ئودیسیوس مایەی سەرنج و باعیسی شۆرەتیانە، بەو جۆرە تاکیدی لەسەر ناکرێ.

لە جیاتی ئەوە ئاینیاس بە پارێزکاری کە گرنگترین خەسڵەتی وییە و لەقەبێکی پڕ بە پێستی وییە وەسف دەکرێ. ڤیرجیل هەوڵ دەدات فەزیلەتی تەقلیدی روم وەکو دلێری، سەبر و حەوسەڵە، میانڕەوی، سوور بوون لەسەرکار، زانایی و وەزیفە و ئەرکناسی بەرجەستە و گەورە بنوێنێ.

ئەوەی لە سەرێ ڕا باسکرا بە ئامانجە جدییەکانی ڤیرجیل دەژمێردرێ، و ئانئید بەیتێکی تەواو جدییە. دەرفەتی گاڵتە و سوعبەتی تێدانییە.

حاڵەتێکی ماخولیایی لە باری ئاسکی دەروونگەرایی باڵی بەسەردا کێشاوە. ئەم بەیتە بە تەواوەتی دوور لە گیانی بوێری و سەرکێشی، و ئارەزووی کەشتی رانی بۆ شەو دیوی ئاسۆ و مەلەکردن لە نێو هەموو ئەستێرەکانی رۆژئاوا، کە لە ئیلیاد و ئودیسەدا دەیبینین. بە هەر حاڵ، ئەم کەموکوڕیانە کەم و زۆر بەو راستگۆییە ئەخلاقییە قەرەبوو دەکرێتەوە کە لە بەرهەمەکانی هۆمەردا تاڕادەیەك کزە. بەیت و مەلحەمەکانی هۆمەر جیهانی تازە و پڕ گەرم و گوڕی وێنە دەگرێ، بەڵام ئانئید سەربوورێکی جیهانی کۆنە.

## شێواز و جۆری مامەڵە کردن:

ڤیرجیل هەر هەموو ئەو رێسا و یاسا مەلحەمییانە قەبووڵ دەکات کە هۆمەر داینابوون. هەڵبەتە ئانیئید مەلحەمەیەکی ئەدەبییە کە زیاتر بە مەبەستی خوێندنەوە دانراوە تا بە ئاوازی بەرز بخوێنرێتەوە، و لە ئەنجامدا لە چاو مەلحەمەکانی هومەردا کەمتر پەرەگرافی دووبارەی

تێیدا دەبینرێ، دەروونگە رایانە ترو راستگۆیانەتر و وردتر لە مەلحەمەکانی وی نووسراوە. پێدەچێ ڤیرجیل سالانێکی زۆری بەدانان و پێداچوونەوەی ئانینید بردبێتە سەر (چونکە نەیتوانی بوو دوا پێداچوونەوەی تەواو بکات، و لەسەرە مەرگدا ویستبووی ئانینید بسوتێنێ، بەلاّم بە فەرمانی ئوگوستوس لەم کارە پەشیمان بووبووەوە).

## کاریگەری ئانینید:

شیعری ڤیرجیل-ی شاعیر زۆرترین کاریگەری لەجیهاندا هەبووە. رەنگە لەرووی ئەندێشە، شێوەو شێوازەوە لە هەر شاعیرێکی دیکە زیاتر کاریگەری بەسەر ئەدەبیاتی ئەوروپاوە هەبووبێ. تەقریبەن هەموو ئەدیبانی لاتینی پاش وی وەکو دانتی، پترارك، بوکاچیو، ئاریوستو، لیوپاردی، کاردوچی، ئارسیلا، تاسو، کاموینش، رونسار، ڤولتیر، چاسر، سپنسەر، میلتون، درایدن، وردزورس، شلی، کیتس، تینی سن وئارنولد، بەتەواوەتی قەرزارباری ئەون.

## کورتەیەکی رەخنەکان:

ئانینید لە زەمانی دانانییەوە تاکو ئێستا بە یەکێك لە شاکارە ئەدەبییەکانی جیهان ناسراوە.

بە هەر حاڵ، رەخنەگرانی جۆراوجۆریش هەم هێرشیان کردۆتە سەر و هەم بەرەڤانیان لێکردووە. هەندێ کەس ئاینیاس- یان بە کەسێکی لەخۆڕازی و هەندێ جار بێ مویالات سەبارەت بە پرنسیپە ئەخلاقییەکان (بو نموونە لەو شوێنەدا کە دید و بەجێ دەهێڵێ) و پابەندی بەهاکانی چینی حوکمڕان، لە قەڵەم داوە. بەلاّم هەندێ رەخنەگری دیکە ئاینیاس بە نوێنەری فەزیلەتی رومی لە دیدی ڤیرجیلەوە دەزانن، کە مکووڕە لەسەر ئەوەی کە درێژە بە رێگای چارەنووسی خۆی بدات، و هەمیشە لە سایەی رێنوێنی و هیدایەتی خودایاندا رەفتار دەکات. کەسایەتییەکانی دیکە، بە تایبەتی دیدو، باش وێنەگیراون.

زۆربەی شرۆڤەکاران لەو باوەڕەدان کە زمانی ڤیرجیل یەکنەوا و دوورە لە هەر حەنەك و شۆخییەکەوە، بەلاّم یەجگار جدییە، ئانینید بە غەمگین ترین کتێبی جیهان دانراوە. هەر چەندە لە گیانی سەرکێشی دوور و وشکە، بەلاّم تەژی مرۆڤپەروەرییە. ئانینید لەڕووی ناوەڕۆکەوە هەموو ژیانی بەشەری لەخۆ گرتووە و هەر ئەمەش وایکردووە بە گەورەترین کتێبێك کە بە دەستی مرۆڤ هاتۆتە نووسین بژمێردرێ. دیارترین تایبەتمەندی ئەم بەیتە بریتییە لە بەرزی فۆرم و شێواز، دەربڕین و گوزارشت، وەزن و ئاهەنگ، و هاوسەنگی. لەڕووی کێش و وەزنەوە دەبێ ئەم بەرهەمە گەورەیە بە خودانی شکۆدارترین وەزانێ دابنرێ کە تا ئێستا بەزاری مرۆڤدا هاتووە.

## هۆزانێن لیریکی

**هوراس (کونیتوس هوراتیوس فلاکوس ٦٥- ٨ی پێش ز):**

تەنزنووس، شاعیر، زانای ئەخلاق و رەخنەگری ئەدەبییە، هوراس لە ڤینوسیا لە خێزانێکی کۆیلەی ئازاد بوو هاتۆتە دنیاوە، لە روم و ئاتینـدا خوێندویەتی و خوێنـدنی بەرزی تـەواو کردووە، پاش ئەوەی چووە ریزی سوپای پروتوس-ەوە، بوو بە ئەندامی بەرگریکاران لە مـاف و ئازادی خەڵك، کاتێ کە پروتوس لە فیلیپی دا شکستی هێنا (٤٢ی پێش ز)، هـوراس بـۆ روم گەڕایەوە، لە کاتێکا کە باڵەکانی شکا بوو -بابی مرد و سەروەت و سامانەکەی مـسادەرەکرا بوو، هەنگێ بوو بە سکرتێری خەزنەداری و چونکە دەرامەتی کەم بـوو کەوتـە شـیعر گـوتن. شیعرەکانی زۆر زوو بڵاو بوونەوە و دەنگیان دایەوە. ڤیرجیل ئەوی بە میسیناس ناسـاند (٣٩ی پێش ز)و بوو بە یەکێك لە ئەندامە دیارەکانی کۆڕ و مەجلیسی وی. میسیناس لە ساڵی ٣٣ی پێش ز کێڵگە و مەزرایەکی بە هوراس بەخشی کە خۆیبوون و دەلیڤەیەکی باشـی بـۆ نووسـین بۆی فەراهەم کرد. ئەو تا نزیکی ساڵی ٢٥ی پێش ز زۆر لایەنگری ئوکتافیـانوس نـەبوو، لـەو ساڵەدا باوەڕی بە بەرنامەکانی وی بۆ تازەکردنەوە و بوژانەوەی ژیانی نەتەوەیی هێنا. لە ساڵی ١٧ی پێش ز لەلایەن ئوکتافیانوسەوە راسپێردرا کە چامەیەك بۆ پێشبڕکێی قارەمـانیی سـەدە بنووسێت. لەوە بەدواوە لە دەربار نزیك بووەوە، بەڵام ئەو داوایەی ئیمپراتۆری رەفزکـردەوە کـە دەبوایست هوراس ببێ بە سکرتێری تایبەتی ئـەو. زیـاتر دڵبەنـدی خۆیبـوونی خـۆی بـوو لـە گۆشەیەکی مەزراکەیدا. واتە ئەوەندەی دڵی بە مەزراکەی خۆی خـۆش بـوو ئەوەنـدە دڵـی بـە سکرتێری ئیمپراتۆر خۆش نەبوو.

**بەرهەمەکانی:**

**بەرهەمێن نێوەڕۆك"٩" جیاواز:**

بریتییە لە چەندین پارچەی دیالۆگی، هەندێکی شاد، هەنـدێکی جـدی دەربـارەی بابـەتێن جۆراوجۆر کە لە ژێر کاریگەری لوسیلیوس وتـراون، کتـێبی یەکـەم (لـە سـاڵی ٣٥ی پـێش ز بڵاوبووەتەوە) لـە دە مەنـەلۆگ پێکهـاتووە. ژمارەکـانی ١-٣ دەربـارەی میـانڕەوی و پـشوو درێژییە، ژمارەکانی ٤، ٦، ١٠ هەندێ بەرەڤانی لـە خـۆی و لـە شـیعرەکانی لـەخۆ دەگـرێ، ژمارە پێـنج باسـی سـەفەرێکە بـۆ بروندیـسیوم لەگـەڵ میـسیناسدا، ژمـارە ٧، ٨ کۆمەڵـە حیکایەتێکی لەخۆ گرتووە، و ژمارە ٩ شەرحی رووبەڕووبوونەوەی کەسێکی چەنەبازە. کتـێبی دووەم (لە دەوروبەری ساڵی ٣٠ی پێش ز بڵاوبووەتەوە) بریتییە لە هەشت شیعر — هەنـدێکیان

مەنەلۆگ و هەندێکیان دیالۆگی دوو قۆڵییە. لێرەشدا هوراس بەرگری لە خۆی وەکو نووسەری بەرهەمێکی نێوەرۆك جۆراوجۆر دەکات (بڕوانە ژمارە ١١)، بەرگری لە ژیانی سادە و ساکار دەکات (ژمارەکانی ٢، ٦)و گاڵتە بە بێ سەلیقەیی خەڵکی دەوڵەمەند دەکات (ژمارە ٨).

**ئیپودەکان (زیاتر لەسەر وەزنی ئیامبیك — ٥):**

لە دەوروبەری ساڵانی ٤٠- ٣٠ی پێش ز دانراوە. بریتییە لە هەڤدە شیعر کە لەڕووی تۆن و بابەتەوە وەکو ساتیران جۆراوجۆر و هەمە ڕەنگە.

هوراس ئیلهامی ئەم شیعرانەی لە ئارکیلوکوسەوە وەرگرتووە. ئیپودەکان چوار شیعری تەنزئامێزی تیایە (٤، ٦، ١٠، ١٢)، دوو شیعریش وێنەیەکی ترسناکی ژنێکی جادووگەر دەگرێت (٥، ١٧) شیعرێکیش سەرکەوتنی ئاکتیوم "١٠" بە گەورە دەژمێرێ (٩)، دوو شیعریش سامناکیی جەنگی ناوخۆ بەرجەستە دەکات (٧و ١٦) شیعرێکیش وەسفێکی توانجپۆشیانەی خۆشییەکانی گوندە (٢).

**چامەکان:**

بریتییە لە سەد و سێ چامە، کە زیاتر فیکرین تا لیریکی بن، لە چوار بەرگ یان چوار کتێبدا تۆمار کراون. هوراس لەم شیعرانەدا قەرزارباری سافۆ، ئالسیوس، سیمونیدس، کالیماکوس، پیندار، ئارکیلوکوس، و ئاناکریون-ە، سێ کتێبی یەکەم لە نێوان ساڵانی ٣٠- ٢٣ی پێش. ز.دا نووسراون. غەزەلیاتی کتێبی چوارەم لە دە ساڵی دواتردا دەگوترێن و لە ساڵی ١٣ی پێش. ز.دا بڵاودەبێتەوە. غەزەلیاتەکان دەربارەی بابەتی جۆراوجۆرن وەکو بانگەواز، دوعاخوازی. تەبیعەت، لەزەتی ئەشق و شەراب، ئیحتویاری نەتەوەیی و سرووودێن پاڕانەوە. کتێبی یەکەم زیاتر هۆزانێن لیریکییە دەربارەی ئەڤین و شەراب، کتێبی دووەم هەندێ نامەکاری ئەخلاقی لەخۆگرتووە، کتێبی سێیەم زیاتر دەربارەی مەسەلە ئەخلاقی و نیشتیمانپەروەرییەکانە، و کتێبی چوارەم زیاتر تەرخانە بۆ ستایشی ئوگوستوس و ئەندامانی خێزانەکەی وی.

**نامەکان:**

بریتییە لە دوو کتێب کە لە ساڵانی ٢٠- ١٣ی پێش ز دانراون و لە ساڵی ١٣ی پێش ز بڵاوکراونەتەوە (کتێبی یەکەم بیست نامەیە، و کتێبی دووەم دوو نامەیە). هەموو نامەکان، جگە لە چواریان (٣، ٥، ٨، ٩) کە شەخسین، ئەوانی دی گشتین و عەوامی خەڵکی دەدوێنن. نامەکانی کتێبی یەکەم پتر لەمەڕ داب و نەریتان، ئەخلاقییات و بەختەوەرییە. بابەتی کتێبی

دووەم، نامەی یەکەم داکۆکییە لە ئەدەبیاتی سەردەمی ئوگوستوس. نامەی دووەمی ئەم کتێبە تاڕادەیەك ژیاننامەی خودی شاعیرە- کۆمەڵە بیانوویەکە بۆ ئەوەی کە چیتر شیعر نەڵێ. زۆربەی نامەکانی پڕن لە پەند، قسەی نەستەق، و پێکەنینۆك.

**سروودی سەرکەوتن (گۆرانی سەدە):**

ئەم سرووده بەبۆنەی ئەو جەژنە گەورە نەتەوەییەوە کە ئوگوستوس رایگەیاندبوو، لە ساڵی١٧ی پێش. ز.دا گوتراوە و بەو مەبەستە دانراوە کە کۆرسی کوڕ و کچ بەکۆمەڵ و وەکو کۆراڵ بیڵێن. هۆراس لەم سروودانەدا ستایشێکی زۆری ئوگوستوس و روم دەکات.

**هونەری شاعیری:**

ئەم بەرهەمە (لە دەوروبەری ساڵی١٠ی پێش ز نووسراوە) لەوە دەچێت نامەیەك بێ بۆ دوو پیاوی گەنج بە ناوانی پیسو، کە لەسەر داوای ئەوان هەندێ رێسای شیعری باس دەکات. بەشی یەکەم (١-٤١ ) زەرورەتی هاوئاهەنگی دووپات دەکاتەوە. بەشی دووەم (٤٢-٢٩٤ ) باسی فۆرم، دەربڕین، تۆن و کاراکتەرسازی دەکات، و پتر باسی شیعری درامی دەکات. بەشی سێیەم باسی خودی شاعیر دەکات و توانای خودی و خوێنەواری بۆ شاعیر بە پێویست دەزانێ، و هەندێ یاسا و رێساش بۆ فێربوونی شاعیر پیشان دەدات.

ئەم کتێبە ئەقڵی ساغڵەم بە بناغە و کۆڵەکەی نووسینی باش دەزانێ. پێشنیازی موتالا و خوێندنەوەی نموونە یونانییەکان دەکات.هێرش دەکاتە سەر زبری، درێژدادڕی و کاوێژکردنەوە، و نادروستی لە چێکردنی وشەدا. گەلێك لە زاراوە زیندووەکانی ئەم کتێبە لەواری رەخنەی ئەدەبیدا، کەوتۆتە سەر زاری رەخنەگران و بە فراوانی بەکاردێن وەکو: شابەیت، نەختی و پوختی، و دەستپێك لە ناوەندی بابەتەوە.

هونەری شاعیری هۆراس و هونەری شیعری ئەرەستۆ بە گرنگترین نووسراو و بەرهەمی واری رەخنەی ئەدەبی کۆن دەژمێردرێن.

**بیروبۆچوونەکانی هۆراس:**

هوراس وەك فەیلەسووف و لەواری فەلسەفەدا هیچی تازەی پێ نییە و زەحمەتە بتوانرێ بە خودانی یەك سیستەمی فیکری بزانرێ. لە مەیدانی مەزهەب و ئایین-یشدا هیچی تازەی پێ نەبووە. بەڵام تاڕادەیەك ئەوەی پێوە دیارە کە باوەڕی بە خودایانی رومی یان نەمری نەبووە. لە مەیدانی حیکمەتی عەمەلیدا، بیروبۆچوون و باوەڕی وی تێکەڵەیەکە لە قوتابخانە و رێبازی ئەپیکوری و رەواقی، کە هۆراس بە پەیڕەویکردنی میانڕەوی ئەفلاتوونی

لەتوندڕەوی هەردووکیانی (ئەپیکوری و ڕەواقی) کەم کردۆتەوە. ئەگەرچی هۆراس پێی وایە مەبەستی مرۆڤ لە ژیاندا گەڕانە بە دووی لەزەت و خۆشیدا و لەو باوەڕەدایە (کە نابێ ((دەم و گاڤ لە دەست بدرێ))"١١" و تەمەن بڕوات ناگەڕێتەوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا زۆر موحافەزەکارە، هەمیشە ئەوە دووبارە دەکاتەوە کە زیدەڕۆیی –بۆ نموونە لە شەراب، ئەڤینداری، سەروەت و سامان- بەدبەختی و نەگبەتی لێدەکەوێتەوە، هۆراس لایەنگری ژیانی سادەی دێهاتی، ئارامی فەلسەفی، و هێمنی و سەبرە لە ڕۆژی تەنگانەدا. لە مەیدانی سیاسەتیشدا هەر موحافەزەکارە و گاڤێ کە هەست بە نزیکبوونەوەی مەترسی جەنگی ناوخۆ دەکات دەوڵەت ئاگادار دەکاتەوە.

## شێواز و جۆری مامەڵە کردنی هۆراس:

هەر چەندە هۆراس زیاتر بە هۆزانێن لیریکی و ڕەخنەی ئەدەبی بەناوبانگە بەڵام تەنزی مولایم بەدیارترین خەسڵەت و تایبەتمەندی بەرهەمەکانی وی دەژمێردرێ.

جگە لە کتێبی نیوەڕۆکە جۆراوجۆرەکان، لە زۆربەی ئیپودەکان، و گەلێك لە چامەکان، و هەروەها لە (هونەری شاعیری)ی هۆراسدا نیشانەێن تەنز دەبینرێن. تەنانەت لە غەزەلیاتی ئەڤینداریشدا دەست لە شۆخی و حەنەك هەڵناگرێ. شۆخ تەبعی، نوکتەبێژی، بەزەیی، هێمنی و خۆش مەشرەبی لە ناخی شیعری ئەودا پەنهانە، هوراس نەك هەر نەختی و پوختی شیعر دووپات دەکاتەوە بەڵکو بە خۆیشی زۆر پابەندی ئەو پرەنسیپەیە لە دانانی بەرهەمەکانی خۆیدا لەڕادەبەدەر ورد و دوو دڵە، و شیعرەکانی لەڕووی هونەرییەوە بە ڕاستی بێ خەوشن، بە مامۆستای زۆر ژانری شیعری و وەزن و کێشی جۆراوجۆر دەژمێردرێ.

## کاریگەری هۆراس:

هۆراس کارێکی ئەوتۆی نەکردۆتە سەر سەدەکانی ناڤین، بەڵام لە دوای ڕینیسانس و لە سەدەی هەژدەمدا ئیحتوبارێکی زۆری پەیدا کردووە و کارێکی زۆری کردە سەر ئەدەبیاتی جیهان. لە ئیتاڵیادا کاری کردۆتە سەر، دانتی، پترارك، ئاریوستو، بیمبو، و تاسو، لە فەڕەنسادا کاری کردۆتە سەر: رونسار، دوبلیە، مونتینی، مالرب، بوالو، لافونتین، کورنی، راسین، مولیر، ڤولتیر، شینیە، دوموسیە، لە ئەڵمانیادا کاری کردۆتە سەر: لسینگ، هردر، گوتە، نیتشە، و لە ئینگلیستاندا کاری کردۆتە سەر: سپنسەر، شەکسپیر، جۆنسن، ئەدیسۆن، ستیل، پریر، پۆپ، ریچاردسون، سترن، ئیسمولت، فیلدینگ، گریی، چسترفیلد، ڤالپول، وردز ورس، کولریج، بایرون، شیلی، و براوینگ.

**کورتەیەکی رەخنەکان:**

رەخنەی ئەوە لە هۆراس گیراوە کە خاوەنی هەستی قوڵ و تەبعی ناسك نەبووە، لەواری کۆمەڵایەتی و ناوەڕۆکی ئاشقانەدا دوورە پەرێز بووە و کەسێکی گۆشەگیر بووە، رەخنەگرێك بە پیاوێکی (بە کەلەش بچووك) و گەورەی دەزانێ کە خووی پارێزکارانەی وی دەگەڵ گەورەترین دەستکەوتێن شیعریدا ناگونجێت. هەندێکیش بە کەسێکی خۆهەڵکێش و لەخۆرازییان لە قەڵەم داوە. لەم لاشەوە هەوادارانی دەڵێن هۆراس هەرچییەك بێ روون و رەوان و جوان دەنووسێت، و تەکنیکێکی باڵای لە بەکارهێنانی وشە و پەیڤ و کێش و وەزن و رەوانی زماندا هەیە. ئەمە جگە لەوەی کە لە مەیدانی رەخنەی ئەدەبیدا خودانی ئەقڵێکی ساغڵەم و بەهرەیەکی گەورەیە و بەرهەمەکانی لەرووی کورتبڕی و جوانییەوە مایەی ستایشن، نووسینەکانی خوێنەر رادەکێشن. هۆراس وەکو کەسێکی تەنزنووس خودانی هەستێکی کۆمەڵایەتی بەرزە، و کەمتر مایەی رەنجان و تۆرانی کەسانی دییە، هەڵە و پەڵە و خەتای دۆستەکانی دەداتەوە بە روویاندا و لە هەمان کاتدا دەیانهێنێتە پێکەنین. لەڕاستیدا هۆراس لە هەموو کەسێك و تەنانەت لە خۆیشی پێکەنین دروست دەکات. بوونی هۆراس پڕە لە دیتن و ئەقڵی باتین، ئەقڵی ساغڵەم، مەحەبەت و خۆشەویستی، بەزەیی و راستگۆیی، ئەدەب و ئینسانییەت.

## لاوانەوە و شیننامە "١٢"

رومییەکان شیعری ئاشقانەیان لە قاڵبی وەزنی شیعری لاوانەوە و شیوەندا و لە جیاتی شیننامە دەنووسی. ناودارانی مەیدانی شیعری شیوەن بریتی بوون لە: تیبولوس، پروپرتیوس و ئوڤید.

**تیبولوس (ئالبیوس تیبولوس ٥٤- ١٨ی پێش ز):**

ئەم شاعیرە گەورەیە ئەندامی کۆڕ و ئەنجوومەنی میسالا "١٣" بوو. چوار کتێبی شیعری ئاشقانە و خۆشەویستی دەدرێتە پاڵ. کتێبی یەکەم بریتییە لە دە غەزەل، غەزەلێکیان دەربارەی ساڵڕۆژی لەدایکبوونی میسالایە (٧)ن پێنج غەزەلیش ئەڤینی شاعیر دەرهەق بە پلانیا دەردەبڕن (١-٦). کتێبی دووەم شەش شیعری لاوانەوەی لەخۆگرتووە، لە سێ شیعریاندا باسی ئەوینی ئاگرینی تیبولوس دەرهەق بە نیمسیس دەکرێ کە ژنێکی سەر بە چینەکانی خوارەوەی کۆمەڵگەیە. شەش شیعری کتێبی سێیەم پێدەچێ بۆ سولپیسیا "١٤"-ی برازای میسالا گوترابێ، تیبولوس ورد، هێمن، نەجیب، سەنگین، میانڕەو، قسە لە روو و رەوانە، و ناوبانگ و شۆڕەتی بە رەوانی و پوختەیی بەرهەمەکانیەوەیە. بەڵام دید و روانینێکی کورت و

سنورداری هەیە و... هەر چەندە لە ریزی شاعیرە گەورەکان دانانرێ، بەڵام شاعیرێکی هێدی و هێمن و رەزا سووکە.

**پروپرتیوس (سکستوس پروپرتیوس ٥٠- ١٦ی پێش ز):**

ئەم شاعیرە ئەندامی کۆڕ و مەجلیسی میسیناس بووە. ٤-٥ کتێبی لاوانەوەی داناوە. تەقریبەن هەر هەموو دوو کتێبی یەکەم، نیوەی کتێبی سێیەم، و سێ شیعری کتێبی چوارەم (واتە نزیکەی شەست و حەوت شیعرێك) دەربارەی ئەڤینی خۆی دەرهەق بە هوستیا-یە. ئەو دوای شیعرەکانی دەربارەی بابەتی جۆراوجۆرە وەکو رێورەسمی ئایینی، ناوی شوێنان، جەنگی ئاکتیوم، و خەمی مەرگی خانمێکی رومی. بە شێوەیەکی گشتی پروپرتیوس بە شاعیرێکی باشتر لە تیبولوس دەزانن- چونکە هەم بەرهەمی زۆرترە و هەم بابەتی جۆراوجۆرتری هەیە. ئاڵۆزی، نامەفهومی، نەبوونی یەکێتی و یەکنەوایی کێش و رەزن یەکەم و کورتی بەرهەمەکانی وی دەژمێردرێن، لایەنی ئیجابی بەرهەمەکانیشی بریتییە لە: قوڵی کاریگەری، سەنگینی، زیتەڵەیی، سۆزی راستەقینە و ناسکی و جوانی.

**ئوڤید (پۆبلیوس ئوڤیدیوس ناسو ٤٣ی پێش ز- ١٧ی ز):**

شاعیرێکی مەلحەمەنووس و لیریکی و شانۆنامەنووس بووە. لە خێزانێکی جەنگاوەری دەوڵەمەندی خەڵکی سولمون لە ئیتالیای ناوەندی هاتۆتە دنیاوە. لە رومدا کەوتووەتە خوێندنی زانستی رەوانبێژی و ماف، بەڵام هەر زوو وازی لە لقی ماف هێناوە و رووی کردۆتە شیعر و شاعیری، سێ جاران ژنی هێناوە و دوو ژنی یەکەمی تەڵاق داوە. ئوڤید لە ساڵی ٨ی ز بە فەرمان و دەستووری ئوکتافیانوس بۆ تۆمی، لە کەناری دەریای رەش دوور خراوەتەوە و نۆ ساڵ لەوەدوا هەر لەوێندەر کۆچی دوایی کردووە.

**بەرهەمەکانی:**

**هۆزانێن ئەڤینداری:**

**خۆشەویستی:**

بریتییە لە کۆی پەنجا شیعر و لە سێ کتێبدا کۆکراونەتەوە و (لە ئەسڵدا پێنج کتێبە) لە قاڵبی شین و لاوانەوەدایە. ئەم کۆمەڵە شیعرە پتر ئەو شیعرە ئاشقانانەی لەخۆ گرتووە کە نەك هەستی خودی شاعیر، بەڵکو کاریگەری هەر ئاشقێك عەکس دەکاتەوە و دەگێرێتەوە. کورینا، بابەتی دوازدە شیعری ئەم بەرهەمەیە، و لەوەیە ئەم شیعرانە هی چەند کەسێك بن، ئەو ئەشقەی وێنە دەگیرێت ئەشقێکی سیکسی و نارەوایە، و دەنگ و تۆنی شاعیر هەندێ جار

هێمنە و هەندێ جار توند دەبێ. ئەو شیعرانەی لە دەفتەری شیعری (خۆشەویستی)دا تۆمارکراون، مەکشوف و بێ لەزەت و کورتن و پەیوەندییەکی ئەوتۆش لە نێوان شیعرەکانی ئەم دیوانەدا بەدی ناکرێ.

**ژنانی قارەمان (لە دەوروبەری سالآنی ٢٢- ١٥ی پێش ز دانراوە):**

کۆی پازدە نامەی خەیاڵییە کە ژنانی تەنیا و دلتەنگی ئەفسانەیی، بۆ دلّدارانی خۆیان، کە بوونەتە مایەی پەریشانی حالّی وان، نووسیویانە، هەموو نامەکان لە دەم و گاڤی قەیراناویدا نووسراون و ئاهەنگی نامەکان هەندێ جار خەمین و خەمناوەرن و هەندێ جار پڕ جۆش و خرۆش و سۆزاوین. دوو نامەی (کاناسە"١٥" و فیلیس"١٦")ی ئەم کۆنامەیە نموونەی واقیعی تراجیدیای رەسەنن و هەندێکی دیکەیان پڕن لە شۆخی و نوکتەبازی (وەکو پنەلوپە"١٧" و فیدرا"١٨"). ئەم نامانە بەشێوەیەکی گشتی توژینەوەی پەسندن دەربارەی خو و خدەی ژنان، بەلآم هەندێکیان زۆر ناهونەرین و بەلگەی بێ زەوقین. پێدەچێت چاسەر (ئەفسانەی ژنانی میهرەبان)و لاندور (دیالۆگی خەیالّی) لە ژێر کاریگەری ئەم بەرهەمەدا نووسیبێ.

**جووت نامەکان:**

سێ جووت نامەیە کە پاشکۆی (ژنانی قارەمان)ە هەر جووتێك بریتییە لە نامەیەکی دلّداری پیاوێك و وەلآمی ژنێك (پاریس"١٩"، هیلین"٢٠"، لیاندر"٢١" و هیرو"٢٢"، و ئاکونتیوس"٢٣"، و سیدیپە"٢٤") نوڤید لەم بەرهەمەدا سوودێکی فرەی لە زانستی واتاناسی و روون بێژی وەرگرتووە.

**کەرەستەکانی ئارایشتی ژنان:**

بریتییە لە پەنجا چوارینە کە پرۆگرامێکی سەیر و ئالۆز لە بواری کەرەستەی جوانکردن و مکیاجکردنی ژناندا دەخاتەڕوو، ئەم بەرهەمە لەبەر ئەوەی کۆمەلّە خالّێکی تەکنیکی رووتی لەخۆ گرتووە، جوانییەکی ئەوتۆی نییە.

**"هونەری ئەڤینداری":**

دەقێکی فێرکاری تاڕادەیەك چڕوپڕ و تێروتەسەلە لە سێ کتێبدا، دەربارەی شێوەکانی ئەڤینداری. کتێبی یەکەم هونەری پەیداکردن و رامکردنی ماشوقە فێری پیاوان دەکات، کتێبی دووەم فێریان دەکات کە چۆن بە خۆشەویستی بێننەوە، کتێبی سێیەم بۆ ژنانە و باسی دلّرفاندنی ئاشقان دەکات. واقیعی ئەم شیعرانە، ئەوە دەلّێت کە سەروکاریان تەنیا لەگەلّ ئەشقی بەدەنیدا هەیە. (هونەری ئەڤینداری) یادگارێکی هونەرییە و بەیتەکانی مینا ئەلّماس

دەدرەوشێنەوە. بەرهەمێکی زیرەکانە و تەنز ئامێزی ئاسکە و لە پێناوی هاروژاندنی خوێنەردا هەموو ڕێگەیەك دەگرێتە بەر، ئوڤید لەم بەرهەمەدا ئیدی خزمەتکاری ئەڤین نییە (وەکو لە کتێبانی خۆشەویستی، و ژنانی قارەماندا وابوو)، بەڵکو ئاغای ئەڤینە، و لەم ڕووەشەوە بە خۆی دەنازێ. زۆربەی خەڵکی (هونەری ئەڤینداری) ئوڤیدیان (بە تایبەتی لە سەردەمی ڤیکتۆریا"٢٥")دا بە بەرهەمێکی نە ئەخلاقی لە قەڵەم داوە و ڕەنگە هەر ئەم بەرهەمە و خەتای* شاعیر بووبنە مایەی نەفی کردن و دوورخستنەوەی.

**دەرمانی ئەڤین (لە دەوروبەری ساڵی "١ی"ز بلاوکراوەتەوە):**

ئەم بەرهەمە درێژەی (هونەری ئەڤینداری)یە. هەندێ چارە و دەرمانان (هەڵبەتە تەنیا بۆ پیاوان) بۆ ئەڤین دەخاتەڕوو، لەوانە: کار، سەفەر، گێڕانەوەی عەیبەکانی مەحبوب و حەزکردن لە ژنێکی دیکە. هەروەها هەندێ ڕێ و جێش بۆ هەڵاتن و خۆ دزینەوە لە ئەڤین و ئەڤینداری، دادەنێ، لەوانە: دوورەپەرێزی لەو کۆڕ و مەجلیسانەی کە بشێت ژنەی تیادا ببینرێ، پۆشین و لەبەرکردنی جلوبەرگی ناشیرین، خواردنی باش، نەگوتنی شیعر، (دەرمانی ئەڤین) لە چاو (هونەری ئەڤینداری)دا بایەخێکی ئەوتۆی نییە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا شۆخی و نوکتەبازی جۆرە زیندوویەتییەکی پێ بەخشیوە.

**هۆزانێن گێڕانەوەیی:**

**میتامۆرفۆس (لە ساڵانی ٢- ٨ی ز دانراوە):**

ئەمە هۆنراوەیەکی گێڕانەیی درێژە (دوانزە هەزار بەیتە لە پازدە بەرگدا)و لەسەر وەزنی شەش پایەیی هۆنراوەتەوە، و بەڕای هەندێ لە شرۆڤەکاران بە بەرهەمێکی مەلحەمی دەژمێردرێ. ئەم بەیتە چیرۆکی دۆنای دۆنی مرۆڤ و شتانی بێ گیان لە هەوەڵی خۆلقانەوە تا ساڵی ٤٣ی پێش ز بەزمانی ساڵنامەیی و تەقویمی دەگێڕێتەوە. ئەم گێڕانەوەیە لە گۆڕانی هیولای بێ شێوە و فۆرمەوە بۆ جیهانی بوون دەست پێ دەکات و بە خودا ئاسایی ژول تزار کۆتایی دێت. ئەم بەرهەمە بریتییە لە ٢٤٦ چیرۆك، کە هەر چیرۆکێکیان بە جۆرە دۆنای دونێك کۆتایی دێت. ریزبەندی مێژوویی تەنیا لە بەرگی یەکەم و دووەم و یازدەیەم تا پازدەیەم-ی ئەم بەرهەمە ڕەچاوکراوە، زۆربەی هەرە زۆری چیرۆکەکان لە ئەفسانانەوە وەرگیراون، بەرگی یەکەم تا یازدەیەم بریتییە لە حیکایەتێن ڕۆمانتیکی کورت کە زۆربەیان سۆزاوی و جدی و ئاسك و جۆراوجۆرن. ژمارەیەك لە قارەمانانی حیکایەتەکانیش بە سوعبەتەوە هەجوو دەکرێن. بەرگی دوازدەیەم تا چواردەیەم هەندێ سەنگینتر و مەلحەمی ترن،

و بەرگی چواردەیەم پتر ئەفسانانی نیشتیمانپەروەری دەگێڕێتەوە، بەرگی پازدەیەم دەربارەی رەواجی شارستانیەت و رۆشنبیریی یۆنان لە ئیتالیا و ستایشی رومە وەکو مەڵبەندی مەدەنییەت و شارستانییەتی جیهان، هەروەها لێکدانەوەیەکی لەمەڕ فەلسەفەی فیثاغورس و داکۆکییەکی لە گیاخۆری، گرتۆتە خۆ.

میتامورفۆس، بە شێوەیەکی گشتی بە شاکاری ئوڤید دادەنرێ، ئوڤید لەم بەرهەمەدا، گوزارشت و دەربڕینی مکوم و رەوانی ئەفسانانی کۆن دووبارە زیندوو دەکاتەوە. ئەم بەرهەمە لەنێو بەرهەمە گەورە و شاکارەکانی رومدا لە دوای مەلحەمەکەی ڤێرجیلەوە بە پلەی دووەم دێ.

**ئەو هۆزانانەی کە لە تاراوگەدا وتراون:**

سالنامەی رومی (ئەم بەرهەمە بەر لە دوورخستنەوەی ئوڤید، لە دەوروبەری ساڵی ٨ی ز دانراوە، و شاعیر لە کاتی تاکنجی بوونیا لە تۆمی جارێکی دی پێیدا چووەتەوە و داپڕشتووەتەوە).

ئەم بەرهەمە بەیتێکی تەواو نەکراوە کە لەسەر وەزنی شین و لاوانەوە هۆنراوەتەوە، ئوڤید بە تەما بووە ئەم بەرهەمە لە دوازدە کتێب یان بەرگدا بهۆنێتەوە، بەڵام دوور خستنەوەی ئەو بواری نەداو تەنیا شەش بەرگی پێ تەواو کراوە. ئەم بەرهەمە رووداوەکانی شەش مانگی یەکەمی ساڵ، بە دووپاتکردنەوەی ئاهەنگ و جەژن و بۆنە رومییەکانەوە، باس دەکات و دەگێڕێتەوە. هەر لەم بەرهەمەدا مێژوویەکی سالنامە، هەندێ ریشە دۆزی پەیڤ و وشە کە زۆر جێی باوەڕ نییە، لەگەڵ شەرحێکی بورجەکاندا بەدی دەکرێ، ئەم بەرهەمە کاری کردۆتە سەر (سالنامەی شوانکارەیی) سپنسەر.

**ئیبیس (دەوربەری ساڵی ٨ی ز):**

بەیتێکی توندی سەرزەنش ئامێزە لە ٦٤٤ بەیتدا، کە ئبیس[٢٦] بە زۆر خەتایان مەحکوم دەکات، یەکێك لەو خەتایانەی دەست بەسەراگرتنی داراییەکانی ئوڤیدە لە کاتی دوورخستنەوەیدا.

**بەیتی غەم (لە ساڵانی ٨- ١٢ی ز دانراوە):**

بریتییە لە پێنج دەفتەری لاوانەوە، کەشاعیر داوای عەفوو بەخشین لە ئوگوستوس دەکات و باسی بەدبەختییەکانی خۆی لە تۆمیدا دەکات. ئەم بەیتە کورتە مێژوویییەکی گرنگی ژیانی وی نیشاندەدات، بەڵام لەڕووی هزر و ئەندێشەوە بەرهەمێکی لاوازە.

**کۆمەڵە نامەیەك لە دەریای رەشەوە (١٢- ١٤ی ز):**

بابەتی ئەم بەرهەمە درێژەی بەیتی غەمە. ئەم بەرهەمە چوار بەرگە و چا و چوارنامەی لەخۆ گرتووە. رووی دەمی نامەکان لە کەسانی ناسراوە.

شاعیر لەم نامانەدا ئەو ڕەنجانە دەگێڕێتەوە کە کێشاویەتی، هاوسەرەکەی و دۆستەکانی ستایش دەکات، و وەسفی تومی و دەوروبەری دەکات. ئەم نامانە لەو ڕووەوە کە هەندێ حەقیقەتی ژیانی ئوڤیدیان تۆمار کردووە، یەجگار بەنرخن.

## هەڵسەنگاندنی شیعری ئوڤید:

هەر چەندە زۆر جاران ئوڤید بە گەندەڵی ئەخلاقی و سەرسەرێتی تاوانبار کراوە، بەڵام بەرهەمەکانی بە تەواوی لە مەبەست و ئارمانجی مەزهەبی و ئەخلاقی بەدەرنین. ئوڤید، بێ چەند و چوون و بێ دوو دڵی ئیعتراز لە ستەمی خواوەندان دەگرێت، و زۆر بە کەمی باسی لایەنگری لە خودایانی تەقلیدی رومی دەکات، بەڵام جۆرە یەکتاپەرستییەکی تەمومژاوی زەمینەی چیرۆکی میتامورفوس-ی وی پێك دەهێنێ و چاوی لە ئاسودەیی بەهەشتە.

یەکێك لە عەیبە گەورەکانی ئوڤید تەبیعەتی هەڵچوویەتی، واتە توندڕەوی و تووڕەیی و ترۆیی وییە، دوو عەیبی زۆر گەورەی ئوڤید بریتییە لە:

١- زیرەکی هەمیشەیی.

٢- شوێن نەناسین.

هەڵبەتە کە دێتە سەر ڕەخنەگرتن لەخۆی زۆر جدی نییە و لە تەتەڵە کردنی زمان و نووسیندا بێ توانایە.

ئوڤید لە پاڵ ئەم سەلبیاتانەشدا، خاڵی پۆزەتیڤی زۆرە و لەوانە: فرە لایەنی کارەکانی، خەیاڵی پڕ داهێنان، زەین ڕوونی و هۆش تیژی و زمانپاراوی و... هتد کە هەموو ئەمانە دەیخەنە ریزی پێشەوەی شاعیرانی گێڕەرەوەی غەزەلخوان.

## شۆرەت و دەسەڵات:

بەرهەمی هیچ شاعیرێکی کلاسیکی هێندەی بەرهەمەکانی ئوڤید فرە خوێنەر نەبووە، گەرچی ئوڤید تا سێ سەد ساڵێش پاش مردنی هەر شاعیرێکی گەورە بووە و خۆشەویستی جەماوەری خەڵکی روم بووە، بەڵام کاریگەری قوولی تەنیا بەسەر مارسیالەوە هەبووە، لە سەدەکانی ناڤینەوە تا نیوەی دووەمی سەدەی یازدەیەم ئیدی ئەستێرەی نێویانگ و شۆرەتی بەرەو ئاوابوون چوو. ئیدی لەو ڕۆژگارە بەدواوە و تا ساڵی ١٨٠٠ تەنیا ڤیرجیل دەسەڵاتداری هەرە گەورەی جیهانی ئەدەبیاتی لاتینی بوو. ئەو نووسەرانەی کە زیاتر قەرزارباری ئوڤیدن بریتین لە: دانتی، پترارك، بوکاچو، ئاریوستو، گوتیە، دوبللیە، رونسار، مونتنی، لافوتین، چاسر، سپنسر، شەکسپیر، لاندور، تینی سن، سوین برن، سیدنی، کرتیان دوتروا، گیوم

دولوریس، دومیون، لوپەدوگا، دریتون، کولی، کالدرون، مولیر، هیـی وود، لیلـی، جانـسون و هەروەها گولیاردەکان"٢٧" و ترویادورەکان"٢٨"، مینی"٢٩" سینگەرەکان.

## مێژوو

### لیڤیوس (تیتوس لیڤیوس پاتاڤینوس ٥٩ی پێش ز- ١٧ی ز):

مێژوونووسێکی رومییە، لە پادووا"٣٠" هاتۆتە دنیاوە لە گەنجیدا چـوو بـۆ روم و لەوێنـدەر پەیوەندی دۆستانەی دەگەڵ ئوکتاڤیانوس، و میسیناس و یاوەرانیدا پەیدا کرد. لێپوس پتر لـە چل ساڵی ئاخر و ئوخۆری تەمەنی بە نووسینی مێژوو بـردە سـەر و ئـەنجام لـە پـادووا کۆچـی دوایی کرد.

### بەرهەمەکانی:

### ساڵنامەکان یان مێژووەکان:

ئەم بەرهەمە بریتی بووە لە ١٤٢ کتێب کە تەنیا ٤٥ دانەیان لە دوو کۆ بەرهەمی گەورەدا (لە کتێبانی ١ تا ١٠ و ٢١ تا ٤٥) ماون. ئـەم سـاڵنامانە سـەردەمی دامەزرانـدنی روم تـا مردنی دروزوس"٣١"ی زڕکوڕی ئوگوستوس، لە ساڵی ٩ی ز لەخۆ دەگرێت. بەشی یەکەمی ئـەم ساڵنامانە لە ساڵی ٧٥٣ەوە دەست پێدەکات و لە سـاڵی ٢٩٣ی پـێش. ز.دا کۆتـایی دێـت، بەشی دووەم بە هەڵگیرسانی دووەمین جـەنگی کارتـاژی (٢١٨ی پـێش ز) دەسـت پێـدەکات. رێژەی ئەو ساڵانەی کە هەر بەشێك لە بەرهەمی نێوبراو لـەخۆی گرتـووە جیـاوازە: دە کتـێبی یەکەم ٤٦٠ ساڵ دەگرێتەوە، بەڵام چەند کتێبێکی کۆتایی ئەم بەرهەمە، هەر یەکەیان نزیکەی یەك ساڵ لـەخۆ دەگـرێ. لیڤیـوس، لـە دانـانی ئـەم سـاڵنامانەدا سـوودی لـە زۆر سەرچـاوە وەرگرتووە، بە تایبەتی لە بەرهەمەکانی پۆلوبیوس، بەبێ ئەوەی نێوی ئـەو سەرچـاوانە بـێنێ، شێوازی وی لە کاریگەری ڤیرجیل و سیسرون بەدەر نییە.

لیڤیوس لەم کارەیدا دوو مەبەستی گرینگی هەبووە: تۆمارکردن و نـەمرکردنی تـورەقی و شـکۆمەندی روم، و سەرسـامکردنی خوێنـەرانی بەرهەمـەکانی بـە توانـا درامـاتیکی و حیکایەتخوانییەکانی خۆی. لە هەوەڵەوە بە ئاشکرا دڵبەندی خەڵکی روم و کەسایەتی و کرداری جەماوەری خەڵکی رومە.

لایەنگری لە کۆماریخوازی دەکات، و سەردەمی شەڕەکانی کارتاژی (قەرتاجە) بە قۆنـاغ و سەردەمی شکۆداری روم دەزانێ. بـەڵام بـە توانـا و دەسـەڵات، حەقانیـەت، و روم و زەمـانی

ئوگوستوس دەنازێ، لیڤیوس پێی وایە کە مێژوو پێویستە لەڕووی مەعنەوییەوە بەسوود و پڕ کەڵك بێ —لیڤیوس زیاتر جەخت لەسەر دیاردە ئەخلاقییەکانی کۆمەڵگە دەکات تا لەسەر دیاردە ماددییەکان، و ئەم جەخت کردنەش دەبێتە هۆی ئەوەی کە ئەو دیاردانەی تۆماری کردوون نوقستان دەربچن، لیڤیوس لە زەمانی خۆیدا خۆشەویستییەکی تایبەتی هەبووە و دەگێڕنەوە دەڵێن یەکێك لە هاوولاتییانی قادس (کادیپ) تەنیا بۆ دیتنی وی چووە بۆ روم و پاش دیدەنی وی یەکسەر بۆ ئەسپانیا گەڕاوەتەوە. بەرهەمەکەی وی بووە بە سەرچاوەیەك بۆ نووسەرانی دوای خۆی بە تایبەتی میکاڤیللی، شەکسپیر و مکولی.

**کورتەیەکی رەخنەکان:**

لیڤیوس بە زۆری کەسێکی کەم دیقەتە و لەشتان ورد نابێتەوە، لە هەڵبژاردنی سەرچاوەکاندا بێ موبالاتە و پتر پابەندی هەست و سۆزە تا پابەندی پرەنسیپ و میتۆدی زانستی بێ. راستە مێژوونووسێکی توێژەر و ورد نییە، بەڵام وێڕای ئەوەی کە لە تۆمار کردنی ساڵ و بەروار و وردەکارییاندا هەندێ جاران هەڵە دەکات، مێژووەکەی وی ئەگەر راستگۆیی مێژووییشی تێدا نەبێ، ئەوا راستگۆییەکی شاعیرانەی تیایە و روحی مێژووەکەی وی دروست و راستە. هەر چەندە تەعەسووبی نەتەوەیی هەیە بەڵام لەڕووی بۆچوونی سیاسییەوە بەویژدان و بەئینسافە. وی جیهانبینی مێژوویی نییە، گۆڕانکارییە مێژووییەکان بە هزر و خەیاڵی زەمانی خۆی نارایشت دەکات. زانیارییەکانی وی سەبارەت بە جوگرافیا، سیاسەت، ماف، و کاروباری سوپایی کەم بایەخن، و ئەو بابەتانەی لەسەرچاوەێن جۆراوجۆرەوە وەریان دەگرێ، بە دروستی هەرسیان ناکات، لیڤیوس بۆچوون و تیۆرییەکی یەکپارچە و یەکگرتووی دەربارەی مێژوو نییە و تەنیا بەناو بردنی زنجیرە رووداوێك واز دێنێ و سوکنایی دێت. هۆی هەرە گەورەی مانەوەی بەرهەمەکانی لە شێوازی مامۆستایانەیدایە، یانی رەوانی و کورتی رستەکانی و دەوڵەمەندی و سفتی دارشتن کە نیشانەی جۆش و خرۆش و هەوراز و نشێوی حیکایەتخوانییە، دەڵێن لیڤیوس لە باری شێوازەوە یەکێکە لەو پەخشان نووسە هەرە دیارانەی کە جیهان بەخۆوەی دیتووە.

# پەراوێز و ژێدەران:

١- مانتروا:

ناوچەیەکە لە باکووری ئیتالیا.

٢- میسیناس (٧٠-٨ی پێش ز) سیاسەتوانێکی رومییە و یەکێك بووە لە ئەدەبدۆستان.

٣- سکریبونیا:

دووەمین هاوسەری ئوکتافیانووس-ی یەکەمین ئیمپراتۆری رومە.

٤- ئوکتاڤیا:

کیژی ئوکتافیانووس و دووەمین هاوسەری مارك ئانتونییە.

٥- مارسلوس (٢٦٨- ٢٠٨ی پێش ز): فەرماندەیەکی روومییە.

٦- پولیو (٧٥ی پێش ز ٥ی ز) خەتیب و سیاسەتوانێکی رومی بووە.

٧- پیراندز (سەدەی حەوتەمی پێش ز): شاعیرێکی مەلحەمەبێژی یۆنانییە.

٨- رودسی (سەدەی سێیەم تا دووەمی پێش ز): شاعیرێکی یونانییە.

٩- بەرهەمێن ناوەرۆك جیاواز (Saturae): بە مانای بەرهەمێکی نێوەرۆك جۆراوجۆر دێ. دەبێ ئەوەش بگوترێ کە هۆراس لە روانگەی توێژەرانی ئەدەبیی جیهانەوە بە رچە هەڵگری لوسیلیوس لەم جۆرە ئەدەبەدا دەژمێردرێ و گەیاندوویەتە لوتکە.

١٠- ئاکتیوم: لوتکەیەکە لە باکووری رۆژئاوای یونان، هێزەکانی ئوگوستوس لێرەدا ئانتونیوس و کلیوپاترا یان شکان (٣١ی پێش ز).

١١- دەم و گاڤ – Carpediem: دەربڕینێکی لاتینییە بە مانای "ئەمڕۆ لە کیس مەدە). لە ئەدەبیاتدا، بە تایبەتی لە شیعری لیریکیدا، دەلالەت لەو مەبەستە دەکات کە تەمەنی لاوی کورتە و جەخت لەسەر گەڕان بە دووی لەزەتدا دەکات.

١٢- لاوانەوە و شیننامە: لە زمانی یونانیدا زاراوەی Elegy بۆ ئەو شیعرانە بەکاردێ کە بۆ لاوانەوە و شیوەن دادەنرێن و، ئەوەش شیعرێك بووە کە بەیتێکی لەسەر وەزنی شەش سیلابی بووە و بەیتەکەی دوای ئەوە لەسەر وەزنی پێنج سیلابی بووە. یونانییەکان بە زۆری لاوانەوەیان لە قالبی ئەم جۆرە شیعرەدا دەهۆنییەوە، بەڵام رومییەکان شیعری غەزەلیشیان لەم قالب و فۆرمەدا داناوە.

١٣- میسالا (٦٤ی پێش ز- ٨ی ز):

فەرماندە و خەتیبێکی رومی بووە و پشتیوان و دۆستی ئەدیبان بووە.

١٤- سولپی سیا (لە ئاخر و ئۆخری سەدەی یەکەمی پێش. ز. دا ژیاوە):

ئافرەتێکی شاعیری رومی بووە.

١٥- کاناسە:

کیژی ئەیول-ی پاشای مانیزی (دەکەوێتە تسالی)یەوە، کە پوسیدون حەزی لێکرد. ئەم کیژە لەگەڵ برایەکەی خۆیدا زینای کرد.

١٦- فیلیس:

شازادەخانێکی خەڵکی تراس-ی مەقدۆنییە بووە، کە دەزگیرانەکەی لە وەختی خۆیدا بۆ زەماوەندەکەی ئامادە نەبوو، خۆی لە سێدارە داوە، وا باوە کە خواوەندان کردوویانە بە درەختی چوالە.

١٧- پنەلوپە:

هاوسەری ئودیسیوس-ی پاشای ئیتاکیا بوو کە ماوەی بیست ساڵان چاوەڕوانی هاوسەرەکەی کرد و هەر بە ئەمەکداری مایەوە.

١٨- فیدرا:

هاوسەری تسیوس-ی پاڵەوان و پاشای ئاتین بوو. حەز لە هیپولوتوس-ی کوڕی هاوسەری یەکەمی تسیوس دەکات و کە هیچ بە هیچ ئاکات بوختانی بۆ هەڵدەبەستێ و دەبێتە باعیسی مەرگی و پاشان خۆیشی خنکاند.

١٩- پاریس:

کوڕی پریام-ی پاشا تەروادە بوو، پاریس هیلین-ی رفاند و بوو بە مایەی هەڵگیرسانی شەڕی تەروادە.

٢٠- هیلین:

هاوسەری مینلایوس-ی پاشای ئەسپارتە بوو.

٢١- لیاندر (بە گوێرەی ئەفسانانی یۆنانی) لاوێك بوو کە شەوان بە مەلە لە گەلیی دەردە نیل دەپەڕییەوە تا بگات بە هیرۆ-ی دەنك و خۆشەویستی.

٢٢- هیرۆ:

پاسەوانی پەرستگەی ئافرۆدیت و ماشووقەی لیاندر بوو.

٢٣- ئاکونتیوس:

لاوێکی یونانی بوو کە حەزی لە سیدیپە کرد و ئەڤینی وی وەکو داستانێك کەوتە سەرزاران.

٢٤- سیدیپە:

دەزگیرانی ئاکونیتوس بوو.

٢٥- سەردەمی ڤیکتوریا (سەر بەقۆناغی ڤیکتوریا ١٨١٩- ١٩٠١) شای ئینگلستان بوو لە ساڵانی ١٨٣٧- ١٩٠١)

(*) خەتای شاعیر:

خەتای ئوڤید کە لەگینە هۆی دوور خستنەوەکەی وی بووبێ، لەوەیە ئەمە بووبێ کە ئاگای لە ئاشقێکی نهێنی شازادە خانم جولیا بووە، بەڵام ئەمەی بۆ ئوکتافیانووسی باپیری جولیا، نەگێڕاوەتەوە.

٢٦- ئیبدیس:

مەعلوم نییە کە ئاخۆ کەسایەتییەکی خەیاڵییە یان راستییە.

٢٧-گولیاردەکان:

ئەمانە زانایان یا کەشیشانێك بوون کە لە خەرقەی روحانی مەحروم بوون و لە سەدەکانی ١٢و ١٣ی زایینیدا لە ئینگلتەرا و فەرەنسا و ئەڵمانیادا بە ئاوارەیی و ئاشقاتی (شایەری) گوزەرانیان دەکرد. خۆیان بەوە دەزانی کە بابایەکی روحانی ئەفسانەیی بەناوی گولیاس پشتیوانییان لێدەکات، ئەم گرووپە لە گۆرانییەکانی خۆیاندا هێرشیان دەکردە سەر سەختگیرییەکانی کڵێسا و بە تەوس و توانجەوە شیعر و گۆرانییان بە ئەڤین و شەرابدا هەڵدەگوت.

٢٨- تروبادورەکان:

کۆمەڵێك موتریب و ئاشقی گەڕۆك بوون لە ئەورووپای سەدەکانی ناڤیندا بە تایبەتی لە فەرەنسادا.

٢٩- مینی سینگەرەکان: ئەمە ناوی ژمارەیەك لە شاعیرانی لیریکی ئەڵمانی سەدەی ١٢و ١٣ی زایینی بووە.

٣٠- پادووا: ناوچەیەکە لە باکووری رۆژهەڵاتی ئیتاڵیا و رۆژئاوای ڤینیسیا.

٣١- دروزوس (٣٨- ٩ی پێش ز):

فەرماندەیەکی رومی بووە.

# سەردەمی ئیمپراتۆرییەتی

## (١٤- ٤٧٦ی ز)

**پێشینەیەکی مێژوویی:**

ئەمە قۆناغێکە لە مردنی ئوگوستوسەوە لە ساڵی چواردەیەمی زایینیدا تامردنی مارکوس ئورلیوسی ئیمپراتۆر لە ساڵی ١٨٠ی ز دا درێژە دەکێشێت، بە شێوەیەکی گشتی بە قۆناغی دارووخان و هاتنە خوارەوە دەژمێردرێ. زۆربەی ئیمپراتۆرانی سەرەتاکانی ئەم قۆناغ و سەردەمە، بە تایبەتی کالیگولا "١"، و نیرون "٢" کە بە ریز لەساڵانی ٣٧ تا ٤١ی ز، و لە ٥٤ تا ٦٨ی ز جڵەوی وڵاتیان بە دەست بوو. کەسانی زۆردار و دژی ئازادی تاکەکەسی بوون. ئیمپراتۆران (نێرڤا "٣"، ترایانوس "٤" هاردیانوس "٥" ئانتونیوس پیوس "٦"، و مارکوس ئورلیوس) کە لە ساڵانی ٩٦ تا ١٨٠ی ز حوکمڕانییان کردووە، رومیان گەیاندووەتە پلەیەکی بەرزی خۆشگوزەرانی و بەختەوەری. ترایانوس سنوورەکانی ئیمپراتۆرییەتی رومی گەیاندە دوورترین ئاقار و دەڤەر. پاش کۆچی دوایی مارکوس ئورلیوس، وێڕای هەندێ قۆناغی جێگیر و ئارامی رێژەیی وەکو قۆناغی دیوکلتیانووس "٧" (٢٨٥- ٣٠٥)، ئیدی بارودۆخی ئابووری، کۆمەڵایەتی و سیاسی بەردەوام خراپتر دەبوو. هێرش و پەلاماری تیرە هۆڤی و بەربەرەکان لە ماوەی سەدەکانی چوارەم و پێنجەمدا پتر و بەرینتر بوو. لە ساڵی ٣٦٤ ئیمپراتۆرییەت پارچە پارچە بوو، لە ساڵی ٤١٠دا گوتەکان "٨" بە سەرکردایەتی ئالاریک "٩" روم-یان داگیرکرد و تاڵان کرد، و لە ساڵی ٤٧٦ ئیمپراتۆرییەتی رومی رۆژئاوا بە دەستی ئودواکر "١٠" رووخا. رووداوە گرنگەکانی ئەم قۆناغ و سەردەمە بریتین لە: لە خاچدانی مەسیح لە ساڵی ٣٠ی ز ، سوتانی روم لە ساڵی ٦٤دا، وێران بوونی ئۆرشەلیم لە ساڵی ٧٠دا، ئاگر کەوتنەوەی ڤیزومیوز "١١" و نغرو بوونی پۆمپی "١٢" و هوکولانوم "١٣" لە

ساڵی ٧٩دا یەکەمین هێرشی گوتەکان لە ساڵی ٢٥١دا، گواستنەوەی پایتەخت بۆ قوستەنتەنیە لە ساڵی ٣٣٠دا، دابەش بوونی ئیمپراتۆرییەت لە ساڵی ٣٦٤دا، تالانکردنی روم بە دەستی گوتەکان لە ساڵی ٤١٠ی ز، تالانکردنی روم لەلایەن ڤاندا "١٤" لەکانەوە لە ساڵی ٤٥٥، و رووخانی ئیمپراتۆرییەتی روم-ی رۆژئاوا لە ساڵی ٤٧٦دا.

**نۆڕینێکی گشتی:**

ئەدەبیاتی روم-یش وەکو دەبیاتی یونان، پاش سەردەمی زێڕینی خۆی، چووە قۆناغێکی پڕ ئەهامەتی و داڕووخانەوە، داکشانی باری کۆمەڵایەتی و سیاسی، داکشانی ئەدەبیاتی لە هەردوو ئاستی چەندایەتی و چۆنایەتییەوە بەگەڵ خۆی خست. وێڕای ئەوەی کە زۆربەی ئیمپراتۆرەکان هاندەری داهێنانی بەرهەمی ئەدەبی بوون، دە ئیمپراتۆری یەکەم (پاش مەرگی ئوگوستوس و پێش حوکمڕانی نیرڤا لە ساڵی ٩٦ی ز) زۆر سانسۆرو سنووریان خستەسەر و بەردەم ئازادی دەربڕینی ئەدەبی و بوونە باعیسی پووکانەوەی فەلسەفەش. نووسەران لە ترسی ئەوەی نەبادا قسەکانیان سەر و دڵی کەسێك بگرێ، بەرهەمی زۆر ناڕەسەن و دەستکردیان دەنووسی و پتر خۆیان بە فەنکارییەوە خەریك دەکرد. ئەوەی کە برەوی بەم رێچکە و رێبازە دەدا بایەخدانی زۆربەی نووسەران بوویە هونەری رەوانبێژی کە حەزیان دەکرد بەرهەمەکانیان بە دەنگی بەرز لە بەردەم جەماوەری خەڵکدا بخوێننەوە. روو کردنە نووسەرانی گەورەی سەردەمی ئوگوستوس کرد بە کارێك کە نووسەران دواتر هەڤڕکی وان بکەن —بەبێ ئەوەی چ سەرکەوتنێك بە دەست بێنن.

ئەم قۆناغ و سەردەمە، سەردەمی بڵاوکردنەوە بوو. خوتبە، نامە، مێژوو، بیوگرافی، چیرۆك و ((لە قۆناغەکانی ئاخر و ئۆخری ئیمپراتۆرییەت))دا نووسینی ئایینی و مەزهەبی قالب و فۆرمی هەرە باو و سەرەکی ئەدەبی بوو. شیعر و شاعیری ئەگەرچی تاڕادەیەك بێ گیان و بێ هەناسە بوو بوو، بەڵام بە تەواوی نەمردبوو. سنکا دراماکانی بە شیعر نووسی، مارشاڵ چەند شیعرێکی داشۆرینی نووسی، و ئەستاتیوس بەیتێکی مەلحەمی نووسی.

## تراجیدیا

**سنکا (لوکیوس ئانایوس سنکا ٣ی پێش ز- ٦٥ی ز):**

شانۆنامەنووس، فەیلەسووف و تەنووسێکی روومییە. سنکا لە کوردوڤا، لە ئەسپانیا هاتۆتە دنیاوە، یەکێك بووە لە مامۆستا و پەروەردەکارانی سەردەمی لاویی ئیمپراتۆر

نیرون. لەساڵی ٤١ی ز بۆ کورسیکا"١٥" دوور خراوەتەوە، لێ لە ساڵی ٤٩ی ز بۆ روم گەڕایەوە و بوو بە شیرەتکاری نیرون (٤٩- ٦٥) کە سەروەت و سامانێکی زۆری پێ بەخشی. سنکا وەکو راوێژکاری نیرون هەمیشە هەوڵی دەدا لە خراپەکاری دووری بخاتەوە. سەرەنجام بەوە تاوانبار کرا کە دەستی لە پیلانەکەی پیزون"١٦"دا دژ بە نیرون هەبووە، بۆیە ناچار بوو خۆکوژی بکات.

**تراجیدیاکانی سنکا:**

نۆ تراجیدیا لە پاش سنکا بەجێماوە. مێژووی دانانیان دیار نییە، پێدەچێ سنکا لە دواساڵەکانی تەمەنیدا ئەم بەرهەمانەی نووسی بێ. زۆربەی ئەم تراجیدیانە لەبەرهەمی تراجیدییا نووسانی یونانییەوە ئامادەکراون و دارێژراونەتەوە.

**هەرکولی دێوانە:**

بەدەستکارییەکی زۆرەوە لە هەرکول-ی یوریپیدس-ەوە وەرگیراوە.

**ژنانی فینیقی:**

شانۆنامەیەکی ناتەواوە کە لەبەر رۆشنایی شانۆنامەیەکی یوریپیدس-ەوە بە هەمان ناوەوە نووسراوە.

**میدیا:**

پلۆتی ئەم تراجیدیایە لە بنەڕەتدا هەمان پلۆتی میدیا-ی یوریپیدس-ە.

شانۆنامەکە جەخت لەسەر توڕەیی نامرۆڤانە و ئەفسونی نائاسایی میدیا دەکاتەوە. ئەم بەرهەمە وەکو سەرچاوەیەکی جادوویی کۆن بایەخدارە، پێدەچێت شەکسپیر لە شانۆنامەی مەکبسدا ئەو دیمەنانەی کە پێوەستن بە ژنانی جادووگەرەوە، لە ژێر کاریگەری میدیادا نووسیبێتی.

فیدرا: لەبەر رۆشنایی شانۆنامەی هیپولیت-ی یوریپیدسدا نووسراوە. فیدرا بە یەکێك لە شانۆنامە هەرە باشەکانی سنکا دەژمێردرێ. ئەم بەرهەمە سەرچاوەی فیدراسین، و فیدرا-ی دانونتسیو بووە.

**ئودیپ (ئودیپوس):**

ئەم بەرهەمە لەشانۆنامەیەکی سوفوکلیس-ەوە بە هەمان ناو وەرگیراوە، بەڵام سنکا جەختێکی زیاتر لەسەر زوڵم و هەستکردن بە گوناحی ئودیب دەکات.

**تونستس:**

ئەمە تراجیدیایەکی بەهێزە و ناواخنەکەی لەسەر تۆڵە و تۆڵەکارییە، ئەم بەرهەمە تاقە بەرهەمی سنکایە کە لەبەر ڕۆشنایی و لە ژێر کاریگەری شانۆنامەی یونانیدا نەنووسرابێ.

**ئاگامەمنون:**

ئەم شانۆنامەیە درێژەی تونستس-ە و لەبەر ڕۆشنایی و کاریگەری ئاگامەمنون-ەکەی ئاسخیلوس دانراوە و باسی گەڕانەوە و کوژرانی ئاگامەمنون دەکات.

**هەرکول لە ئوتادا:**

سەرچاوەی ئەسڵی ئەم شانۆنامەیە ژنانی تراخیس-ی سوفوکلیس-ە، لەوە دەچێ هیچ گومان لەوەدا نەبێ کە سنکا لە دانانی ئەم بەرهەمەمەدا لە ژێر کاریگەری میتامورفوس (کتێبی نۆیەم)، و ژنانی قارەمان (نامەی نۆیەم)ی ئۆڤیدا بووبێ. بابەتی ئەم شانۆنامەیە بریتییە لە مردن و لەدایکبوونەوەی هەرکول. تۆن و ئاوازی ڕوحانییانەی شانۆنامەکە تازە و ڕەسەنە.

**خەسڵەت و تایبەتمەندی تراجیدیاکانی سنکا:**

زەبری و توندی شانۆنامەکانی سنکا و وەسفی وردەکاری ڕەفتار و هەڵسوکەوتی کەسایەتییەکان لەسەر شانۆدا، نیشانەی ئەوەیە کە ئەم شانۆنامانە هەرگیز نمایش نەکراون و لەگینە بۆ ئەنجامدان و جێبەجێ کردن نەنووسرابن، لەوەیە مەبەستی سنکا ئەوە بووبێ کە شانۆنامەکان بۆ عەوامی خەڵکی نەقڵ بکات یان ئەوە بووبێ کە لە پەناوە بخوێنرێنەوە. خوێندنەوەی ورد و لەسەرخۆ و شێوەی خیتابی بە ئاوتاو لە تایبەتمەندییە بەرجەستەکانی شانۆنامەکانی سنکا بووە، خەسڵەتێکی تری شانۆنامەکانی شروڤەی زیندوو تێروپڕی هەستەکانە بەزمانێکی زیتەڵ و زیندوو لە قاڵبی دیالۆگی چڕودارا. شتی ڕاز ئاسا و جادوویی وەکو تاپۆ و شەبەنگان، تەلیسمان و جیهانی مردووان، بەفراوانی بەکار دەبات. ترسیش بەسەر دراماکانی سنکادا زاڵە. تراجیدیاکانی پڕن لە دیمەنێن شانۆیی جوان و لەبەر دڵان. بەڵام هاوسەنگی پێویستیان کەمە. کاراکتەرەکان ناواقیعین و دەبەنگن. تەکنیکی دراماتیکی لاوازە. بە زۆری هۆکاری نمایشی وجودی نییە. دیالۆگەکان واقیعیانە نین، کار و جوڵە زۆرجار بە شێوەی نابەجێ ڕوو دەدەن، هاتوچۆی کاراکتەرەکان قەناعەت بەخش نییە. جۆری پیشاندانی چیرۆکی شانۆنامەکان نارەوانە. یەکێك لە تایبەتمەندییەکانی دیکەی شانۆنامەکانی سنکا بەکار هێنانی دووبارەی تەتەر و مەنەلۆگی دوور و درێژە.

سنکا نەخشە و پلۆتی شانۆنامەی بەلاوە مەبەست نییە. حاڵەتی غافلگیری و کت وپڕی تەنیا پشت بە تەکنیکە لەفزییەکان دەبەستێ. شانۆنامەکان بە پێشەکییەك لە شێوەی دیالۆگ یان مەنەلۆگدا دەست پێدەکەن- کە ئەمە پێشەکییەکانی یوریپیدس وەبیر دێنێتەوە، و پێشەکییەکەی سنکا زیاتر زەمینە خۆشکردنە بۆ ئاواز و تۆنی شانۆنامەکە.

بونیاد: لە نو شانۆنامەی سنکا، هەشت دانەیان، وێرای زیادکردنی چوار ئاوازی کۆراڵ، بەسەر پێنج پەردەدا دابەش بوون. گرووپی کۆراڵ بەشێك نییە لە خودی شانۆنامەکە، بەڵام (لەمیان پەردە) بنەڕەتی ترە. سێ کەسایەتی قسەکەر (لە ئاگامەمنون دا چوار کەسن) یەکجار لەسەر شانۆ دەردەکەون، هەڵبەتە یەکێتییەکانیش لەبەرهەمەکانی سنکادا بەشێوەیەکی رێك و پێك رەچاو ناکرێن.

کێش:

دیالۆگەکان لە بنەڕەتدا لەسەر وەزنی ئیامبیك-ن. سنکا هەمیشە وەزن و کێشی یەك ئەوا بەکاردێنێ.

**کاریگەری و بایەخی تراجیدیاکانی سنکا:**

لە مێژووی درامای تازەدا هیچ نووسەرێکی کلاسیکی بە ئەندازەی سنکا بایەخی نییە.

ئالفییری لە ئیتالیا، کورنی لە فەرەنسا، و زۆربەی تراجیدیانووسانی ئینگلتەرا لەسەدەکانی شازدە و حەڤدەمدا زۆر قەرزارباری هەندێ لایەنی بەرهەمەکانی سنکا-ن، وەکو فۆرم و قاڵب، شێواز و جۆری مامەڵە کردن، شەکسپیر و هاوچەرخانی ویش لەواری سوود وەرگرتن لە پێشگوتار، گرووپی کوراڵ، روح، تەتەر، مەنەلۆگی دوور و درێژ، دابەشکردنی شانۆنامە بۆ پێنج پەردە، جادوو، ترس، تۆڵە، و حەتمیەتی فەلسەفی (وەکو خاڵێك لە هەنبەر حەتمیەتی مەزهەبیی ئاسخیلوس و سوفوکلیس) لە ژێر کاریگەری سنکادا بوون.

**پەخشانەکانی سنکا:**

سنکا جگە لە تراجیدیا، بەرهەمێکی زۆریشی، کە زۆربەیان فەلسەفین، بە پەخشان نووسیووە، یەکێکە لە پەیڕەوکارانی حیکمەتی عەمەلی رەواقییەکان. ئەم لایەنەی هزر و بیرەکانی وی ئەوەندە رەسەن نین، بەڵام سێبەری خستووەتە سەر بیر و هزری سەدەکانی ناڤین و هزر و بیری مونتنی و ئەمرسون. شێوازی سنکا لە پەخشاندا کورت و پڕمانایە، بە زۆری رستەی کورت و رەگەزدۆزی و.... بەکار دێنێ.

**دیالۆگەکان:**

ئەم سەرناوە سەرناوێکی نابەجێیە، چونکە ئەم نووسینانە لەڕاستیدا نووسین و نامەی ئەخلاقین. ژمارەی ئەم نامانە دە نامەن لە دوازدە کتێبدا: ١- دەربارەی دووربینی، باسێکە سەبارەت بە شەڕ. ٢- دەربارەی پایەداری حەکیمان، ناتوانرێ حەکیم و ئاقڵان ئازار بدرێن یان سوکایەتیان پێ بکرێ. ٣- دەربارەی توڕەیی، بریتییە لە سێ کتێب سەبارەت بە ماهیەتی توڕەیی و دامرکاندنەوەی توڕەیی. ٤- دڵدانەوەی مارسیا، دڵدانەوەی کچەکەیەتی پاش لە دەست دانی کوڕەکەی. ٥- دەربارەی ژیانی بەختەوەران، تەنیا چەند پارچەیەکی ماوە و پێناسە و ستایشی بەختەوەری لە روانگەی رەواقییەکانەوە دەکات. ٦- دەربارەی ئاسایش، پاکانەیە بۆ دروستی دوورە پەرێزی لە ژیانی کۆمەڵایەتی. ٧- دەربارەی ئاسوودەیی بیر، چەند بابەتێکە سەبارەت بە فەلسەفەی رەواقی. ٨- دەربارەی کورتی تەمەن: ئەگەر ژیان بە فیڕۆ نەدەین بەش دەکات. ٩- دڵدانەوەی پۆلۆبیوس، دڵدانەوەی ئەو مامورانەیە کە عەرز و حاڵەکانیان دەگەیاندە خزمەتی ئیمپراتۆر کلاودیوس. ١٠- دڵدانەوەی هلویای دایکی، دڵدانەوەی دایکیەتی لە کاتی دوورخستنەوە و نەفی کردنی خۆیدا.

**نامە ئەخلاقییەکان:**

برتییە لە ٢٤ نامە لە بیست کتێبدا، زۆربەی نامەکان دەربارەی داب و نەریت و ئەخلاقییاتە. ئەم نامانە ئاراستەی لوسیلیوس-ی ماموری کاروباری باج و خەراجی سیسیل کراوە.

**وتارە ئەخلاقییەکان:**

دوو بەرهەمی درێژی ئەخلاقیی سنکا لەبەر دەستدان: ١- دەربارەی بەخشش، بریتییە لە دوو کتێب. ٢- دەربارەی چاکە، لە سێ کتێب پێکهاتووە.

**پرسە سروشتییەکان:**

گوتارێکە لە حەوت کتێبدا دەربارەی زانستە سروشتییەکان. لەم بەرهەمەدا ئەم پرس و دۆزانە خراونەتەڕوو:

١- پەلکە رەنگینە
٢- هەورە تریشقە
٣- ئاو
٤- هەستانی نیل، تەرزە و بەفر

٥- با

٦- بوومە لەرزە

٧- ئەستێرەێن کلکدار

بایەخی ئەم کتێبە لە بەها زانستییەکەیدا نییە بەڵکو لە ناوەرۆکە ئەخلاقییەکەیدایە (رەواقی).

ستایشی تەوسامێز:

ئەمە تەنزێکی دڵگیر و زیرەکانەیە دەربارەی ئیمپراتۆر کلاودیوس، کە لە سەر شێوەی تەنزەکانی مینپوسی دانراوە.

## تەنز

پترونیوس (گایوس پترونیوس ئاربیتەر، ز — ٦٥ی ز):

تەوسنووسێکی لاتینییە. زانیارییەکی زۆر کەم لەمەڕ ژیانی وی لە دەستدایە. بە گوێرەی نۆڕینی تاسیتوس "١٧"، پترونیوس مامۆستای رابواردنەکانی نیرون بووە، پترونیوس بە تاوانی ئەوەی کە دەستی لە پیلانی پیزوندا هەبووە، بە ناچاری خۆی کوشتووە.

ساتیریکون:

چیرۆکێکی درێژە بە پەخشان نووسراوە کە ناو بەناو بە مەبەستی جوانی و رازانەوە هەندێ هۆزانی تێهەڵکێشراوە. تەنیا هەندێ بەش (١٤١ بەش) لە هەردوو کتێبی پازدەیەم و شازدەیەم لە چەپۆکی رۆژگار رزگار بوون- رەنگە هەمووی بکاتە هەشت یەکی دەقی ئەسڵی بەرهەمەکە، ئەم چیرۆکە پلۆت و نەخشەیەکی لاوازی هەیە کە باسی بەرەڵڵایی سێ لاوی سەرسەری دەکات. بەشی یەکەم (بەشەکانی ١ تا ٢٦) زیاتر باسی ئەدەبیات و وتاربێژییە.

بەشی دووەم (بەشەکانی ٢٧ تا ٧٨) دەربارەی "زیافەتی تریمالیگو"، بەناوبانگترین فەسڵی چیرۆکەکەیە، تریمالیگو (کە بە بۆچوونی هەندێ لە توێژەران وێنەیەکی هەجوئامێزی نیرون-ە) کەسێکی بەرەڵڵا و وێڵە، بێ کار و کردەوەیە، فشەکەر و نۆکیسەیە، کە پترونیوس لەرێگەی سوعبەت و شۆخییەکانیەوە گاڵتە و تەوسی پێدەکات. دوا بەش (بەشەکانی ٧٩ تا ١٤١) باسێکە دەربارەی ئەمانی هونەر، وەسفێکی شاعیرانەیە دەرهەق بە گرتنی تەروادە بە دەستی یونانییەکان، شیعرێك دەربارەی جەنگی ناوخۆی روم، چیرۆکی ((بانۆی ئیفسوس "١٨")), شەرحی سەفەرێکی دەریایی و کەشتی شکانی سێ لاوی وێڵە.

ساتیریکون بە چەمکی ئەمڕۆ پلۆت و نەخشەیەکی دروستی نییە. بونیادی چیرۆکەکە سست و لاوازە و رووداوەکانی نالوجیکییە، تەنانەت هیچ بنەمایەکی ئەخلاقی ئەوتۆی نییە کە

نووسەر چیرۆکەکەی لەسەر رۆبنێ. وەسفی کەسایەتییەکانی زهنییە، لایەنی تەنز ئامێزی کتێبەکە لاوازە، و کەسایەتییەکان هیچ ئەهامەتێکی ئەخلاقییان نییە، نووسەر بەسەر شەرخوازی و گەندەڵییەکاندا باز نادات، بەڵام لە بەرامبەریانیشدا ناوەستێتەوە، نۆرینی وی نۆرینێکی ئەخلاقی نییە، ساتیریکون سەبارەت بە ئەخلاقی ئەدەبی و نمایشی بێ موبالاتە، و پڕە لە عەیش و نۆش و لەزەت و نەفس پەرستی. لە هەر رامان و هزرینێکی ئەخلاقی بەدەرە، بەڵام جارجار بە پەیڤی کورت و سادە و وێنەیێن تەنزئامێز دەڕازێنرێتەوە. ئەم کتێبە لەرووی وشەوە گەلەك دەوڵەمەندە، بە تایبەتی وەکو گەنجینەیەکی وشە و پەیڤی خەڵکانی کۆلکە خوێنەوار مایەی سەرنج و جێی هەڵوەستەیە.

**مارسیال (مارکوس ڤالیریوس مارتیالیس ٤٠- ١٠٢ی ز):**

بابایەکی تەنزنووس و پێکەنینۆك پەروەرە. لە بیل بیلیس-ی ئەسپانیا هاتۆتە دنیاوە. لە دەوروبەری ساڵی ٦٤ی ز چوو بۆ روم و لەوێندەر هەواداریکی زۆری پەیدا کرد. لە ساڵی هەشتادا کۆمەڵێك نوکتەی دەربارەی رێورەسمی کردنەوەی کولیسیوم "١٩" پێشکەش بە ئیمپراتۆر تیتوس کرد، کە ئەویش زۆر ئیمتیازی کۆمەڵایەتی و سوپایی دایێ. لە کۆتاییەکانی تەمەنیشیدا ژنێکی دەوڵەمەند مولکێکی بچووکی پێ بەخشی. مارسیال لە ساڵی ١٠١ی ز بۆ بیل بیلیس گەڕایەوە و هەر لەوێندەر کۆچی دوایی کرد.

مارسیال لە ساڵانی ٨٤- ٨٥ی ز دوو کتێبی پەندی بە نێوی زنیا و ئاپوفورتا لە قاڵب و فۆرمی شیننامەدا بڵاوکردەوە. لە ساڵانی ٨٦- ١٠١ی ز سیازدە کتێبی نوکتە و پێکەنینۆك و قسەی ئەستەق بڵاوکردەوە. ئەم پازدە کتێبە نزیکەی ١٢٠٠ نوکتە و پەندی کورتیان لەخۆ گرتووە، هەڵبەتە مەودای بابەتی ئەم کتێبانە یەجگار بەرین و بڵاوە، هەندێ لە نوکتەکان مایەی پێکەنینن، بەڵام زۆربەیان تەنزئامێزن، زۆر نوکتەی چزودار و توانجاوییان تێیدایە، زۆریشیان نە پێکەنیناوین و نەتوانجاوین بەڵکو ستایش و پیرۆزبایی و داخوازین، هەندێکیشیان پڕن لە دلێری و دلاوەری. مارسیال بەخۆی هەندێ لەو نوکتە و پەندانە بە باش و هەندێکی بە مامناوەندی و هەندێکی تریان بە خراپ دەزانێ لەڕاستیشدا لەڕووی بایەخەوە جیاوازن.

ژمارەیەکیان زۆر زیرەکانە و کینایەئامێز و پڕمانان، و ژمارەیەکیانیش سواو و بازاڕین. ئەگەرچی مارسیال کتێبەکەی خۆی بە بەرهەمێکی ئینسانی دەزانێ، بەڵام زیاتر باسی رەفتار، سستی و لاوازی ئەخلاقی، ریاکاری و ریسواییەکانی رومی ئەو زەمانە دەکات تا کارێن چاك و

خێرخوازانە. بەرهەمەکەی مارسیال کەماڵی رواڵەتی، هۆشیاری، هاوسەنگی و کورتبڕی پێوەدیارە. کاریگەریشی لە ئەسپانیا، ئینگلتەرا، فەرەنسا و ئەڵمانیادا ئاشکرایە.

جوڤینال (دسیموس جونیوس پوڤینالیس، ٦٠ — ١٤٠ی ز): تەنزنووسە. لە ئاکوینوم[٢٠] هاتۆتە دیناوە، تەقریبەن هیچ زانیارییەك لەمەڕ ژیانی وی لەبەردەستدا نییە، جوڤینال شازدە تەنزنامەی لەسەر بەحری شەش پێگەیی نووسیوە:

١- تاوانباران و گەندەڵکارانی ئەسڵی زەمان.

٢- گوناهی نائاسایی، بەتایبەتی لەنێو ئەوانەدا کە لافی پارێزگاری و خواناسی لێدەدەن.

٣- ژیانی پڕمەینەتی رومییان.

٤- هەجووی کابینەی دومیتیان[٢١].

٥- داماوی کۆیلەو ژێردەستانی دەوڵەمەندان و پیسکەکان.

٦- گوتارێکی درێژ و توند دژی ژنان.

٧- دژواری و تەنگوچەڵەمەی قوتابیان و مامۆستایان.

٨- بێهودەیی پلە و پایە.

٩- بێهودەیی هەواو هەوەسی مرۆڤ و باشی دوعای واقیعی.

١٠- رابواردن و عەیش و نۆش.

١١- چلێسی و دەست بڵاوی.

١٢- شادمانی بە بۆنەی رزگاری دۆستێك لە کەشتی شکان و هێرشێك بۆ سەر میراتخۆران.

١٣- کینەکێشی و ویژدان.

١٤- ئەرکی باوکان و دایکان دەرهەق بە منداڵان.

١٥- هۆڤیگەری.

١٦- بەدرەفتاری سەربازان دەرهەق بە خەڵکی ئەسوپایی.

جوڤینال لە گەندەڵی زەمانە زۆر بێزار و تورەیە. نووسینەکانی واقیعی، بەهێز، رەشبینانە، توند، توانجاوی، تیژ و تورەن، بە راستی وەستای تانە و توانجە. ئاواز و تۆنی لە باری ئەخلاقییەوە هەندێ جار زۆر بەرز و باڵایە. لەوەسفدا بێ وێنەیە، و لە زانستی رەوانبێژییدا پڕ و دەوڵەمەندە، لە داهێنانی دەستەواژە و وشەێن کورتدا بەهرەیەکی پرشنگداری هەیە. کاریگەری بەسەر بوالسو، ساموئیل جانسون، و پەیڕەوکارانی کلاسیسزمی تازەوە هەبووە.

## مەلحەمە

### لوکان (مارکوس ئانایوس لوکانوس، ٣٩- ٦٥ی ز):

شاعیرێکی مەلحەمەبێژی رومییە، خەڵکی (کوردوبا)یە و برازای سنکای فەیلەسووفە، بە منداڵی لەگەڵ خانەوادەکەیدا بۆ روم چووە. بە دەستوور و فەرمانی نیرون بووە بە ماموری کاروباری دارایی، بەڵام لە ئەنجامدا بە هۆی ئەوەی کە دەستێکی باڵای لە پیلانی پیزوندا دەبێ، بە ناچاری خۆکوژیی کردووە.

### فارسالیا (جەنگی ناوخۆ):

بەیتێکی مێژوویی تەواو نەکراوە لە نۆ کتێب و نیودا، کەباسی جەنگی ناوخۆی زەمانی ژول تزار دەکات. لەڕووی مێژووییەوە جێی متمانە نییە، بەڵام لە دوو لایەنەوە تازەیە:

١- مامەڵە کردنی مەلحەمی لەگەڵ مێژووی تازەدا

٢- دوورخستنەوەی خودایان لە کردنەوەی گرێی چیرۆکەکە.

نەزمی کتێبەکە هەموارە بەڵام یەکنەوایە، شێوازی شاعیر زۆر دەستکردە، پڕە لە موبالەغە و ڕەگەزدۆزی و پەرەگرافی پێکەنیناوی. پێرستەکانی کتێبەکە بێفایدە و تاقەتبەرە. دەرچوونی بێ ئەندازە لە بابەت بونیادی چیرۆکەکەی لاواز کردووە، بایەخ و گرنگی ئەم مەلحەمەیە لە کاراکتەرسازی تزار، پومپی و کاتودایە، هەروەها لە نوکتە جوانەکانیدایە، لە کۆپلە دڵگیر و تەنزئامێز و چیرۆکە سەیرەکانی دایە. دەربارەی ژنانی سیحرباز و هێزە نائاساییەکان.

### ستاتیوس (پوبلیوس پاپینیوس ستاتیوس، ٤٠- ٩٦ی ز):

شاعیرێکی مەلحەمەنووسی رومییە، لە ناپولی هاتۆتە دنیاوە و لەلاویدا چووە بۆ روم، لەمە زیاتر چ زانیارییەکی دی دەربارەی وی لەبەردەست نییە.

### تیبائید:

بەیتێکی مەلحەمییە لە دوازدە کتێبدا کە چیرۆکی "حەوت کەس دژی تیب" دەگێڕێتەوە. ستاتیوس لەم بەرهەمەدا قەرزارباری ئانئید-ی ڤیرجیلە، و لاسایی کەسایەتی و ڕووداوەکانی ئانئید دەکاتەوە، بە شێوەیەکی گشتی ئانوپۆی تیبائید بەرز و سفتە، کێشێکی ڕەوانی هەیە، و ستاتیوس هونەرە جوانکارییەکان لێهاتووانە بەکار دێنێ بەڵام هەندێ جار توندڕەوی تێدا دەکات. ئەم بەیتە ڕۆمانتیکییە لێوان لێوە لە ڕووداوانی سەیر، نائاسایی، و بەزەیی ئامێز و توندوتیژ، هەڵبەتە گلەیی ئەوەی لەسەرە کە لە گیانی نەتەوەیی، چەمکی ئەخلاقی، و باوەڕی مەزهەبی یان فەلسەفی خاڵییە، تیبائید کاری زۆر کردۆتە سەر نووسەرانی سەدەکانی ناڤین،

بەتایبەتی دانتی و چاسەر، هەروەها ئەدەبیاتی سەدەی هەژدەیەمی ئینگلیستانیش لە کاریگەری ئەم بەرهەمە بەدەر نەبووە.

**ئاخیلنیس:**

مەلمەمەیەکی چەند بەشییە کە بەمەبەستی هونەراندنی ژیانی ئاخیلوس هۆنراوەتەوە. تەنیا یەك کتێب و نیو لەم بەرهەمە، کە باسی دەورانی منالّی قارەمانەکەی لەخۆ گرتووە، بە تەواوەتی هۆنراوەتەوە. بەیتی ئاخیلنیس جوانی و هەستیاری بەرهەمەکانی ئوڤید وەبیر دێنێتەوە.

**بەرهەمی جۆراوجۆر:**

ئەمە سی و دوو شیعرە لە پێنج کتێبدا کە بە وەزنی جۆراوجۆر هۆنراوەتەوە. ئەم شیعرانە بابەتی جۆراوجۆریان لەخۆگرتووە، لەوانە چاکەکانی دومیتیان، مەرگی کۆیلەیەك، پێشکەش کردنی پەیکەرێك، رۆژی لەدایکبوونی لوکان، ئەم بەرهەمانە، بەشێوەیەکی گشتی تاڕادەیەك ریالیستی، کورت و پڕمانان، و وەستایانە داڕێژراون.

## مێژووی سروشتی

**پلینی گەورە (گایوس پلینوس سکوندوس ٢٣- ٧٩ی ز):**

مێژوونووس، ژیاننامەنووس، زانای دەستووری زمان، مامۆستای زانستی رەوانبێژی، لەشکری، و دانەری مێژووی سروشتییە، لە کومون "٢٢" هاتۆتە دنیاوە، هەم لە هێزی زەمینی و هەم لە هێزی دەریاییدا خزمەتی کردووە. ئەنجام کاتێ کە بۆ رێبەرایەتی عەمەلیاتی رزگاری تاقمێك چووە نزیکی کێوی ڤیزوو، لە ئەنجامی دووکەڵی گڕکانەوە خنکا و گیانی لە دەستدا. پلینی خوێنەرانێکی یەجگار زۆری هەبوو، پلینی سەد و شەست دەفتەری نووسیبووەوە. هەندێ لە بەرهەمە فەوتاوەکانی بریتین لە: نامەیەك دەربارەی سوود وەرگرتن لە زوبین، ژیاننامە، پومپونیوس سکوندوس، مێژووی جەنگەکانی ئەڵمانیا (لە بیست کتێبدا)، مێژووی روم (لەسی و یەك کتێبدا)، و نامەیەك دەربارەی روونبێژی. گرنگترین بەرهەمی پلینی مێژووی سروشتییە کە لە سی و یەك دەفتەر پێکهاتووە و بە گوتەی نووسەر لە دوو هەزار سەرچاوەوە کۆکراوەتەوە. ئەم بەرهەمە ئەنسکلوپیدیای تەبیعەت و هونەرە. ناواخنەکەی بریتییە لە: دەفتەری یەکەم، دەستپێك، پێشگوتار، و پێڕست، دەفتەری دووەم، شەرح و شرۆڤەی رووداوە فەلەکی و جەوییەکانی جیهان، دەفتەری سێیەم تا شەشەم، جوگرافیای دنیای ناسرا و زانراو، دەفتەری حەوتەم، مرۆڤناسی و فیزیولوجی، دەفتەری هەشتەم تایازدەیەم، زیندەوەرناسی، دەفتەری دوازدەیەم تا نۆزدەیەم،

گیاناسی و رووەکناسی، دەفتەری بیستەم تابیست و حەوتەم، گژوگیای پزیشکی، دەفتەری بیست و هەشتەم تا سی و دووەم، سوودوەرگرتن لە مەتریالی حەیوانی لە پزیشکیدا، دەفتەری سی و سێیەم تاسی و حەوتەم، بەکارهێنانی تەنی کانزایی لە پزیشکی و هونەردا.

هەڵبەتە زانیارییەکانی پلینی جێی متمانە نین.

(مێژووی سروشتی)یەکەی نیشانەی درشتبینی و کەمدیقەتییە لە هەڵبژاردنی سەرچاوەدا، پلینی دانەرێکی لەزگین و خۆشباوەڕە. شێوازێکی سادە و بێ فۆرمی هەیە، زۆرجار لە خەت دەردەچێ و لە بابەتەکەی دوور دەکەوێتەوە. وێڕای ئەمەش (مێژووی سروشتی)ی پلینی بەسەرچاوەیەکی گرنگ، لە بواری زانیاری کۆندا، دێتە ژماردن. ئەم کتێبە کە بە سەرچاوەیەکی پڕ ئیحتویار دەژمێردرا، کارێکی زۆری کردۆتە سەر سەدەکانی ناڤین.

## نامەکان

پلینی بچووك (گایوس پلینیوس کایکیلیوس سکوندوس، ٦٢ – ١١٣ی ز):

خەتیب و سیاسەتوان، شاعیر، نامەنووس و خوشکەزای پلینی گەورە بووە. بە کومون هاتۆتە دنیاوە، لە لای کوینتیالیانوس خوێندویەتی و پاشان بە فەرمانی ترایانوس پۆستی کونسوڵی و فەرمانڕەوایی بتی نیا "٢٣" -ی وەرگرتووە.

**نامەکان:**

کۆ نامەیەکە لە نۆ کتێبدا کە بەر لە بڵاوبوونەوەی بە وردی داڕێژراوەتەوە. پلینی لە نووسینی ئەم نامانەدا چاوی لە نامەکانی سیسرون کردووە و ئەوی کردووە بە سەرمەشقی خۆی، بەڵام نامەکانی سیسرون زۆر زیندووتر، جوانتر و پڕ ماناترن. هەر نامەیەك باسی بابەتێك دەکات، و تەزی پەندی نامۆژگاری بەنرخە. نامەکان شێوازێکی جوان، سادە و دلگیریان هەیە. بابەتەکانیان زۆر فراوان و دەوڵەمەندن- چالاکی دادگا، ئەدەبیات، دەوڵەتداری، جوگرافیا، رووداوانی رۆژ، و شەرحێکی جوانی گڕکانی فیزوو-ی ساڵی ٧٩ی ز لەخۆگرتووە. بایەخی گەورەی نامەکانی پلینی لەوەدایە کە وێنەیەکی واقیعی ژیانی رومیان و داب و نەریتی باوی ساڵانی ٧٥- ١١٢ی ز بە دەستەوە دەدات. ئەو وێنەیەی کە پلینی بە دەستەوەی دەدات. دەقاودەق پێچەوانەی ئەو وێنەیەیە کە لە میانەی تەنزەکانی جوفینال-ەوە پیشاندەدەرێ.

### گوتاری ستایش:

گوتارێکی بێ ئەندازە ستایش ئامێز و زۆر وەستایانەیە کە پلینی لە کاتی وەرگرتنی پۆستی کونسولی (١٠٠ی ز)دا خوێندویەتییەوە. ئەم گوتارە لە باری زانیارییانی مێژوویی ئەو سەردەمەوە گرنگ و بایەخدارە.

## مێژووی ئەدەب و رەخنە

### کوینستیلیانوس (مارکوس فابیوس، ٣٠- ٩٦ی ز):

مامۆستا، مافزان، رەخنەگر و مێژوونووسی ئەدەبییە، لە کالاگوریس-ی ئەسپانیا هاتۆتە دنیاوە، لێ لە روم خوێندویەتی. پاشان بوو بە مامۆستا و مافزان، و لەسەر داوای ئیمپراتۆر دومیتیانوس، پەروەردە و فێرکردنی کورەکانی ویی لە ئەستۆ گرت. کوینتیلیانوس بە چاولێکەری سیسرون، نامەی (پەروەردەی خەتیب)ی نووسی کە دوازدە کتێبان لەخۆ دەگرێت.

کتێبی یەکەم، پەروەردە و فێرکردنی سەرەتایی منالّ.

کتێبی دووەم، ئامانج و رەوشی فێرکردن لە قۆناغی هەرزەکاری، و پرەنسیپە سەرەکییەکانی هونەری گوتاربێژی.

کتێبی ٣- ١١، ئاداب و بابەتی گوتاربێژی (داهێنان، زەبت و رەبت، روونبێژی.

کتێبی دوازدەیەم، وێنەیەکی خەتیبی نموونەیی. ئەم نامەیە وەکو کۆنترین بەرهەمێك کە باسی مەسەلە تیۆرییەکانی پەروەردە و فێرکردن دەکات، یەجگار بەنرخە، جگە لەمە کتێبەکانی دەیەم و یازدەیەم رەخنەی مێژوویی ئەدەبیاتی کۆنی لاتینی لەخۆ دەگرن، بەتایبەتی ئەو لێکدانەوەو شرۆڤانەی کە دەربارەی ڤیرجیل، ئوڤید و لوکرتیوس نووسراون، مایەی هەڵوەستە و سەرنجن.

## مێژوو و ژیاننامەنووسی

### تاسیتوس تاسیت (کورنلیوس تاسیتوس، ٥٥- ١١٧ی ز):

مێژوونووس، ژیاننامەنووس، و سیاسەتوان بووە و رەنگە خەڵکی ئینترامنا (لە باکووری ئیتالیا) بووبێ. یەکێك بووە لە گرووپی لایەنگرانی ئەنجوومەنی سەنا و کۆماریخوازان کە دژایەتی ئیمپراتۆری (٨٠- ٩٠ی ز) دەکرد، بەلاّم بە فەرمانی سیان لە فەرمانڕەوایانی فلاڤین"٢٤" پۆستی دەوڵەتی وەرگرتووە، تاسیت زەماوەندی لەگەڵ کیژی ژولیوس

ئاگریکولا"٢٥"-ی والی بەریتانیادا، کە لەژێر دەسەڵاتی ئیمپراتۆر دومیتیاندا بوو، کردووە، دۆستایەتی لەگەڵ پلینی بچووکدا هەبووە، و بە فەرمانی نروا گەییە پایەی کونسولی و لە زەمانی ترایانوسدا بوو بە حوکمڕانی ئاسا.

**بەرهەمەکانی:**

**دیالۆگ دەربارەی وتاربێژی (لە ساڵی ٨٠ی ز نووسراوە):**

نامەیەکە بە شێوەی دیالۆگ دەربارەی دابەزینی ئاستی وتاربێژی زەمانی خۆی و ستایشی وتاربێژی زەمانی کۆن، شێوازی ئەم نامەیە لە چاو بەرهەمەکانی دواتری تاسیتدا کارامەترە و لە شێوە و شێوازی سیسرونەوە نزیکترە.

**ئاگریکولا (لە ساڵی ٩٧ی ز دانراوە):**

کۆنترین ژیاننامەی هونەرییانەیە کە ماوەتەوە. ئەم کتێبە بە کورتی ژیانی خەزوری نووسەر دەگێڕێتەوە. ستایشێکی موبالەغە ئامێزی تێدایە، بەڵام هەندێ جاریش دەگاتە لوتکەی سواری و ڕەوانی. بایەخی ئەم ژیاننامەیە لەوەدایە کە بەشێك لە مێژووی کۆنی بەریتانیا دەگێڕێتەوە. دەربارەی ئەم بەرهەمە گوتوویانە کە لەوەیە جوانترین ژیاننامە بێ لەواری ئەدەبیاتی کۆندا.

**گرمانیا (لە ساڵی ٩٨ی ز دانراوە):**

چەردەیەکە لە ژیانی خەڵکانی ئەورووپای ناوەندی لە کۆتایی سەدەی یەکەمی زایینیدا ئەم بەرهەمە کە ئاویتەیەکە لە حەقیقەت و ئەفسانە، وێنەی شارستانییەتی زبر و پیاوسالارانەی تیرەکانی جەرمەن لە بەرانبەر پوکانەوەی شارستانییەتی ئیمپراتۆری روم دەگرێت، ئەم بەرهەمە لەڕووی نەژادناسییەوە گرنگ و بایەخدارە.

**مێژوو (لە ساڵانی ١٠٤- ١٠٩ی ز): دانراوە:**

ئەم بەرهەمە مێژووی ئیمپراتۆرییەتی روم لە ماوەی ساڵانی ٦٩- ٧٠ی ز دەگێڕێتەوە. لەم بەرهەمە تەنیا چوار کتێبی یەکەم و نیوەی کتێبی پێنجەم ماوەتەوە و پێدەچێ کتێبەکانی دیکە لەنێو چووبن.

**ساڵنامەکان (لە ساڵانی ١١٥- ١١٧ی ز دانراوە):**

مێژووی ئیمپراتۆرییەتی روم لە تیبریوس"٢٦"-ەوە تا نیرون (١٤- ٦٩ی ز) لەخۆ دەگرێت. گەلێك لە بەشەکانی ئەم بەرهەمە لەنێو چووە.

**هزر و ئەندێشە:**

**بۆچوونانی سیاسی:**

تاسیت کەسێکی دژە ئیمپراتۆرییەت و توندڕەو و لایەنگری کۆماریخوازی بووە. زوڵم و زۆری دومیتیان-یش هێندەی دی بەرەو کۆماریخوازی دەبرد. تاسیت دژی ئەو بۆچوونە بوو کە دەسەڵاتی موتڵەق و رەها دەبێ لە دەستی حوکمڕاندا بێ.

**مەزهەب و ئەخلاق:**

تاسیت کەسێکی ئایین پەروەر نەبووە و بیروبۆچوونێکی دیاری لەمەڕ یەکتاپەرستی یان عیبادەتی تەقلیدی خودایانی ئولۆمپی نەبووە. هەروەها باوەڕێکی دیاریکراوی دەربارەی نەمری روح و گیان نەبووە، بابایەکی رەواقی مەشرەب بووە، سەبر و سەنگینی پێ باش بووە، بە شێوەیەکی گشتی کەسێکی رەشبین بووە.

**مێژوو و فەلسەفە:**

تاسیت مێژوو و فەلسەفە بەڕوونی پێناسە ناکات، بەڵام مێژوو لەلای وی ئەوزارێکە بۆ وێنەگرتنی نەمانی ئیمپراتۆرییەت و کرمێ بوون و گەندەڵ بوونی حکوومەتانی دیکتاتۆری.

**شێواز و جۆری مامەڵەکردن:**

بەرهەمەکانی تاسیت بەشێوەیەکی گشتی چڕ و پڕ و سەرنج راکێش و جوانن، رستەی کورت بەکار دێنێ، خۆی لە هەر هاوسەنگی و هاوئاهەنگی و وەزن و قافیەیەکی دەستکرد دوور دەگرێت، گەلێك لە قسە کورتەکانی وی شێوە و فۆرمی پەند و قسەی نەستەق وەردەگرن، تاسیت شەیدای فۆرمی خیتابی و جوانی سەرەف و گەردانە، بەرهەمەکانی کاریگەری ڤیرجیل-یان پێوە دیارە. دەربڕینی وی لە گفتوگۆوە نزیکە. بۆ رازانەوەی زمان جەخت لەسەر ناو و ئاوەڵناو دەکات و فەرمان پشتگوێ دەخات، تاسیت لە کاروباری سوپاییدا کۆڵە و زانیارییەکی ئەوتۆی نییە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا، وێنەی گەش و زیندوو دەربارەی جەنگان دەگرێت، لە واری تۆژینەوەی خوو خدەی کاراکتەران و وردکرنەوەی حاڵەتە دەروونییەکاندا کارامە و وەستایە. بەرهەمەکانی بە دروستی، راستگۆیی و سەنگینی بەناویانگن، بەلای کەمەوە هەوڵی دۆزینەوە و نیشاندانی بێ لایەنانەی حەقیقەتەکان دەدات، ئەگەرچی توندڕەوی وی لە دژایەتی کردنی سیستەمی ئیمپراتۆریدا، هەندێ جار حەقیقەتەکان دەشارێتەوە.

**سوئتونیوس (گایوس سوئتونیوس ترانکوئیلوس، ٧٥- ١٤٠ی ز):**

ژیاننامەنووسێکی رومی بووە، سکرتێری ئیمپراتۆرییەت بووە، و دۆستی پلینی بچووك بووە.

**بەرهەمەکانی:**

**ژیانی تزاران (لە ساڵی ١٢٠ی ز دانراوە):**

گرنگترین بەرهەمی سوئتونیوس-ە . ئەم کتێبە ژیاننامەی دوازدە حوکمڕانی رومی لە ژول تزارەوە تا دومیتیان دەگێڕێتەوە.

**ژیانی پیاوانی ناودار (لە ساڵی ١٤٠ی ز دانراوە):**

ژیاننامەی ناودارانی ئەدەب دەگێڕێتەوە، تەنیا چەند پەرەگراف و بەشێکی ماوەتەوە. ژیانی ترنس، هوراس و لوکان گرنگترین بەشی ئەم کتێبەن.

**تایبەتمەندییەکانی:**

سوئتونیوس، لە باری دەروونناسییەوە، روانین و بۆچوونێکی تەواوی نییە، گوێ بە کاراکتەرسازی نادات. لە روانگەی مێژووییەوە دید و بۆچوونێکی سنووورداری هەیە و پێدەچێت بەخۆی لە بایەخ و گرنگی ئەو رووداوانەی کە دەیانگێڕێتەوە و تۆماریان دەکات، غافڵ و بێ ئاگابێ. لە تۆمارکردنی رووداوی ناوی ژیاننامەکاندا گوێی بە تەرتیبی زەمانی نەداوە، هەندێ لە تایبەتمەندی بەرهەمەکانی ئەو بریتییە لە: کورتبڕی، چڕی و پڕی، بێ لایەنی، راشکاوی، روونی و راستگۆیی. سوئتونیوس قسەی خەڵکانی دی بە زۆری بەکار دێنێ و بە زیادەوە پەند و قسەی باوی دووبارە کردۆتەوە.

## چیرۆک

**ئاپۆلیوس (لوکیوس ئاپولیوس، لە دەوروبەری ساڵی ١٢٥ی ز لە دایك بووە):**

نووسەر و خەتیبێکی رومییە، لە مادورا-ی ئەفریقا هاتۆتە دنیاوە. لەگەڵ بێوەژنێکی دەوڵەمەنددا بەنێوی پۆدنتلا زەماوەندی کرد، بەڵام ماڵباتی ژنەکە، ئاپۆلیوس-یان بەوە تاوانبار کرد کە ژنەی بە ئەفسون و جادو و فریوداوە و رایانکێشایە دادگا. ئاپۆلیوس بە زەبری داکۆکییەکی پڕجۆش و خرۆش لە خۆی، تەبرێ بووە.

**بەرهەمەکانی:**

**داکۆکیکاری (داکۆکینامە):**

ئەم نامەیە دەقی ئەو داکۆکییەیە کە ئاپولیوس لە دادگادا دژی ماڵە خەزورانی خوێندییەوە و تەژی نوکتە و پێکەنینۆکە.

**میتامورفوس یان کەری زێڕین:**

ئەم بەرهەمە رۆمانێکە لە یازدە کتێبدا، نەخشە و پلۆتی ئەم چیرۆکە. لە چیرۆکێکی کورتی یونانییەوە وەرگیراوە، کە بە هەڵە دراوەتە پاڵ لوکیانوس. ئەم رۆمانە چیرۆکی لوکیوس، کە خەڵکی تسالی-یە، دەگێڕێتەوە کە چۆن بە هۆی خراپی بەکارهێنانی جادوو دەچێتە پێستی کەرەوە، بەڵام هزر و هۆشی مرۆڤانی وی ناگۆڕێ و وەکو خۆی دەمێنێتەوە. ئیدی پاش هەوڵ و تەقەلایەکی زۆر ئیسیس "٢٧" ی خواوەندی میسری گوڵەباخێکی بۆ ئامادە دەکات و دەرخواردی دەدات، دووبارە دەبێتەوە بە مرۆڤەکەی جاران و دەبێ بە گوێڕایەڵ و موریدی ئیسیس، دیارترین رووداوی ئەم چیرۆکە گوێگرتنی لوکیوس-ە لە ئەفسانەی کوپیدو "٢٨" پسوخە "٢٩"، کە رەنگە رەمزی رزگاری روحی مرۆڤ بێ لە رێگەی ئەڤینەوە.

**گوڵی فەساحەت:**

بریتییە لە ٢٤ پارچەی هەڵبژاردە لە گوتارەکانی ئاپۆلیوس.

**دەربارەی باوەڕەکانی ئەفلاتوون:**

بریتییە لە کورتەیەکی دوو کتێبی پرەنسیپەکانی باوەڕەکانی ئەفلاتوون.

**دەربارەی بوونەوەران:**

وەرگێڕانی ئازادی نامەیەکە کە بە هەڵە دراوەتە پاڵ ئەرەستۆ.

**شێوازی ئاپولیوس:**

نووسینەکانی ئاپولیوس بە هونەرە جوانکارییەکان رازاونەتەوە و زیاتر بایەخ بەم هەستە دەدەن تا بە ئەقڵ و ئاوەز. زۆربەی بەرهەمەکانی پڕن لە هونەری رەگەز دۆزی و سەروا. دەربڕین و گوزارشتی ئاپولیوس غەریب و بێ یاسایە، تەژی زاراوانی تێکەڵ لە نوێ و کۆنن، زمانەکەی زمانی گفتوگۆ و شاعیرانەیە.

**کاریگەری ئاپولیوس:**

ئاپولیوس کاریگەریی بەسەر ئەدەبیاتی سەدەکانی ناڤین و سەدە تازەکانەوە، بەتایبەتی بەسەر بوکاچو و پاتر-ەوە هەبووە.

## ئەدەبیاتی مەسیحییەت

لەبەر ئەوەی کە مەسیحییەت لە سەرەتادا ئایینی خەڵکانی هەژار و بێنەوای کۆمەڵگە بووە و زۆربەیان خوێنەواری و قەڵەمیان نەبووە، بۆیە ئەدەبیاتی راستەقینەی مەسیحییەت لە کۆتایی سەدەی دووەمی زایینییەوە دەست پێدەکات. ئەو نووسەرانەی کە بە دامەزرێنەری ئەدەبیاتی مەسیحی لاتینی دەزانرێن ئەمانەن: مینوسیوس "٣٠" فلیکس، ترتولیانوس "٣١"، قەشەکیپریانوس "٣٢"، ولاکتانتیوس "٣٣"، لە نێو نووسەرانی ئەدەبیاتی مەسیحییەتدا سیمای دوو قەشەی گەورە، واتە جروم و ئوگوستینوس، لە هەمووان پرشنگدارترە.

**جروم، قەشە، (یوسبیوس هیرونوموس، ٣٤٠- ٤٢٠ی ز):**

وەرگێڕ، شرۆڤەکاری کتێبی موقەدەس، ژیاننامەنووس و مێژوونووسە. وەرگێڕانی لاتینی کتێبی موقەدەس و ڤولگات (٣٨٣- ٤٠٥ی ز) بە گرنگترین بەرهەمی دەژمێردرێ. بەرهەمەکانی دیکەی جروم بریتیین لە کۆمەڵێك شرۆڤە و تەفسیران دەربارەی پێغەمبەرانی خودان کتێب و پێغەمبەرانی بی کتێب، ئامۆژگاری و وەعزان، چەندین ژیاننامەی قەدیسان، کۆمەڵێك نامەی زۆر، و ژیانی گەورە پیاوان کە کورتەی مێژووی ئەدەبیاتی مەسیحییەت لە سەردەمی یاوەرانەوە (حوارییون) تا زەمانی خۆی، واتە تا زەمانی جروم دەگێڕێتەوە.

**ئوگوستینوس، قەشە (ئورلیوس ئوگوستینوس ٣٥٤- ٤٣٠ی ز):**

روحانی کلێسا، حەکیمی خواناسی و فەیلەسووف بووە و خەڵکی تاگاشتەی جەزایر بووە، دایکی مەسیحییەکی خواناس و بابی کافر بووە. ئوگوستینوس دەرسی وتاربێژی خوێندووە و لە کارتاژ و روم و میلاندا دەرسی گوتووەتەوە. لە سەردەمی لاویدا بۆ ماوەیەك رێگەی رابواردنی گرتەبەر، ئەوجا بوو بە مانەوی، بەڵام لە میلاندا رموودەی ئامۆژگارییەکانی سنت ئامبروس "٣٤" بوو و باوەڕی بە مەسیحییەت هێنا. لەوە بەدواوە بوویە قسەکەر و نووسەرێکی چەلەنگ و چالاك، وەکو ئەسقوفی هیپو، بەردەوام سەرگەرمی باس و خواس و گەنگەشەی ئایینی بوو، بەتایبەتی لەگەڵ مانەوییەکان "٣٥"، دوناتیاکان "٣٦"، و پلاگیوسیانەکان "٣٧". لە ئەنجامدا لەکاتی گەمارۆی هیپودا بە دەستی واندالەکان کوژرا.

**بەرهەمەکانی ئوگوستینوس پێنج بابەتی سەرەکیان لەخۆ گرتووە:**

١- فەلسەفە. ٢- باس و خواسی ئایینی. ٣- نامەێن ئەخلاقی. ٤- ئامۆژگاری و پەند. ٥- خواناسی تیۆری.

ئوگوستینوس وەکو قسەکەر دەسەلاتێکی زۆری هەبووە، ئامۆژگارییەکانی وی لە سەدەکانی ناڤیندا خوێنەرانێکی زۆریان هەبووە. ئوگوستینوس باوەڕی تەواوی بە رەحمەتی راستەوخۆی یەزدانی و قەدەری موتڵەق هەبووە، و ئەم دوو ئامۆژگارییەی وی کاریگەری بەسەر زۆر کەسەوە هەبووە. دەسەلات و کاریگەری ئوگوستینوس بەتایبەتی بەسەر خواناسی لوتر، کالوین و یانسن-ەوە زۆر دیار و ئاشکرایە.

**دان پێدانان:**

ئەم بەرهەمە لە دەوروبەری سالی ٤٠٠ی ز تەواو کراوە، ئوتوبیوگرافییەکی روحانییە.

ئوگوستینوس لەم کتێبەدا سەرەتا ژیان و باوەڕهێنانی خۆی دەگێڕێتەوە و، لە میانەی ئەوەوە بیروبۆچوونەکانی و کەسایەتی وی ئاشکرا دەبێ. ئەمە جگە لەوەی کە کۆمەلێك حەقیقەتی جوانی ژیان و ئاین و فەلسەفەی ئیمپراتۆرییەتی روم-ی سەردەمی ئەویشی تێیدا تۆمار کراوە، لەڕاستیدا (دان پێدانان) یەکەمین لێکۆلینەوەی راستەقینەی خۆیەتی لە مەیدانی مێژووی ئەدەبیاتدا.

**شاری خودا:**

ئەم بەرهەمە لە دەوروبەری سالی ٤٢٠ی ز تەواو کراوە. بەرهەمێکی زۆر مەزنە و بریتییە لە بەرەڤانی لە مەسیحییەت بەرانبەر بەو تۆمەتەی کە گوایە ئەم ئایینە مایەی رووخانی روم بووە لە سالی ٤١٠ی ز، ئوگوستینوس باسی ئەوە دەکات کە هەموو مێژوو ململانێیەکە لەنێوان شاری خودا و (سەرچاوەی خێر، کە لە هەر مەسیحییەکی فیداکاردا رەنگی داوەتەوە) شاری زەمینی (سەرچاوەی شەڕ کەلە هەر کافر و بێ ئیمانێك دا رەنگی داوەتەوە). ئەم کێشە و ململانێیە بۆ رۆژی پەسلان درێژە دەکێشێت و لەو رۆژی داوەرییەدا، خەلکی شاری خوا براوە دەبن و هەردەمێنن و دانیشتووانی شاری دنیایی دەفەوتێن و لەنێو دەچن.

**بۆئیتوس (ئانکیوس مانلیوس سورینوس بوئیتوس، ٤٧٥- ٥٢٥ی ز):**

لە روم هاتۆتە دنیاوە. بابی کونسول بووە و ئەویش لە سالی ٥١٠ی ز بە فەرمانی ئیمپراتۆر تیودورێك- "٣٨"ی گەورە بوو بە کونسول. بوئیتوس سالی ٥٢٥ی ز بە تۆمەتی پیلانگێڕی دژی ئیمپراتۆر دادگایی کرا و مەحکوم کرا. ماوەیەکی لە زینداندا بەسەر برد و پاشان لە سێدارەدرا، بوئیتوس لە زینداندا بەناوبانگترین بەرهەمی خۆی واتە (تەسەلای فەلسەفە)ی نووسیوە. ئەمە جگە لە وەرگێڕانی فاتیگوریاس-ی ئەرەستۆ و نووسینی کۆمەلێك

راڤە و لێکۆڵینەوە لەسەر ئەرەستۆ، فرفوریوس "٣٩"، سیسرون و نووسینی کتێبانی لۆجیك، ئەستێرەناسی، ژمارە، ئەندازە و مۆسیقا.

**تەسەلای فەلسەفە (خەمرەوێنی فەلسەفە):**

ئەمە گرنگترین بەرهەمی ئەدەبی ئەوە و حیکایەتێکی رەمزییە لە پێنج کتێبدا. لەم کتێبەدا شیعر و پەخشان بە نۆرە بەکار هاتوون، لەم بەرهەمەدا هەوڵدەدات گەلێك لە بنەما و پرانسیپە ئەخلاقییەکانی ئەفلاتوون، ئەرەستۆ، رەواقییەکان و مەسیحییەت لێکدی نزیك بکاتەوە. لە کتێبی یەکەمدا، فەلسەفە لە شێوە و هەیئەتی ژنێکی خەمرەوێن و رێنوێندا لەلای نووسەر دێ، ئاگاداری دەکاتەوە کە نەگبەتی و بەدبەختی ئادەمیزاد زیاتر زادەی بێ خەبەری ئەوە لە تەبیعەت و لە قەدەری خودی ئەو. کتێبی دووەم باسی بەخت و بەغباڵ دەکات و بەجێی متمانەی نازانێ. لە هەردوو کتێبی سێیەم و چوارەمدا مەسەلەی هەمیشەیی و بەردەوامی شەڕ و بەدی باس دەکرێ و بۆچی خەڵکی باش هەر لە مەینەتدان و خەڵکانی بەد لە بەختەوەریدان. فەلسەفە ئەوە دەسەلمێنێ کە خراپی و بەدی چ جەوهەر و حەقیقەتێکی نییە، بەڵکو تەنیا رواڵەتە و خەڵکی بەڕاستی باش، خەڵکانی شاد و بەختەوەرن. لە کتێبی پێنجەمدا پرسێکی هەمیشەیی دیکە خراوەتەڕوو: گونجانی باوەڕ بە ئازادی هەڵبژاردنی مرۆڤ، لەگەڵ باوەڕ بوون بە توانا و زانستی موتڵەقی خوایی. فەلسەفە بە بەڵگە دەیسەلمێنێ کە چونکە خوا لە سەرووی زەمان و سنوورەکانی زەماندایە، بۆیە لە رووداو و کردارەکانی مرۆڤ ئاگادارە بێ ئەوەی بە خۆی ببێ بە هۆی ئەو کردارانە. جا لەم رووەوە مرۆڤ لە کار و کردەوەی خۆی بەرپرسیارە و لەسەرییەتی رێگەی چاکە بگرێتە بەر.

هەڵبەتە لە رۆژگاری ئەمڕۆدا ئیحتوباری سەرەکی بوئیتوس دەگەڕێتەوە بۆ ئەو کاریگەرییە سەیرەی بەسەر نووسەران و هزرڤانانی دوای خۆیەوە هەیبووە، وەرگێڕان و نووسینەکانی بایەخێکی زۆریان لە پاراستن و شرۆڤەی فەلسەفەی کلاسیکدا هەبووە، ژمارەیەك لە بەرهەمە سادەکانی وی لە زۆر قوتابخانانەدا وەکو پرۆگرامی دەرس دەخوێنران، (خەمرەوێنی فەلسەفە)کەی کە بە دەستی ئالفریدی گەورە، چاسر، ئیلیزابێت-ی یەکەم و چەند کەسێکی دیکە تەرجەمەکرابوو، لە سەدەکانی ناڤینەدا، وەکو بەرهەمێکی هەرە خۆشەویست، لە سەرانسەری ئەورووپادا باو بووە و دەستاودەستی کردووە.

# زێدەر و پەراوێز:

١- کالیگولا (١٢- ٤١ی ز):

کالیگولا ناوی شۆرەت و لەقەبی گایوس تزار-ی ئیمپراتۆری روم (٣٧- ٤١ی ز) بوو. حوکمڕانی وی زۆر توندوتیژ و زۆردارانە بووە. دەڵێن هەمیشە داخی ئەوەی خواردووە کە بۆچی هەموو خەڵکی یەك گەردەنیان نەبووە تا بکرێ بە یەك جەزرەبە سەری هەموویان لەلاشە جیابکرێتەوە.

٢- نیرون (٣٧- ٦٨ی ز):

لە ساڵانی ٥٤- ٦٨ی زدا ئیمپراتۆری روم بووە.

٣- نیرڤا (٣٥- ٩٨ی ز):

لە ساڵانی ٩٦- ٩٨ی ز ئیمپراتۆری روم بووە.

٤- تریانوس (٥٣- ١١٧ی ز):

لە ساڵانی ٩٨- ١١٧ی ز ئیمپراتۆری روم بوو.

٥- هاردیانوس (٧٦- ١٣٨ی ز):

لە ساڵانی ١١٧- ١٣٨ی ز ئیمپراتۆری روم بوو.

٦- پیوس (٨٦- ١٦١ی ز):

لە ساڵانی ١٦١- ١٦٨ی ز ئیمپراتۆری روم بوو.

٧- دیوکلیتانووس (٢٤٥- ٣١٣ی ز):

لە ساڵانی ٢٨٤- ٣٠٥ی ز ئیمپراتۆری روم بوو.

٨- گوتەکان: قەومێکی جەرمەنی بوون و لەوە دەچێ شوێنی هەوەڵجاریان ئەسکەندەناڤی بووبێ.

ئەم قەومە لە سەرەتای ساڵانی زایینیدا لە کەناری باشووری دەریای بەلتیك ئاکنجی بوون، لە سەدەی سێیەمی زایینیدا کەوتنە پەلاماردان و تاڵانکردنی ئیمپراتۆرییەتی روم. گوتەکان دوو لق بوون. ئوستروگوتان، ئاکنجی رۆژهەڵاتی رووباری دنیستربوون، ویزگوتان، ئاکنجی رۆژئاوای رووباری دنیستر بوون.

٩- ئالاریك (٣٧٠- ٤١٠ی ز):

سەرکردەی ویزگوتان بوو و روم-ی گرت.

١٠- ئودواکر (٤٣٥- ٤٩٣ی ز):

داگیرکەرێکی جەرمانی بوو و ئیمپراتۆرییەتی رومی رۆژئاوای گرت.

١١- ڤیزوڤیوز: کێوێکی گرکانییە لە ئیتالیا، لە کەنداوی ناپولی.

١٢- پومپی: شارێکی کۆنە لە باشووری ئیتالیا.

١٣- هیوکولانوم: شارێکی کۆنە لە باشووری ئیتالیا.

١٤- ڤاندالەکان: تیرەیەکی ئەڵمانین کە لە کۆنا لە باکووری بەلتیك ئاکنجی بوون و لە سەدەکانی چوارەم و پێنجەمی زایینیدا کەوتوونەتە پەلاماردان و تالانکردنی وڵاتانی ئەسپانیاو باکووری ئەفریقییا.

١٥- کورسیکا: دوورگەیەکی فەرەنسییە لە میدیترانە، لە باکووری ساردنیا.

١٦- پیزون: ئەجیمزادەیەکی دەوڵەمەند بوو، قەرار بوو دوای پیلانی ساڵی ٦٥ دژی نیرون، و لابردنی نیرون، جێی ئەو بگرێتەوە.

١٧- تاسیتوس (٥٥- ١٢٠ی ز):

میژوونووسێکی رومی بوو.

١٨- خانمی ئیفسوس: ئەم خانمە بێوەژنێکە کە بە جۆرێ لە مەرگی شووەکەیدا دەگرێ و دەناڵێ خەریك دەبێ لە برسانا بمرێ. ئەنجام ئەو پاسەوانەی کە پارێزگاری لە جەستەیەکی لە خاچ دراو دەکات ناچاری نان خواردن و ئاشقێنی دەکات، لە ئەنجامی غەفڵەتی پاسەوانەکە، جەستەکە دەدزرێ و بێوەژنەکە جەنازەی شووەکەی پێشکەش دەکات تا پاسەوانەکە لەو سزایەی کە لە ئەنجامی بەجێهێشتنی وەزیفەدا لە رێیەتی، رزگار بکات.

١٩- کولیسیوم:

تەلارێکی تایبەتی شانۆیە لە سەدەی یەکەمی زایینیدا لە روم بونیادنراوە.

٢٠- ئاکوینوم: گوندێکە لە ئیتالیای ناوەندی.

٢١- دومیتیان (٥١- ٩٦ی ز):

لە ساڵانی ٨١- ٩٦دا ئیمپراتۆری روم بووە.

٢٢- کومون: شارێکە لە باشووری ئیتالیا.

٢٣- بتی نیا: وڵاتێکی کۆنە لە باکووری رۆژئاوای ئاسیای بچووك، و تورکیای ئێستا.

٢٤- فلاڤین: لەقەبی سیان لە ئیمپراتۆرانی روم بووە بەم ناوانە: سپاسیانوس، تیتوس و دومیتیان

٢٥- ئاگریوکولا (٣٧- ٩٣ی ز):

سەردارێکی رومی بووە.

٢٦- تیبریوس (٤٢- ٣٧ی ز):

لە سالانی ١٤- ٣٧ ئیمپراتۆری روم بوو.

٢٧- ئیسیس: لە ئایینی میسری کۆندا: خواوەندی سروشتە، کە بە دایك و خودانی هەموو جۆرە سیحر و جادوویەکیان دەزانی.

٢٨- کوپید: لە ئایینی رومدا خواوەندی ئەڤینە.

٢٩- پسوخە: لە ئەفسانانی یۆنانیدا کیژێکی یەجگار جوانە کە کوپید حەزی لێدەکات، و واریڤاتی ڤیانی ئەم جووتە زۆر مەنشورە.

٣٠- مینوسیوس (لە دەوروبەری ٢٠٠ی ز ژیاوە).

٣١- ترتولیانوس (١٥٠- ٢٣٠ی ز).

٣٢- کیپریانوس (لە سالی ٢٥٨ی زدا مردووە):

نووسەرێکی مەسیحییە و قەشەی کارتاژ بووە.

٣٣- لاکتانتیوس (٢٦٠- ٣٤٠ی ز).

٣٤- سنت ئامبروس (٣٤٠- ٣٧٩ی ز):

ئەسقفی میلان بوو.

٣٥- مانەوییەکان: پەیڕەوانی مانی نیگارکێش و پەیامبەری ئێرانی (٢١٦- ٢٧٢ی ز) کە باوەڕی دوالیزمی زەردەشتی و باوەڕەکانی مەسیحییەتی ئاوێتەی یەکدی کردبوو. مانەوییەت پێی وایە رزگاری روح لە ماددە بەهۆی ریازەتەوە مەیسەر دەبێ.

٣٦- دوناتیاکان: پەیڕەوانی گرووپێکی مەسیحییە کە لە سالی ٣١١ی ز لە ئەنجامی ململانێ لەسەر هەلبژاردنی دوناتوس بە ئەسقوفی کارتاژ، هاتە ئاراوە، بە گوێرەی باوەڕی ئەم گرووپە پاکی پێویستە بۆ ئەنجامدانی سروودێن ئایینی لە کلێسادا.

٣٧- پلاگیوسیانەکان:

پەیڕەوانی بیدعەتێکن لە مەسیحییەتدا لە سەدەی چوارەمی زایینیدا هاتە ئاراوە و بەناوی رەبەنێکەوە بە نێوی پلاگیوس (٣٥٥-٤٢٠) ناوی دەرکردووە. پلاگوسیانەکان پێیان وایە مرۆڤ جوزی ئیختیاری لە دەست خۆیدایە و پێیان وابووە کە مندال بە پاکی دێتە دنیاوە بۆیە پێویستی بە شۆردن و تەعمید نییە.

٣٨- تیودوریك-ی گەورە:

لە ساڵانی ٤٧٤- ٥٢٦ی ز ئیمپراتۆری گوتانی رۆژهەڵاتی بووە.

٣٩- فرفوریوس (٢٣٢- ٣٠٢ی ز):

فەیلەسووفێکی نۆ ئەفلاتوونی بووە، خەڵکی سور-ی باشووری لوبنان بووە.

# بەشی چوارەم

## ئەدەبیاتی رۆژهەڵات لە سەدەکانی ناڤیندا

## ئەدەبیاتی چینی

**پێشینەیەکی مێژوویی:**

سەردەمی خانەدانی تانگ لە چین (٦٠٠- ٩٠٧ی ز) رۆژگاری سەروەت، دەستبەتاڵی، ریفۆرم، دەستبڵاوی، خۆشگوزەرانی و خەیاڵ پەروەرییە، لە پاش ئەم سەردەمە، بۆ ماوەیەکی کورت پەشێوی و ئاژاوەی سیاسی وڵات دەگرێتەوە، و لە ماوەی ساڵانی ٩٠٧ و ٩٥٠دا زنجیرەی خانەدانان پێنج کەرەت دەگۆڕێ. لەوە بە دواوە تا ساڵی ١٢٧٩ی ز سونگەکان، کە بە خەڵکانی هاندەری هونەر، زانست، و ئەدەبیات دەژمێردرێن حوکم دەگرنە دەست. لە ساڵی ١٢٧٩ی ز دوا ئیمپراتۆری سونگ لە بەرانبەر قوبلای[١] قاان-ی مەغۆلدا دەشکێت. خانەدانی مەغول-یش لە ساڵی ١٣٦٨ی ز بە دەستی خانەدانی مینگ لەناو دەچێت.

**نۆرینێکی گشتی:**

سەردەمی خانەدانی تانگ یەکێکە لە سەردەمە هەرە گرنگەکانی ئەدەبیاتی چینی، ئەم سەردەمە پڕ پیت و بەرەکەتە کە لەوەیە پرشنگدارترین رۆژگاری شیعر و شاعیری بێ، ژمارەیەکی زۆری زانایان، فەیلەسووفان، نووسەران و مێژوونووسانی لە باوەشی خۆیدا پەروەردەکرد. لە ماوەیەکی کورتی نێوان خانەدانی تانگ و خانەدانی مینگدا چەڵەنگی ئەدەبی لە رەونەق و برەو کەوت. بەڵام فینگ[٢] تائۆ لە دەوروبەری ساڵی ٩٤٥ی زدا چاپی قاڵبی[٣] داهێنا. ئیمپراتۆرانی سونگ بە گەرمی پشتیوانیان لە ئەدەبیات دەکرد، هەر بۆیە مێژوو، شیعر، ئەدەب و فەرهەنگ نووسی لە رۆژگاری واندا زۆر پێشکەوت. فەرمانڕەوایانی

مەغول-یش کە پاش ئەوان دەسەڵاتیان گرتە دەست، درێژەیان بە هاندانی داهێنان و ئەفراندنی بەرهەمی ئەدەبی دا وێڕای ئەوەی کە لە سەردەمی مەغۆڵەکاندا شیعرێکی فرە گوتراوە، بەڵام سەردەمی وان پتر سەردەمی شانۆنامە و چیرۆك بووە.

## هۆزان

هۆزانی چینی لە سەردەمی خانەدانی تانگدا پەرەی سەند و گەییە لوتکە. کۆی هۆزانی ئەم سەردەمە لە ساڵی ١٧٠٧ی ز دەگەییە سی دەفتەر کە ٤٨٫٩٠٠ کۆپلە و پارچە شیعری لەخۆ دەگرت، پاش سەرهەڵدان و پەیدا بوونی خانەدانی سونگ، شیعریش لەڕووی چۆنیەتی و چەندییەتییەوە دایە کزی و بەرەو ئاوا بوون چوو، لە سەردەمی حوکمڕانی مەغۆڵەکان، گەرچی شیعرێکی زۆر گوتراوە (هەشت دەفتەری شیعری ئەم سەردەمە کۆکراوەتەوە) بەڵام ژمارەی هۆزانێن بەرز و باڵا کەم بوو.

شیعری چینی لە سەدەکانی ناڤین دەستکرد و دەگمەنە. هەر بەیتێکی لە پێنج یان حەوت وشەی تاك سیلابی پێك دێت کە پتر لە بەر نموونەی وردی تۆنی (توند و نەرمی دەنگان) دەهۆنرێتەوە تا لەبەر نموونەی ئاسایی ڕێزمانی. هەموو شیعرەکان قافیەدارن. وێڕای ئەوەی هەندێ شیعر لە دەیان بەیت پێکهاتوون، بەڵام شیعری ئەم قۆناغە بەشێوەیەکی گشتی کورتن و بە زۆری شیعری چوار یا هەشت یان دوازدە بەیتییە.

شیعری چینی سەدەکانی ناڤین تارادەیەك بە کەمی خۆی لە ئەڤینی ڕۆمانتیکی دەدات، و پتر دەربارەی خۆشەویستی، دۆستایەتی، شەراب و لەزەتی فەردییە. لە شیعری ئەم سەردەمەدا جەخت لەسەر چڕی و پڕی و ڕەسەنایەتی کراوەتەوە.

**لیپو (٧٠٥- ٧٦٢ی ز):**

ڕەنگە گەورەترین هۆزانڤانی چینی بێ. زۆر زوو رووی کردۆتە شیعر و لە تەمەنی دە ساڵیدا شیعرێکی باشی لە وەسفی گوڵە ئەستێرەدا گوتووە. لیپو لە تەمەنی لاویدا خووی دایە رابواردن و خۆشگوزەرانی، بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا سەرنجی دەرباری بەلای خۆیدا ڕاکێشاوە. پێدەچێ بادەنۆشییەکانی کارێکی خراپیان نەکردبێتە سەر شیعرەکانی، بەڵکو بە پێچەوانەوە وەکو دەگێڕدرێتەوە ژمارەیەکی هەرە باشی شیعرەکانی بە دەم مەستییەوە نووسیوە و داناوە. ئەنجام کەوتە داوی پیلانێکەوە و لە دەربار وەدەرنرا. دەربارەی مردنەکەشی وا باوە کە کاتێ بە

مەستی لە بەلەمێکدا دەبێ خۆی دانەواند بووەوە تا وێنەی مانگ لە ئاوەکەدا بگرێتە باوەش، و کەوتبووە رووبارەکەوە و خنکابوو.

ناوبانگی لیپو لەوەدایە کە لە شیعرەکانیدا زۆر بابەت دەخاتەڕوو، و هەندێکیش بۆ زیرەکی خەیاڵی خوێنەر دەیەڵێتەوە. هەندێ لە بابەتە دڵخوازەکانی وی بریتین لە: سروشت، ژیانی دەرباری، و لەزەتی شەراب، بەناوبانگترین هۆزانی لیریکی وی بریتین لە: بادەنۆشی، بەسەر کێوانەوە لە رۆژێکی هاویندا، رزگاربوون لە خۆ، بێداربوونەوە لە مەستی لە رۆژێکی بەهاریدا، و شکۆی سپێدە.

## هان یو(هان ون- کونگ، ٧٦٨- ٨٢٤ی ز):

شاعیر، سیاسەتوان و فەیلەسووفە هان وێڕای ئەوەی کە لە دەرباردا پایەیەکی بەرزی هەبوو، بەڵام بە هۆی رەخنەگرتنی لە ئیمپراتۆر هسین تسونگ کە شەیدای ئێسقانێکی بودا بوو، لە دەزگای حکوومەت ترۆ کرا. بە هەر حاڵ هەرزوو بۆ دەربار بانگ کرایەوە و پایەکەی خۆیان وێدایەوە.

هان یو، لەواری جۆراوجۆردا شیعری گوتووە، شیعرەکانی پتر شیعری سەرگەرمی و شادن.

بەرهەمە پەخشانییەکانی هان یو لە شیعر و سروودەکانی باشترن. بابەتی نووسینەکانیشی وەکو شیعرەکانی، جۆراوجۆر و هەمە رەنگن، پڕ هەرا و هەنگامەترین نووسینی هان یو، رەخنەیەکە لە ئیمپراتۆر سەبارەت بە ئێسقانەکەی بودا کە لەڕاستیدا هێرشێکە بۆ سەر ئایینی بودا و بەرەڤانی و داکۆکییە لە رێبازی کونفوسیوس. دوو بەرهەمی پەخشانی شایستەی تری هان یو بریتین لە ماڵئاواییەك لە هاوڕێی کۆچکردووی لیوتسونگ- یوان، و گوتارێك دەربارەی ئایینی کونفوسیوس.

## پوچو-ئی (٧٧٢- ٨٤٦ی ز):

شاعیر و سیاسەتوانە، ئەویش وەکو لیپو بەهرەیەکی تایبەتی هەبووە، دەگێڕنەوە دەڵێن گوایە لە تەمەنی حەوت مانگیدا گەلێك لە نیشانەکانی ئەلفبای چینی ناسیوەتەوە.

پوچو-ئی لە ساڵی ٨٠٦ی ز پۆستێکی بچووکی دەوڵەتی پەیدا دەکات، لە ساڵی ٨١٥ی ز نەفی دەکرێ، و دوور دەخرێتەوە و لە ساڵی ٨٢٠ی ز عەفوو دەکرێ ئەوسا بە خێرایی پلەکانی تەرەقی دەبڕێ و بەرێز دەبێ بە حاکمی هانگچوو، هانان، و سەرۆکی ئەنجوومەنی جەنگ، لە ساڵی ٨٣٩دا تووشی ئیفلیجی دەبێ و دوای چەند ساڵێك کۆچی دوایی دەکات.

یەکێك لە دیارترین خەسڵەتەکانی هۆزانی پوچو-ئی زمانە سادە و رەوانەکەیەتی. دەگێڕنەوە دەڵێن کە یەکێك لە عادەتەکانی وی ئەوە بووە کە شیعرێکی نووسیوە چووە بۆ

پیرەژنێکی دێهاتی خوێندووەتەوە، و هەر وشەیەك ئەو پیرەژنە لێی حاڵی نەبووبێ گۆڕیویەتی.
پوچو-ئی زۆر لە فشەکەری و خۆپەسندی شاعیرانی زەمانی خۆی بێزار بووە.

پوچو-ئی پێی وایە کە هەموو هونەرێك دەبێ ئامانجدار بێ و پەند ئامێزبێ، بەڵام خۆی هەموو جارێك پەیڕەوی ئەم بۆچوونە ناکات. زۆربەی شیعرەکانی دەربڕینی هەستی زووگوزەر و رەنگدانەوەی کاریگەری رووداوانن.

شیعرە فێرکارییەکانی لە قاڵبی چیرۆکی ئەخلاقیدا هۆنراونەتەوە و وەکو تەنز ناوبانگیان دەرکردووە، لە حاڵێکا دوورن لە هەر نوکتە و پێکەنینۆکێك کە ئەمڕۆکە بە مەرجی سەرەکی تەنز دەژمێردرێ. هەندێ نموونەی هۆنراوە فێرکارییەکانی وی بریتین لە: ئەژدیهای رووباری رەش، ئەو پیاوەی خەونی پەرییانی دەبینی، و دوو بوورجی سوور.

جەماوەریترین شیعری پوچو-ئی شیعرە سۆزداری و کۆپلە جۆراوجۆرە وەسفییەکانی ئەون. "کیژی عودژەن" وەسفی جوانی کیژێکە کە بە گۆرانییە خەمین و جوانەکانی خۆی گوهداران دەخاتە گریان. (خەتای جاویدانی) وەسفێکی پڕ هەست و سۆزە سەبارەت بە گەیشتنە دەسەڵاتی یانگ کونەیی-فەئی، مەحبوبەی ئیمپراتۆر مینگ هۆانگ (٦٨٥- ٧٦٢ی ز)، شۆڕشی سوپاییانی ئیمپراتۆر، مەرگی یانگ و پەیامێکی خەمین کە لە جیهانی روحانەوە دەینێرێ، هەندێ شیعری جوانی دیکەی پوچو-ئی بریتین لە: "رەنگین زێڕین"، "بیرەوەری زەنگانی زێڕین" (دەربارەی کچەکەی خۆیەتی کە لە سێ ساڵیدا مرد)، "خەڵفی حەیزەران"، "تەماشای دروێنەکەر"، "باران" و "ئاوازی پیاوی تەمەڵ".

•

## مێژوو

### سوماکوانگ (١٠١٩- ١٠٨٦):

مێژوونووس و سیاسەتوانە، پاش ئەوەی دەستی لە کاری دەوڵەتی هەڵگرت، پاشماوەی تەمەنی وەقفی نووسینی (ئاوێنەی مێژوو) کرد کە لە ساڵانی ٤٥٠ی پێش. ز.وە تا ساڵی ٩٦٠ی ز لەخۆ دەگرێت.

### چوهسی (١١٣٠- ١٢٠٠ی ز):

مێژوونووس و فەیلەسووفە، بە (ئاوێنەی مێژوو)ەکەی کوانگدا چووەتەوە، کە هێشتا وەکو مێژووی باو و هەمە پەسند حەساوی بۆ دەکرێت. هەروەها بە یەکێك لە شرۆڤەکارانی گەورەی رێبازی کونفوسیوس دەژمێردرێ.

## شانۆنامە

تا سەدەی شەشەمی پێش زایین، سروود و رسوماتی ئایینی چینی بە سەما و ئاواز و ئامـاژەی دەسـت و دەم و چـاوەوە ئـەنجام دەدرا، ئەنجامـدانی ئـەم سـروود و داب و نەریتانـە پەیوەندییەکی ئەوتۆی بە پێشڤەچوونی شانۆی چینییەوە نییە، یان بەلای کەمەوە، هیچ نیشانە و بەڵگەیەکی ئەم جۆرە پەیوەندییە لەبەردەستدا نییـە. هەنـدێ بەڵگـە و سەرچـاوەی شـانۆیی تاتارەکان لە سەدەی یازدەیەمـدا، لەبەردەسـتدان کـە لەگینـە شـانۆی چـینی لـەم سەرچـاوە تاتارییەوە وەرگیرابێ. بە هەر حاڵ بـە دڵنیاییـەوە دەتـوانرێ ئـەوە بگـوترێ کـە لـە سـەدەی سیانزەیەمدا و لە سەردەمی مەغولەکاندا، شانۆ لە چیندا هەبووە.

وا دیارە چینی بازرگانی چینی لە پەیدا بوون و سەرهەڵدانی شانۆ لە چین دا- وەکو هـەمان چین لە ئینگلیـستاندا- دەوری هـەبووە. ئەوانـە شـوێنی شـانۆیان فەراهـەم دەکـرد و هەنـدێ شانۆنامانیان پیشان دەدا کە دیتنـی بـۆ هـەموو ئـەو کەسـانەی کـە دەیانویـست لـە دەریـێ هۆڵەکەدا بوەستن و تەماشا بکەن ئاسان بوو، و هەروەها خەڵکانی دەوڵەمەند و بە دەسەڵاتیش شانۆنامانی تایبەتییان ئامادە دەکرد.

شانۆنامەکان بە شێوەیەکی گشتی لەسـەر شـانۆی بـێ پـەردە و بـێ دوو بـاڵ، ئـەنجام دەدران، بەڵام جل و بەرگ زۆر داهێنەرانە و پڕخەرج بوو. جا بـۆ قەرەبووکردنـەوەی کـەم و کورتی و نوقسـتانی کەرەستە، ئەکتەرەکان ناچـار دەبـوون بەوپـەڕی وەسـتاییەوە لـە هـەر دیمەنێکدا خۆ بنوێنن.

شانۆنامەی کۆنی چـینی بونیـادێکی سـادە و پلـۆت و نەخـشەیەکی لاوازی هەیـە. هـیچ نیشانەیەکی تراجیدیای نایاب لە شانۆنامەی چینیدا بەرچاو ناکەوێ، یـانی هـیچ هەڵـچوون و داچوون و پالاوتەکارییەکی دەروونی لەخۆ نـەگرتووە، شـانۆنامەی سـەدەی نـاڤینی چـینی لـە جیاتی ریزبەندی بە شێوازی تەقلیدی رۆژئاوایی، واتە کۆمیدیا و تراجیدیا و شانۆی مێـژوویی، بەسـەر دوو دەسـتەی سـوپایی و کۆمەڵایەتیـدا دابـەش دەکـرێ. دەسـتەی یەکـەم، رووداوو کەسایەتییە مێژووییەکان وێنە دەگرێ، و پتر دیمەنانی جەنگ و زبری و توندی فیزیکی پیـشان دەدات. دراما "کۆمەڵایەتی" وێنەیەکی مەردمی ئاسـایی، بـە تایبـەتی ژیـانی خانـەوادەیی نیشاندەدات. ئەم شـانۆنامەیە عادەتـەن پێکەنیناوییـە و کـاتێ لەسـەر شـانۆ ئـەنجام دەدرێ ئاوێتەی قسە راستەوخۆکانی ئەکتەرەکان (کە بە زۆری ناڕەوانن) دەبێ.

زۆربەی شانۆنامە چینییەکانی سەدەکانی ناڤین نووسەرەکانیان دیار نین، رەنگە بەناوبانگترین شانۆنامەنووسێك کە ناوی زانراوە وانگ شی - فۆ بێ، کە لە سەدەی سیانزەیەمدا دەژیا و سیانزە شانۆنامەی لە پاش بەجێماوە، یەکێك لەوانە، چیرۆکی کلاوی فەرەنگی رۆژئاواییە، کە سەربوردی زانایەکی لاو دەگێڕێتەوە کە خانمێك لەگەڵ کیژەکەیدا لە چنگی چەتە و رێگران رزگار دەکات و وەکو پاداشت قەول و بەڵێنی زەوجین لەگەڵ کیژەکەدا وەردەگرێ، کاتێ دایکەکە لەوەعدو بەڵێنەکەی ژێوان دەبێتەوە، خزمەتکاری کیژەکە بە زرینگی و فێڵ، کۆتاییەکی خۆش بە چیرۆك و سەربهووردەکە دەبەخشێت.

## رۆمان

سەرەتای رۆمانی چینی وەکو سەرەتای شانۆنامەی چینی نادیار و ئالۆزە، هەر چەندە چینییەکان زۆر لە پێش هێرشی مەغۆلدا ئاشنایەتییان دەگەڵ چیرۆکدا هەبووە، بەڵام پێدەچێت رۆمان بە مانای واقیعی رۆمان لە سەرەتاکانی سەدەی سیانزەیەمەوە لە ئاسیای ناوەندییەوە پەڕیبێتەوە بۆ چین و لەو وڵاتەدا رەواجی پەیدا کردبێ، و لە زەرفی سێ سەد ساڵدا گەیووەتە لوتکەی پێشکەوتنی خۆی.

دەکرێ رۆمانی چینی سەدەکانی ناڤین بە گوێرەی بابەت و نێوەرۆك بەم شێوەیە خانەبەندی بکرێ:

١- رۆمانانی داگیرکاری و پیلانگێڕی و دەسیسەکاری.

٢- رۆمانانی ئەڤین و فریوکاری.

٣- رۆمانانی خورافاتی.

٤- رۆمانانی رێگری و یاخیگەرێتی.

بەناوبانگترین رۆمانێن ئەم سەردەمە دوو رۆمانە:

((چیرۆکی سێ پاشایی [٤])) (دەوروبەری ١٢٥٠ی ز):

چیرۆکێکی مێژووییە و دراوەتە پاڵ لوکوان چونگ [٥]، ئەم چیرۆکە دەربارەی شەڕەکانی سەدەی سێیەمی زایینییە کە پڕە لە دیمەنی خوێنرشتن و شەرحی کار و کردەوەی دلاوەری. ئەم چیرۆکە بە شێوازێکی سادە و شاد نووسراوە.

"هەواڵی سەفەرێك بۆ ڕۆژئاوا" (دەوروبەری ١٣٢٥ی ز):

نووسەرەکەی دیار نییە. لەوە دەچێت راپۆری سەفەری هسوئن تسانگ"[٦] بێ بۆ هیندوستان کە بەمەبەستی کۆکردنەوەی کتێبان، پەیکەران، و یادگارانی بوودایی ئەنجامی دەدات. بەڵام لەراستیدا زۆربەی ئەم راپۆرە یان سەفەرنامەیە بە هیچ جۆرێ پەیوەندی بە سەفەرەکەی هسوئن تسانگ-ەوە نییە. بەڵکو پڕە لە چیرۆکی خۆش و شاد کە زۆریان باسی ڕووداوانی سەیر و موعجیزە ئاسا دەکەن.

# زێدەر و پەراوێز:

١- قوبلای قائان (١٢١٢- ١٢٩٤ی ز):

دامەزرێنەری خانەدانی مەغۆلە لە چین.

٢- فینگ تانۆ (٨٨٢- ٩٥٤ی ز):

وەزیری حەوت ئیمپراتۆری چینی کە زۆربەیان لە خانەدانی پێنج قۆڵی چینی ناوەندی بوون.

٣- چاپی قاڵبی (Block Printing):

لەم جۆرە چاپەدا بابەتەکان لەسەر تەختە هەڵدەکۆڵدران و دەخرانە سەر کاغەز.

٤- سێ پاشایی: ئەمە ناوی قۆناغێکە لە مێژووی چین لە ساڵی ٢٢٠ تا ساڵی ٢٦٥ی ز دەگرێتەوە، پاش نەمانی خانەدانی هان، لەم قۆناغەدا چین کرابوو بە سێ مەملەکەت.

٥- لوکوان- چونگ (دەوروبەری ١٤٠٠ی ز):

چیرۆکنووسێکی چینییە.

٦- هسوئن تسانگ (٦٠٠- ٦٦٤ی ز):

بودایی چینییە، وا باوە کە لە سەفەرەکەیدا بۆ هیند ٦٧٥ کتێب-ی پیرۆزی بودایی و سەد و پەنجا یادگاری دیکەی بودایی لەگەڵ خۆدا بۆ چین بردووەتەوە.

# بەشی پێنجەم

## ئەدەبیاتی رۆژئاوا لە سەدەکانی ناڤیندا

## ئەدەبیاتی جەرمەنی

**پێشینەیەکی مێژوویی:**

تیرە جەرمانییەکان لقێکن لەماڵباتی قەومی هیند و ئەوروپایی. ئەم ماڵباتە لە بنەڕەتدا خەڵکی کەنارەکانی رووباری ڤیستۆل یان ئاسیای ناوەندییە، جا هەر لەم تیرە جۆراوجۆرە هیند و ئەوروپاییانە، دەستەیەك بۆ هیند، تاقمێك بۆ ئاسیای بچووك، و جەماعەتێك بۆ ئەوروپا کۆچ دەکەن. جا لقی جەرمەنی بەشێکە لەو جەماعەتەی کە بەرەو ئەوروپا کۆچیان کرد، کە لە دەڤەری باکوور و ناوەندی کیشوەری ئەوروپادا ئاکنجی بوون. ئەم تیرانە تا سەرەتاکانی سەدەی سێیەمی پێش زایین لە دەڤەرێکدا دەگیرسێنەوە کە لە رۆژهەڵاتەوە رووباری ڤیستول، لە باشوورەوە ماین، لە رۆژئاواوە ویزەر، و لە باکوورەوە دەریاکانی باکوور و بەلتیك دەوری دەدەن، پاشان سنوورەکانی خۆیان بەرین دەکەن و جگە لە رۆژهەڵات لە هەموو ناوچەکانی دیدا بڵاودەبنەوە و ئاکنجی دەبن.

تیرە جەرمەنییەکان تا سەدەی یەکەمی زایینی لەڕووی زمانەوە سێ بەش بوون:

١- جەرمەنی رۆژهەڵاتی، یاگوتیك.

٢- جەرمەنی رۆژئاوایی.

٣- جەرمەنی باکووری، یا ئەسکەندیناڤیایی.

جەرمەنی رۆژهەڵاتی لە دەوروبەری سەدەی شەشەمدا بەعەمەلی زمانێکی مردوو بووە.

جەرمەنی رۆژئاوایی دەبێ بە دوو بەشەوە:

١- ئەڵمانی باڵا، کە شێوە زاری ئەڵمانیانی ناوەندی و باشووری، و سەرچاوەی ئەڵمانی تازە بووە.

٢- ئەڵمانی ژێری، کە دیالێکتی ئەڵمانیانی باکووری، و سەرچاوەی ئینگلیزی، فەرەنسی و هۆڵەندی بووە، گرووپی جەرمەنی باکووری نەرویجی، دانیمارکی، سویدی و ئایسلەندی لەخۆ گرتووە.

جەرمانیانی کۆن، قەومێکی دڕ و جەنگاوەر و شەڕکەر بوون، کە خەسڵەتی سەرەکیان توند و تیژی، دڕی و بێباکی عەشایەری بووە. ئایینی سەرەتایان پەرستنی چەند خوایەك بووە، واتە فرەخوایی لە نێوانیاندا باو بووە، ئەمەشیان بەپێی دەسەڵات و ئازایەتی خوداکان هەڵبژاردووە نەك بەپێی پرنسیپە ئەخلاقییەکانی خۆیان. گەلێك لە سروودە ئایینییەکان و سونەت و خورافاتە باوەکانیان لە دوای رەواج و برەوی مەسیحییەت -یش (دەوروبەری ٤٠٠ی ز) هەر رەواجی هەبووە.

لە پاش رووخانی ئیمپراتۆرییەتی رومی رۆژئاوایی، ئوستروگوتەکان، کە گرنگترین تیرەی جەرمەنی بوون، بەهیمەتی تیودوریك"١"-ی گەورە، ئیمپراتۆرییەتێکی بەهێز بەڵام عەمر کورت، دادەمەزرێنن، تیرە جەرمەنییەکانی دیکە، واتە واندالەکان، ڤیزگوتەکان و فرانکەکان، هەر هەموویان بایەخی رامیاری و لەشکری خۆیان دەبێ، بەڵام تەنیا لە سەردەمی حوکمڕانی شارلمانی"٢"دا هەوڵێکی سەرکەتووانە بۆ یەکخستنی تیرە و تایفەکان و دروستکردنی یەکێتییەکی میللی و نەتەوەیی ئەنجام دەدرێ. ئیدی لەپاش مردنی شارلمانی هەندێ ئاژاوە و ناکۆکی و ناتەبایی بەرپا بوو و ئەوسا سەردەمی ساکسون-ەکان (٩١٩- ١٠٢٤ی ز) دەست پێدەکات-و فەرمانڕەوایانی ساکسونی هەوڵێکی زۆر دەدەن تا ئەڵمان وەکو یەك قەوم و نەتەوە یەك بگرن، لەم سەردەمەدا ئەڵمان پەیوەندییەکی بتەوی دەگەڵ شارستانییەتی رومیدا دەبێ. ئیمپراتۆرانی فرانکونیا (١٠٢٤- ١١٢٥ی ز) بە جۆرێ لەگەڵ کڵێسا و دەوڵەمەنداندا دەکەونە کێشمانەکێش و ململانێ کە ناتوانن کۆمەکێکی ئەوتۆ بە پێشکەوتن و پەرەسەندنی سیاسی و شارستانی میللەت بکەن. ئیدی خانەدانی هوهنشتاوفن (١١٣٨- ١٢٥٤) لە واری پێشڤەبردنی هوشیاری نەتەوەییدا رۆڵێکی گرنگتر لە خانەدانانی پێش خۆیان دەبینن، و رەوتی چالاکییە هزرییەکانیش لەبەر رۆشنایی پشتیوانی حکومەت و لە ئەنجامی پەرەسەندنی پەیوەندی دەگەڵ ئیتاڵیادا خێراتر دەبێ. لە ئەڵمانیادا، وەکو هەندێ وڵاتی تری ئەوروپایی، شەڕەکانی سەڵیبی سەدەکانی دوانزەیەم و سیانزەیەم دەورێکی گرنگیان لە یەکخستنی جەنگاوەران و سوارچاکاندا وەکو چینێکی

کۆمەڵایەتی بینی، هەروەها دەوری زۆریان لە چەسپاندنی دڵسۆزی و وەفاداری ئایینی و برەودانی زیاتر بە رۆشنبیری و شارستانییەتی بێگانەاندا بینی.

لە وڵاتانی ئەسکەندیناڤیدا، جەخت کردنەوە لەسەر دەسەڵاتی پاشایەتی و پێشڤەچوونی سیاسی زۆر کەمترە لە دەڤەرەکانی دەوروبەری راینو وێزەر. نەرویج و بە تایبەتی ئیسلەند (کە بە هەوڵ و کۆششی کۆمەڵێك لە دەستەبژێرانی نەرویجی کە سوورن لەسەر ئەوەی مل بۆ حکوومەتی ملهوڕی شا هارولد فرهر نەدەن یەك دەگرێت) لە دەڤەرەکانی دیکە پتر لە پێناوی پاراستنی بیری کۆنی جەرمەنی دا دەخەبتن، ژیانی ئازاد دەبێ بە هیوا و ئاواتی ئەجیمزادەکانی باکووری. ئەو ئەجیمزادە و خانەدانانەی کە کرێنشینی و سەرانەدان و خزمەتکاری هیچ پاشایەك قەبوول ناکەن.

## نۆڕینێکی گشتی:

لە ئەدەبیاتی جەرمەنی رۆژهەڵاتی (گوتیك) تەنیا یەك نووسین ماوەتەوە کە تەرجەمەیەکی کتێبی موقەدەسە و دراوەتە پاڵ (ئولفیلاس).

ئەدەبیاتی جەرمەنی رۆژئاوا زۆر دەوڵەمەندترە. زۆر بەیتی قارەمانی و سوارچاکی جۆراوجۆر بە ئەڵمانی باڵای کۆن (٧٥٠- ١١٠٠) دێتە نووسین و دانان. گەلێك لەم بەرهەمانە لە سەردەمی شارلمانی کۆ دەکرێنەوە، بەڵام ئەوانەی پاش شارلمانی دێنە سەر حوکم ئەم بەرهەمانە بە کفرئامێز دەزانن و لە نێوی دەبەن. تەنیا یەك پارچە لە بەیتی (سروودی هیلدبران) لە چەپۆکی رۆژگار دەخەلەسێ، لەو سێ سەد ساڵەی پاش مەرگی شارلمانی (٨١٤ی ز) بە دواوە زۆربەی ئەدەبیاتی جەرمەنی بە لاتینی دەنووسرێ. مەلحەمەکان، هۆزانێن لیریکی، وەعز و ئامۆژگارییان، هۆزانێن فێرکاری، مێژووان، ژیاننامان، و بەرهەمێن شانۆیی هەر هەمووی بە ئەڵمانی باڵای ناوەڕاست (١١٠٠- ١٥٠٠ی ز) دادەنرێن. ئەم سەردەمە پڕ بەرەکەتە ئەدەبییە دەکرێ بەسێ قۆناغەوە:

١- قۆناغی سەرەتا (١١٠٠- ١١٨٠ی ز).

٢- قۆناغی کلاسیك (١١٨٠- ١٢٥٠ی ز).

٣- قۆناغی ئاوا بوون (١٢٥٠- ١٥٠٠ی ز).

زمانی جەرمەنی باکووری (نۆرس، ئەسکاندیناڤی) بە زبری و رەقی بەناوبانگە. لەم زمانەدا رۆشنبیری و ئەفسانانی کۆنی جەرمەنی بە باشترین شێوە پارێزراوە، ئەدەبیاتی ئەسکاندیناڤی دەکرێ بەسێ گرووپی گرنگەوە:

١- هۆزانێن مەلحەمی ئیدا (لە دەوروبەری ساڵانی ٩٠٠- ١١٠٠ی ز دانراون) کە کۆمەڵە هۆزانێکن دەربارەی ئەفسانان، قارەمانان و ئەڤین.

٢- قەسیدە و هۆزانێن سکالدی یان دەرباری کە لە دەوروبەری ساڵانی ١١٠٠- ١٢٠٠ی ز دانراون) کە ژیان و کرداری شاهان دەگێڕێتەوە.

٣- ساگاکان (لە دەوروبەری ساڵانی ١١٠٠- ١٤٠٠ی ز دانراون) کە کۆمەڵە گێڕانەوەیەکن بە پەخشان و هەوێنەکەیان کەس یان خانەدانێکی مێژوویی یا ئەفسانەییە.

## جەرمەنی رۆژهەڵات (گوتیک)

### ولفیلا (ئولفیلاس)، (٣١١- ٣٨٣ی ز):

تاقە نووسخەی دەستنووسی ئەدەبیاتی گوتیک، تەرجەمەیەکی کتێبی موقەدەسە کە دراوەتە پاڵ ولفیلا-ی گەورە قەشەی مەسیحی ئاکنجی دەڤەری باکووری کەنداوی دانوب. ئەم ئەسقوفە بەداهێنانی ئەلفبای گوتیک، کە لە لێکدانی پیتێن یۆنانی و رومی و رونی "٣" پێکهاتووە بەنێویانگە، لەم وەرگێڕانەدا یەجگار کارامە و باڵادەستە و لە دەقە یونانییەکەوە وەری گێڕاوە -ئەم کارەی کارێکی تەقلیدی کوێرانە نییە، بەڵکو بەرەنجامی هزرین و قووڵبوونەوەیە، بەوپەڕی توانا و لێهاتووییەوە زمانی بێشەنشینانی خۆی لە پاڵ ئەو بلیمەتی و بەداوەتەی لەبەرهەمەکەدا هەیە نیشان دەدات- و دەقەکەی لە قەفەزی زمانێکی نارەوان و دەستکرد نەناوە. تەنیا چەند پەرەگرافێکی سەردەمی کۆن (تەورات) و رێژەیەکی زۆر لە سەردەمی تازە (ئنجیل) لەوێدا تۆمارکراوە.

## جەرمەنی رۆژئاوا (ئەڵمانی)

### ئەڵمانی باڵای کۆن(*)

تەنیا دوو بەرهەمی ئەڵمانی باڵای کۆن شایستەی باسن، جگە لەم دوو بەرهەمە، هەندێ بەشی کورتی دوو مەلحەمە، و چەند سروودێکی قارەمانی و سوارچاکی-ش لەبەر دەستدان کە سروودی لودویك بایەخدارترینیانە، ئەم سرووده چیرۆکی سەرکەوتنی فرانکەکان بەسەر نورمانەکاندا لە ساڵی ٨٨١ی ز دەگێڕێتەوە. لەم قۆناغەدا چەند پارچە شیعر و پەخشانێکیش بەلاتینی دانراون.

(سروودی هیلدبران) (لە دەورووبەری ساڵی ٩٠٠ی ز دانراوە و ئەو نوسخەیەی لەبەردەستدایە بۆ دەورووبەری ساڵی ٨٢٠ی ز دەگەڕێتەوە) لەم بەیتە مەلحەمییە، کە دانەرەکەی دیار نییە، تەنیا شەست و هەشت بەیت ماوەتەوە. هەڵبەتە لەم بەشەدا هونەرە رەوانبێژییەکانی وەکو جوانکاری و خۆشخوانی و دووبارەکردنەوەی هزر بەبێ دووبارەکردنەوەی وشە بە جوانی بەکارهاتووە.

ئەم قەسیدەیە بەشێك لە چیرۆکی هیلدبران-ی پاپی پیری دەگێڕێتەوە کە پاش سی ساڵ ژیان لەگەڵ هونەکاندا "٤"، بۆ شەڕ لە بەرانبەر زێدگەی خۆیدا دەگەڕێتەوە. لە شەڕێکی تەن بە تەندا لەگەڵ هادوبران-ی کوڕیدا رووبەڕوو دەبێتەوە، بەڵام کوڕەکە باوەڕ ناکات کە هیلدبران بابی وییە و مکوڕ دەبێ لەسەر دوئیل، ئەم بەشە بە سەرەتای شەڕی تەن بە تەن کۆتایی دێت، و ئەوەی لێوە هەڵدەهێنجرێ کە کوڕە بە دەستی پیرەباب دەکوژرێ.

### کتێبی ئینجیلان (دەورووبەری ٨٦٨ی ز):

ئەم بەرهەمە هی ئوتفرید "٥"، کە رەبەنێکی خەڵکی ویسنبورگ-ە، ئەم مەلحەمە مەسیحییە پازدە هەزار بەیتییە، ژیانی حەزرەتی عیسا دەگێڕێتەوە. بە شێوەیەکی گشتی ئەم کتێبە بە یەکەمین بەیتی جەرمەنی دادەنرێ کە لە جیاتی بەکارهێنانی خۆشخوانی سوودی لە قافیەی کوتایی وەرگرتووە. پێشەکی بەیتەکە ستایشێکی جوانی فرانکەکانە. شێوازی شیعرەکانیش ئەدیبانە و فێرکارییە.

## ئەڵمانی باڵای ناوەڕاست: قۆناغی سەرەتا (١١٠٠- ١١٨٠ی ز)

### وەرگێڕانەکانی روحانییەکان لەفەرەنسی و لاتینییەوە:

وەرگێڕانە هەرە گرنگەکانی ئەم وارە بریتیین لە: سروودی ئەسکەندەر (١١٣٠ی ز). ئەم کارە لامپرخت "٦" ئەنجامی داوەو دەربارەی سەرکەوتنە گەورەکانی ئەسکەندەری گەورەیە. سروودی رولان (١١٣٠ی ز) ئەم بەرهەمە کونرادی "٧" قەشەی شاری راتیسبون، بە شێوەیەکی ئازادانە لە دەقی فەرەنسی (گۆرانی رولان)ەوە وەریگێڕاوە، سەربهووردی ئیمپراتۆران، ئەم بەیتە نزیکەی هەژدە هەزار بەیت دەبێ، کۆنراد وەریگێڕاوە و باسی مێژووی جیهان دەکات.

### مەلحەمەکانی مینسترل:

ئەمانە هەندێ هۆزانی دنیایین و شاعیرانی گەڕۆك بە زمانی سادە و شێوازی جەماوەری گوتوویانە. گرنگترین کار و بەرهەمی ئەم وارە بریتین لە: رۆترشا (١١٤٠ی ز) کەبەسەرهاتی رفاندنی ئەفسانە ئاسای کیژی شای قوستەنتەنیە لەلایەن شای لمباردی "٨" یەوە دەگێڕێتەوە.

دۆك ئەرنست (١١٨٠ی ز)، چەند کۆپلەیەك لە بەیتێك کە باسی شۆڕشی لودولف دژی بابی خۆی، واتە ئوتو-ی یەکەم"٩" دەگێڕێتەوە، و چیرۆکی ڕێوی (١١٩٠ی ز)، ئەم بەرهەمە هی هاینریش دێگلیسنر"١٠"ە، و ئەمە یەکەمین بەیتە کەلە زمانی ئەڵمانیدا بە زمانی گیانلەبەرانەوە هۆنراوەتەوە.

**مینی سونگ:**

ئەمە بریتییە لەو هۆزانە ئاشقانانەی کە لە گۆرانی فولکلۆری نەمسای کۆن و لە غەزەلیاتی شاعیرانی پروڤینسال"١١"-ەوە هەڵێنجراون.

ئەم غەزەلانە کورت و سادەن، و لەڕووی پێکهاتەی چیرۆکڤانی و کاریگەری زەینییەوە ڕەوان و بێگرێیە و لە هەر جۆرە دەستکردییەك دوورن، کۆنترین شاعیرانی ئەم مەیدانە بریتین لە: کورنبرك-ی نەمساوی (١١٦٠ی ز)و دیتمارفون"١٢" ئایست.

## ئەڵمانی باڵای ناوەڕاست: قۆناغی کلاسیك (١١٨٠- ١٢٥٠ی ز)

زۆربەی نووسەرانی قۆناغی کلاسیکی ئەڵمانی باڵای ناوەڕاست سوارچاکان و ڕوحانییەکان بوون، بەڵام وێڕای ئەمەش هەندێ بەرهەم و نووسین بە دەستی جەماوەری خەڵك و شایەرانی گەڕۆك و ئاشقان هاتۆتە دانان. ئەدەبیاتی ئەم قۆناغە لە شەش خانەدا دەگیرسێتەوە:

١- هۆزانێن مەلحەمی (داستانی).
٢- هۆزانێن لیریکی.
٣- هۆزانێن فێرکاری.
٤- ئامۆژگاری و وەعزی ڕوحانییەکان.
٥- نووسین و بەرهەمی مێژوویی.
٦- نووسین و بەرهەمی حقوقی (مافخوازی).

**هۆزانێن مەلحەمی:**

پرشنگدارترین فەسڵی مێژووی ئەدەبیاتی ئەڵمانی سەدەکانی ناوەڕاست بۆ بەیتە مەلحەمییەکانی قۆناغی کلاسیك تۆمارکراوە. ئەم بەیتانە (منظومە) دوو جۆرن: دەرباری و جەماوەری.

**مەلحەمەمێن دەرباری:**

ئەم جۆرە مەلحەمەیە کە بۆ ئەنجیمزادە و دەوڵەمەندان دەگوترا، زمانێکی سەنگین و ڕازاوە و نایابی هەیە، و پڕە لە وشە و پەیڤی فەڕەنسی. مەلحەمەی دەرباری کە سەربەهووردی دلاوەری

و سوارچاکی دەگێڕێتەوە، وەسفی دوور و درێژ و تێروتەسەلی ئەسپ و چەك و پێشبڕکێی شمشێربازی و ئەوشتانە دەکات. نێوەرۆکی ئەم مەلحەمانە کە عادەتەن لەسەرچاوەی دەرەکییەوە وەردەگیرێ، هەمان نێوەڕۆکی سیانەی رۆمانانی سەدەکانی ناوەڕاستە: نێوەڕۆکی فەڕەنسی، کە چیرۆکانی شارلمانی و دەربارەکەی وی دەگێڕێتەوە، نێوەڕۆکی بەریتانیا، هەندێ سەربهوورد و چیرۆکە دەربارەی ئارتورشا "١٢"، و مێز و دلاوەرانی ئەو، و گەڕان بە دووی جامی پیرۆزدا (کە عیسا لە دوا شامدا لەو جامەی خواردووەتەوە)، و نێوەڕۆکی روم، کە بڕێ چیرۆکی یونانی، رومیانی، و رۆژهەلاتیانی کۆنە.

بەناوبانگترین شاعیرانی مەلحەمەی دەرباری بریتین لەم چوارە:

## ١- هاینریش ڤن فلدکە (١١٧٠- ١٢٠٠ی ز):

یەکەمین شاعیری ئەلمانی مەلحەمەی دەرباریییە. ئەنیئیت-ەکەی کە لە قالبی بەیتی قافیەدارا دانراوە، وەرگێڕانی ئانئید-ی ڤیرجیل-ە بە زمانی سەدەکانی ناڤین، ئەم بەرهەمە پڕە لە وەسفی ڤیانی رۆمانتیکی و جەنگی سوارچاکی و دلاوەری. بونیادی پلۆت و نەخشەی چیرۆکەکە لوجیکی، و وێنەگرتنی کەسایەتییەکان پەسند و بەجێیە.

## ٢- هارتمان ڤون ئەوئە (١٢١٥ی ز):

بە یەکێك لە مامۆستایانی گەورەی مەلحەمەی دەرباری کلاسیك دەژمێردرێ، لێرەدا دەکرێ ئاماژە بە دوو چیرۆکە شیعری وی بە ناوانی ئیرك و ئیوین بکرێ. چیرۆکی ئیرك لە رۆمانسێکی کرتین دوتروا-وە وەرگیراوە، و خۆی لە خۆیدا برەودانە بە ئەلقەی بریتانیایی لە ئەلمانیا.

ئەم بەیتە هەر چەندە تارادەیەك تاقەتبەرە، بەلام ناوەڕۆکێکی رەسەنی وەکو وەفاداری ژنی لەخۆ گرتووە، ئیوین-یش هەر لە بەرهەمێکی تری کرتین-ەوە هەلێنجراوە. ئەم بەیتە ئەگەرچی لە ئیرك هونەرییانە تر هۆنراوەتەوە، بەلام لە ئاستێکی ئەخلاقی نزمتردایە، نێوەڕۆکەکەی بریتییە لە ئەوینی رۆمانتیکی ئیوین دەرهەق بە ماشوقەکەی خۆی و ئەو ناخۆشییانەی کە لە پێناوی ئەودا تەحەمولی دەکات. (هنری هەژار) ناوەڕۆکەکەی ئەلمانییە، و رەنگە ئەمە باشترین شیعری هارتمان بێ. لەم شیعرەدا باسی ئەوە دەکرێ کە چۆن سوارچاکێکی گول بوو، یەکەمجار قەبوولّ ناکات بە بەهای لەخۆبردوویی ئارەزوومەندانەی کیژێك چاك ببێتەوە، و پاشان قاییل دەبێ، و سەرەنجام دووبارە قەبووڵ ناکات.

بەهەر حاڵ ئەم خەسلەتی قەبووڵ کردن و قەبووڵ نەکردنەی وی دەبێتە مایەی ئەوەی کە خوا شیفای بۆ بنێرێ، و لە دوا ئەنجامدا کیژەکە بخوازێ و ببن بە هاوسەر.

**٣- ولفرام فون ئیشنباخ (١١٧٠- ١٢٢٠ی ز):**

قوڵترین و ڕەسەنترین شاعیری مەیدانی هۆزانی سوارچاکی و دلاوەرییە کە قارەمانەکانی خودانی مرۆڤانی ترین سیمان لە جۆری خۆیاندا.

پارزیفال-ەکەی (لەبەر ڕۆشنایی پرسیڤال-ەکەی کرتین دوتروا دانراوە) کارێکی فەلسەفی درێژ و (٢٥ هەزار بەیتە) قوڵە دەربارەی ڕزگاری مرۆڤ لە ڕێگەی باوەڕ هێنانەوە بە خوا (هەڵبەتە پاش بڕینی قۆناغێك لە فرمێسك و ڕوندکان). پارزیفال، کە لە داب و نەریتی دلاوەری و سوارچاکییەوە دوورە، توانای بەسەر ئازادسازی ئانفورتاس-ی شای سەرزەمینی جامی مقەدەسدا ناشکێ. پاش پێنج ساڵ لە دوودڵی و خەمباری، لە ڕێگەی دووبارە ئیمان هێنانەوە ئانفورتاس ڕزگار دەبێ و تەخت و تاج وەردەگرێتەوە. ولفرام لە میانی ئەم بەیتەوە هەندێ لایەن و گۆشەی سەربهووردی دنیایی سێرگوین "١٤"، لە بەرانبەر گەڕان و جوست و جۆی مەعنەوی پارزیفالدا دەگێڕێتەوە.

ولفرام جگە لە بەیتی پارزیفال، چیرۆکێکی ئاشقانەی دیکەشی بە نێوی ((تیتورل)) دەربارەی (شیوناتولاندرو زیگونە) هونیوەتەوە کە تەنیا چەند پارچەیەکی گەییوەتە دەستی ئێمە. هەروەها چیرۆکی (ویلهام ڤن نورانزە)شی هەیە کە چیرۆکی (تەواو نەکراوە) شەڕی ویلهام دژی موسوڵمانان لە کۆتایی سەدەی هەشتەمدا دەگێڕێتەوە.

**٤- گوتفرید ڤون شتراسبۆرگ (١٢١٠ ی ز):**

بەیتێکی (ناتەواو)ی بەنێوی تریسترام (تریستان) هۆنیوەتەوە و ئیلهامی ئەم بەرهەمەی لە بەیتێکی تۆماس-ی شاعیری خەڵکی بریتانی "١٥" وەرگرتووە، کە لەوێدا ئەڤینی پڕ هەوراز و نشێوی تریستان و ئیزوت دەگێڕێتەوە. گوتفرید لە شیکردنەوەی باری دەروونی کاراکتەری چیرۆکەکە و وێنەگرتنی هەست و سۆز و گوداز، و هۆنینەوەکاریدا وەستا و مامۆستایەکی باڵادەست و پڕدەسەڵاتە.

**مەلحەمەێن جەماوەری:**

هاوکات لەگەڵ ڕەواج و برەوی مەلحەمەێن دەرباریدا، مەلحەمەێن جەماوەریش، کە پێشتر تایبەت بە سوارچاکی و دلاوەری بوو، لە نەمسا و ستیریا "١٦" دا گەشەی کرد. ئەم جۆرە مەلحەمانە، بە پێچەوانەی مەلحەمەێن دەرباریەوە، بابەت و نموونەی دەرەکی و بێگانەی نەدەکرد بە سەرمەشقی خۆی، واتە لە سەرچاوەی دەرەکی و بێگانەوە هەڵنەدەهێنجرا، سەرچاوەی ئەم مەلحەمانە یا شیعری ئەفسانەیی کۆن یان چیرۆکە شیعری میللی و جەماوەری

بوو، کە سیمای کەسایەتییانی مێژوویی وەکو ئاتیلا "١٧"، ئیرما ناریك "١٨"، و تیودوریــك "١٩"-ی سەر بە ماڵباتی ئامال "٢٠" وێنە دەگرێت. مەلحەمەی میللی یان جەماوەری لەڕووی شێواز و گوزارشت و دەربڕینەوە لە مەلحەمــەی دەربــاری ســادەترە. جگــە لــە قەســیدەی نیبلــونگن و گودرون، گرنگترین مەلحەمەی میللی ئەمانەن: مەرگی ئالبهارت، لاوریــن، ســروودی ئیکــە، و باخی گوڵە باخ- کە هەر هەمووی لە دەوری تەوەری کەسایەتی تیودوریك دەسوڕێتەوە.

**"سروودی نیبلونگن" (١٢٠٠ی ز):**

گەورەترن بەرهەمی ئەدەبی ئەڵمانییە لە سەدەکانی ناڤیندا، ئەم بەیتە لە نزیکەی دە هەزار بەیت پێکهاتووە و بریتییە لە کۆمەڵە بەندێك کە بە (بەندەکانی نیبلونگن) بەناوبانگە، و هــەر بەندێکی لە چوار بەیتی هاوقافیە پێك هاتووە، و هەر بەیتێك بە هەڵوەستەیەك دەبــێ بــە دوو بەشەوە. بەشی یەکەم و دووەم لە هەر بەیتێك سێ وێستگەی هەیە، دوا بــەیتی هــەر بەنــدێك نەبێ کە نیوە بەیتی دووەمی چوار وێستگەی هەیە.

**سروودی نیبلونگن:**

قەسیدەیەکی زۆر وەستایانەیە، بەڵام لەوە دەچێ کە شەقڵی چــیرۆکی پــەرییان، ئەفــسانە و مێژوو کەم دابێژێك لە هاوناهەنگی و هاوسازی بەیتەکە کەم بکەنــەوە. مەلحەمــە (داســتان)ی نیبلونگن ئاوێتەیەکە لە ئەفسانانی باو دەربارەی پاشایانی بورگونــدی، گــوت و هــون، لەگــەڵ چیرۆکێکی نەتەوەییدا دەربارەی خەڵکی ئەژدیهاکوژ- چیرۆکێك کە لەوەیە لە ئەڵمانیادا بەرلــە مەسیحییەت هەبووبێ. ئامانجێن مەسیحی و داب و نەریتی سوارچاکی و دلاوەری ســەدەکانی ناڤین دەبێ بەسەرباری شارستانییەتێك کــە لــە بنەڕەتــدا کفرئــامێز و زبــر و رەقــە. هەڵبەتــە بۆچوونێك هەیە کە گوایە شاعیر (لەوەیــە سوارچــاکێکی ئەمــساوی بــێ). هــاتووە کۆمــەڵێك بابەتی جۆراوجۆری کۆ کردۆتەوە و مــەلحەمەی نیبلونگن-ی لێ دروســت کــردووە، وەکــو چــۆن هۆمەر (ئیلیاد)ی بەو شێوەیە دروست کردووە.

هەوێن و چیرۆکی بنەڕەتی بەیتەکە لەسەر پایە و بناغەی رکابەری دامــەزراوە. بەرلــە دەســت پێکردنی چیرۆکی ئەم مەلحەمەیە، زیگفریــد-ی شــازادەی هۆلەنــدی، ئەژدیهایــەك دەکوژێــت و پاشەکەوتی زێڕی نیبلونگەکان "٢١" داگــیر دەکــات. لــە ســەرەتای چــیرۆکەکەدا، ئــەو دوو جــاران یارمەتی گونتەر-ی پاشای بروگوندی دەدات - جارێکیــان لــە شــەڕدا و جــاری دووەم لــە کــاتی خوازبێنی برونهیلد-ی خوشکی شای ئیــسلەندەدا بــۆ گونتــەر. زیگفریــدش لەگــەڵ کریمهیلــد-ی خوشکی گونتەردا زەماوەند دەکات. دوای چەند ساڵێك کریمهیلــد و برنهیلــد لەســەر خانــەدانی و

رەسەنایەتی ماڵباتی هاوسەرەکانیان لێیان دەبێ بەشەڕ و قەرقەشە، هاگن-ی خزمەتکاری گونتەر، بە خیانەت زیگفرید دەکوژێت، لەسەر ئەوەی کە گوایە سووکایەتی بە خانمەکەی، واتە بە خێزانەکەی گونتەر کردووە. کریمهیلد پاش ساڵانێك لە خەمباری و تاسەی تۆڵەسەندنەوەی کوشتنی مێردەکەی، شوو بە ئاتیلا-ی سەرکردەی هونەکان دەکات. کریمهیلد دوای سیازدە ساڵ، گونتەر و هاگن و دارودەستەکەیان بۆ دیتنی دەرباری ئاتیلا دەعوەت دەکات. ئەوانیش گەوجانە دەعوەتەکەی قەبووڵ دەکەن. کریمهیلد ئاگری دوو زمانی و قەرقەشەی نێوان بورگوندییەکان و هونەکان خۆش دەکات و لە ئەنجامدا کوشتارێکی گەورە لە هەردوولا دەکرێ. لە ئەنجامدا هون-ەکان سەر دەکەون، گونتەر دەکوژرێ، و کریمهیلد بە دەستی خۆی لە ملی هاگن دەدات. ئەو بە خۆیشی بە دەستی هیلدبران-ی گەورە خزمەتکاری تیودوریك دێتە کوشتن.

سروودی نیبلونگن کەم و کوڕی زۆری تێدایە، پڕە لە درۆ و ناکۆکی و ناهاوسەنگی. شاعیر نەیتوانیوە پەردەیەك لە مەسیحییەتی سەردەمی دلاوەری و سوارچاکی بدات بەسەر بیروبۆچوون و رووداوانی کوفرئامێزی ئەو رۆژگارەدا کە ئەو و شاعیرانی دیکەی سەدەکانی ناڤین زۆریان حەز دەکرد ئەو کارە بکەن. بەیتەکەی تەژی زۆروێژی و دووبارە کردنەوەیە، پڕە لە وەسفی تاقەتبەری جلوبەرگ، چەك و تەدارەك و بۆنە و ئاهەنگان، شاعیر لە هونەری عەروزدا لاوازەو کەم و زۆر کۆ لە بەکارهێنانی دەستەواژەی کلێشەیی و قافیەی کۆن و سوا و ناکاتەوە.

لایەنی پۆزەتیڤی ئەم بەیتە هەموو خەوش و کەم و کوڕییەکانی دادەپۆشێت. ئێمە دەتوانین لەم بەرهەمەدا زۆر بە روونی قەومی کۆنی توتونی، بە هەموو خودافاتێکیانەوە، بە سۆز و گودازیانەوە، بەشەهامەتیانەوە، بەسەرسەختی و دڕی و خۆپەسندییانەوە بدینین. دەبین بە هاوڕێی گیانی بە گیانی راستگۆیی و وەفادارییان کە زەمینەی ئەخلاقی بەیتەکە پێك دێنێ. بەڵام گەورەترین لایەنی پۆزەتیڤی ئەم بەیتە وێنە گرتنی بەرجەستەی چوار کاراکتەرە سەرەکییەکەی داستانەکە (مەلحەمەکە)یە: کریمهیلد، خاوەندی تۆڵە ئەستێنی کە تیفەرۆیی کەرب و کینی وای لێدەکات کەیفی بە کوشتاری هاونەژادان و تەنانەت برایەکانی خۆشی بێت و حاڵی لێ بێ، زیگفرید، قوربانییەکی بێ تاوانی ئاگری رقی ژنێکی حەسوودە، رودبگر، دلاوەر و سوارچاکێکی بێ گوناهە کە کەتووەتە نێوان بەرداشی پایەندی ئەخلاقی خانەخوێیی و ئەرکی پێشکارییەوە (گەورە خزمەتکار)، بەڵام جوانترین بەرجەستەکردنی هونەری لەم کارەدا وێنەگرتنی هاگن-ە، کە قارەمانێکی خوێڕیلەی شەیتان سیفەتە و وەفاداری دەرهەق بە ئاغاکەی و خانمی ئاغاکەی وای لێدەکات بە ئانقەست و بە زانستە دەست بداتە کوشتن و لە ئەنجامدا بە خۆیشی بکوژرێ.

زۆر بیروبۆچوونی جیاواز سەبارەت بە هەڵسەنگاندنی سروودی نیبلونگن هاتوونەتە دەربڕین: فردریك"٢٢"-ی گەورە پێی وایە کە ئەم بەیتە پولێکی قەڵب ناهێنێ، کەچی کورتس"٢٣" و کارلایل بە گرنگترین یادگاری خەڵکی سەدەکانی ناڤین، و بە جوانترین بەرهەمی هونەری ئەڵمانی کۆنی دەزانن. لودویگ"٢٤" یور بە ئیلیاد-ی ئەڵمانەکانی دەزانێ هەڵبەتە هەندێ دید و بۆچوونی میانڕەوتر هەن و بە کارێکی هونەری مامناوەندی دەزانن. بێگومان ئەم بەرهەمە نەك هەر لە روانگەی مێژوویی و نەژادناسییەوە پڕ بایەخە، بەڵکو لەڕووی پەیوەندییە قوڵە مرۆڤانییەکان و کاریگەرییە هونەرییەکەشییەوە شایانی ستایشە. هبل"٢٥" و واکنەر"٢٦" لە هەموو کەس پتر کاریگەری ئەم داستانەیان (مەلحەمە) پێوە دیارە.

**گودرون (١٢٢٥ی ز):**

دانەری ئەم بەیتە پێوارە، رەنگە لە دانانی سوارچاکێکی نەمساوی بێ. سەرچاوەکانی ئەم بەیتە بریتین لە ئەفسانانی فریزلەندی"٢٧"، فرانکی"٢٨" و ئەفسانانی کۆنی ئەڵمانی، و سەرمەشقەکەشی سروودی نیبلونگن-ە. ئەم بەیتە لە سێ بەش پێکهاتووە، کە هەر بەشێکیان چیرۆکی رفاندنی کیژێکی خشکۆك و جوان دەگێڕێتەوە. لە بەشی یەکەمدا ئەوە دەگێڕدرێتەوە کە چۆن هاگن-ی بچووك (لەوە ناچێ هیچ پەیوەندییەکی بە هاگن-ە شەڕخوازەکەی سروودی نیبلونگن-ەوە، هەبێ) بە دەستی شێردالێك"٢٩" دەفڕێنرێ، لە وڵات و شوێنێکی سەیردا گەورە دەبێ، لەگەڵ هیلدە-ی کیژی پاشادا، لەوێندەر هەڵدێ، لەگەڵ کیژی شادا زەماوەند دەکات و دەبێ بە پاشای ئیرلەندا. بەشی دووەم چیرۆکی کیژەکەی هاگن، هیلدە دەگێڕێتەوە. ئەم کیژە، کە ئەویش هیلدە-ی ناوە، بە ئارەزووی خۆی لەگەڵ پێشکارانی هیتیل-ی شای فریزلاندا، بۆ ئەو وڵاتە دەچێ تابێ بە هاوسەری پاشا، هاگن دەکەوێتە تاقیب و سۆراخی کیژێ بەڵام لە شەڕدا دەشکێ، بەشی سێیەم، کە گرنگترین بەشی بەیتەکەیە چیرۆکی گودرون-ی کیژی هیتیل و هیلدە دەگێڕێتەوە. دەبێ بە مارەبڕ و دەزگیرانی هیرویگ-ی شازادەی زیلاند"٣٠"، بەڵام لەلایەن هیرموت-ی شازادەی نورماندییەوە رەدوو دەخرێ، گودرون سیازدە ساڵان بە یەخسیری لە نورماندی دەمێنێتەوە، و بە درێژایی ئەو ماوەیە لەلایەن گیرلینت-ی مەلیکەی نورماندییەوە دەچەوسێنرێتەوە. لە ئەنجامدا گودرون بەدەستی هیرویگ-ی دەزگیرانی رزگار دەکرێ، گیرلینت دەکوژرێ، هیرموت عەفو دەکرێ، و هیرویگ و گودرون بە خۆشی و شادی زەماوەند دەکەن.

بەیتی گودرون، هەرچەندە لەڕووی گەورەییەوە ناگاتە ئاستی سروودی نیبلونگن، بەڵام لەڕووی پاراستنی تایبەتمەندییە ناوچەییەکانی بەشی باکووری رۆژئاوای ئەورووپا -کەنارە هۆڤی

و خەڵکە سەرکێشەکەی-وە بایەخێکی یەجگار گەورەی هەیە، وەسفی خودی گودرون وەکو کیژە شایەکی سەلار و سەنگین، و بە سەبر و وەفادار، بە نموونەیەکی هەرە جوان و هەرە واقیعی دنیای قەسیدە و بەیت و هەڵبەستان دەژمێردرێ.

## هۆزانێن لیریکی

<u>مینی زانگ:</u>

هەر چەند ئەم وشەیە لە باری زمانەوانییەوە مانای ئاوازی ئاشقانە دەگەیەنێ، بەڵام بەمانا بەرینەکەی هەموو هۆزانی لیریکی بە زمانی ئەڵمانی باڵای ناوەڕاست دەگرێتەوە، هەڵبەتە هۆزانی لیریکی تەنیا ئەشق و ئەڤین نییە، بەڵکو سروشت، ئایین، نیشتیمانپەروەری، مافناسی، و زۆر بابەتی دیکەش دەگرێتەوە. هەڵبەتە باوترین مەیدان و بابەتی هۆزانی لیریکی ئەڤینی رۆمانتیکییە، بە گوێرەی دابەکانی شیعری ئاشقانە و غەزەلی دەرباری لە سەدەکانی ناڤینندا، ژن مایەی ئەوپەڕی ڕێز و حورمەتە، شایستەی پەرستنە، شایانی هەر خزمەت و ستایشێکە.

مینی زانگەکان لە ژێر کاریگەری شاعیرانی فەڕەنسیدا بوون. شاعیرانی باڤاریایی و نەمساوی زۆر لە ژێر کاریگەری دەرکیدا نەبوونە و سەرچاوەی ئیلهامی شیعرییان زیاتر گۆرانی و ئاوازی فولکلۆریی ناوچەیی بووە.

شیعری غەزەلی، پتر لە (١٦٠) شاعیر لەبەر دەستدایە.

<u>والتیرڤون دیرڤوگلوید (١١٧٠- ١٢٣٠ی ز):</u>

گەورەترین شاعیری مینی زانگە، بەتواناترین و هونەرمەندترین شاعیری غەزەلسەرای ئەڵمانی پێش گوتەیە، و جەماوەری ترین شاعیری ئەو وڵاتەیە لە سەدەکانی ناڤینندا. رەنگە والتیر لە تیرول "٣١" هاتبێتە دنیاوە، زۆر نزیکە لە دلاوەران و سوارچاکان بووبێ، پاش چەندین ساڵ خزمەتی ئەشراف و سەرگەردانی لەسەرانسەری ئەورووپای ناوەندیدا (١١٩٤- ١٢١٣ی ز) بوو بە هەوادار و لایەنگری فردریکی "٣٢" دووەم-ی قەڕاڵی تازەی خانەدانی هوهنشتافین، کە پاشان مولکێکی بچووك بە شاعیر دەبەخشێ.

شۆرەت و ناوبانگی شیعری والتیر لەوەدایە کە شیعرەکانی زۆر حەساسن و تێکەڵەیەکن لە سنعەتکاری و سادەیی، شاعیر جگە لە شیعرێن غەزەل و سروشت، کۆمەڵێك شیعریشی دەربارەی نیشتیمانپەروەری، ئاوازی رەقس و سەما، نوکتە و پەند هۆنیوەتەوە، و هەروەها

هەندێ شیعریشی داناوە بۆ ئامۆژگاری رابەرانی سیاسی و ئایینی، هەڵبەتە رەخنەش لە پاپاکان دەگرێت.

ئەمەش سەرناوی هەندێکە لە بەناوبانگترین شیعرێن لیریکی شاعیر: (ئەڤین شادمانی دوو دڵە)، (بەهاران و ژن)، (ئاوازی مانگی پێنج)، (مەحبوبی هەقناس)، (عەدالەتی نابەرانبەری)، (زستان)، (یەکسانی لەبەر بارەگای خوادا)، (رۆژگارێکی نالەبارە)، (ئەڵمانی بێ شا)، و (ماڵاوا لە جیهان).

نایدهارت ڤون رونیتال (١٢٤٥ی ز):

لە جەنگاوەران و سوارچاکانی باڤاریایە، باشترین شیعری وی ئەو شیعرانەن کە لە گۆرانییە میللییەکانەوە وەریگرتوون و ژیانی دێهاتییان بەرجەستە دەکەن. ئەم شیعرانە خۆشئاواز و جەماوەرین.

ئولریخ ڤون لیختنشتاین (١٢٦٠ی ز):

شیعری ئولریخ بە خۆشئاهەنگی و رەوانی بەناوبانگە، بە تایبەتی (لە ئوتوبیوگرافی)یەکەی خۆیدا، و لە (خزمەتی خانمێك)دا کە وێنەیەکی پڕ بایەخ و زیندووی ژیان و داب و نەریتی ناو دەرباری ئەڵمان لە سەدەی سیانزەیەمدا بەرجەستە دەکات.

## ئەڵمانی باڵای ناڤین: ئاوا بوون

## (١٢٥٠- ١٥٠٠ی ز):

لە سەدەی سیازدەیەمدا، داب و نەریتی سوارچاکی و دلاوەری و جەنگاوەری و دەسەڵاتی دەربار بەرەو ئاوابوون چوو. ئیمپراتۆران و نەجیمزادان کە زیاتر لە خەمی سەلامەتی و شکۆی شەخسیدا بوون، دەستیان لە سوارچاکانی رێگر هەڵگرت، رەونەق و رەواجی دانوستان و بازرگانی بوو بە مایەی سەرهەڵدان و پەیدا بوونی جۆرە فەرهەنگ و شارستانییەتێکی تازە لە شاراندا، بەڵام ناسکی و پاکی ژیاری کۆن لە بیر و یادان دەرچوو و غیرەتی نەتەوەیی و میللەتپەروەری گەییە نزمترین ئاست.

هەڵبەتە کاریگەری ئەم بارودۆخە بەسەر ئەدەبیاتەوە نێگەتیف بوو. شێوەزاری جۆراوجۆر جێی زمانی کۆك و رەسەن و یەکگرتووی گرتەوە، کێش و وەزنی شیعری دووچاری پەشێوی و پاشاگەردانی بوو، حیکایەت و نەقڵ جێی بە مەلحەمە لەق کرد، شیعری لیریکی مەیدانی

بۆ مایسترسانگ خاڵی کرد. بەڵام بەم حاڵەشەوە هێشتا بەرهەمی ئەدەبی شایستە دەهاتە نووسین و دانان. نەقڵ و حیکایەتی شیعری بە زمانی گیانلەبەرانەوە، بەیتی تەوسئامێز، واریفاتنامەی شیعری، گۆرانی میللی، پەند و ئامۆژگاری، چیرۆکی پەخشان و کتێبانی مێژوو دەنووسران، بەڵام دیارترین فۆرمی ئەدەبی لەم قۆناغەدا بریتی بوو لە: هۆزانێن فێرکاری، مایسترسانگ و شانۆنامە.

زباستیان برانت (١٤٥٧- ١٥٢١ی ز):

شاعیر و قانون زانە. گرنگترین بەرهەمی بریتییە لە: کەشتی گەوجان کە لە ساڵی ١٤٩٤دا نووسراوە، شاعیر بە توندی رەخنە لە کرێتی و گەوجێتییەکانی زەمانی خۆی دەگرێ.

مایستر زانگ:

ئەمانە کۆمەڵێك شاعیری فشەکەری خۆبەزلزانی شلەشاری و کەمبەهرە و داهێنان بوون، هەوڵیان دەدا لاسایی مینی زانگەکان بکەنەوە و شیعرەکانیان بە شێوەیەکی گشتی مەزهەبی، فێرکاری، مێژوویی، یان رەمزییە. ئەمانە چەند ئەنجوومەنێکیان دامەزراند کە وەکو ئەسنافی بازرگانی بەڕێوە دەبران. هەڵبەتە یاسا و رێسایەکی توند و ورد بەسەر فۆرم و ناوەڕۆکی شیعرەکانیانەوە زاڵ و حوکمڕان بوو. تەنیا کاتێ شاعیر بە (مامۆستا) و مایسترسینگەر دەزانرا کە ئاوازێکی تازە —هەم وەکو شیعر و هەم وەکو ئاهەنگی شیعرەکە- دابێنێ. ئەم شاعیرانە جەختیان لەسەر وردەکارییانی هونەری دەکرد، بەڵام بە دەگمەن داهێنانێکی گەورەیان ئەنجام دەدا، وا باوە کە کۆنترین ئەنجوومەن یان نووسینگە لە ماینس لە ساڵی ١٢٠٠دا بەهیمەتی هاینریش ڤوئمایسن"٣٣" دامەزراوە.

بەناوبانگترین شاعیری ئەم جۆرە شیعرە هانس زاکس (١٤٩٤- ١٥٧٦ی ز)ی خەڵکی نورنبرگە.

شانۆنامە:

لە ئەڵمانیاشدا، وەکو یونان، فەرەنسا و ئینگلستان، شانۆ لە سروودە مەزهەبی و ئایینییەکانەوە هەڵێنجراوە، هەندێ لەو کارە شانۆییانەی کە لە رێورەسم و بۆنەکانی کافراندا نمایش دەکران، بەهۆی زەبر و زەنگی کڵێساوە فەوتان و لەنێوچوون، بەڵام لە سەدەی پانزەیەمدا هەندێ شانۆنامەی ئایینی و مەزهەبی (دەربارەی هەندێ لایەنی ژیانی مەسیح و روحانیانی مەسیحی)، یا نواندنی چیرۆکەکانی ناو کتێبی موقەدەس بەرە بەرە رەواجی پەیدا کرد. ئەم شانۆنامانە لەسەرەتاوە لە کاتێ جەژنی کریسمەس، جەژنی پاك، و باقی جەژن و بۆنە پیرۆزەکانی دیکە، وەکو بەشێك لە سروودی ئایینی لە کڵێسادا، ئەنجام دەدرا و لە ئەنجامدا

سنووری کلێسای بەزاند و گەییە ناو کۆچە و کۆلانان، ئیدی ئەم کارە شانۆییە سەرەتاییانە بابەتی کۆمیدی و نەمەزهەبی-شی لەخۆگرت، و زمانی ئەڵمانیش جێگەی زمانی لاتینی گرتەوە. شانۆنامانی ژان و سوێ (پرسەی لە خاچدانی مەسیح) لە هەموو ئەم شانۆنامانە پتر برەوی سەند و باوی پەیدا کرد و هەندێکیان (بەتایبەتی ئەو شانۆنامەیەی کە لە ئوبرامرگاو"٣٤" ئەنجام دەدرا، تا ئەمڕۆش هاتووە.

شانۆنامەی نەمەزهەبی لە سەدەی پانزەیەمدا پەیدا بوو. شانۆکارانی لاو لە جەژنی شروڤیتایدا "٣٥" ماڵ بەماڵ دەگەڕان و دیمەنی کۆمیدی ژیانی ڕۆژانەیان نمایش دەکرد. هەندێ لەو شانۆنامانە نوکتەئامێز و زۆریان-یش تەواو عامیانە و میللی بوون. نورنبرگ بەناوبانگترین شوێنی دەرهێنان و ئەنجامدانی ئەم شانۆنامانە بوو، و هەر لەو شارەدا هانس ڕاکس پەرەی بەم کار و بەرهەمانە داوە.

## جەرمەنی باکوور (نورس، ئەسکاندیناڤیایی)

لە ماوەی نێوان سالآنی ٩٠٠-١٣٠٠ی ز کۆمەڵێك بەرهەمی ئەدەبی پڕبەها لە سەرزەمینی ئەسکاندیناڤی هاتە ئاراوە. زۆربەی ئەم بەرهەمانە لە زومرەی ئیدا Eddas، شیعری سکالدی، و ساگا- Sagasدان.

ئیدا:

((ئیدای هۆنراوە)) ئەمە کۆمەڵێك شیعری ئەفسانەیی، حیکایەت ئامێز، شیعری فێرکاری، و کۆپلەی چڕ و کورت دەگرێتەوە. ئەم شیعرانە لە ماوەی نێوان سالآنی ٨٠٠- ١١٥٠ی ز دانراون و کۆنترین دەستنووسی ئەم شیعرانە دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی سیانزەیەم و گوایە زایموند زیگفوسون"٣٦" کۆی کردونەتەوە. ناوەڕۆکی ئیداکان بریتییە لە:

١- پێشبینییەکانی سیبل"٣٧"، دەربارەی خولقان و فەوتان و نەمانی جیهان.

٢- دوو شیعری خەمین دەربارەی بەسەرهاتەکانی هیلگی، قارەمانییەتی گەورە.

٣- کۆی شەش شیعری جۆراوجۆری ئەفسانەیی: خوازبێنی فری"٣٨"، خۆهەلکێشان و ڕەجەزخوانی تور"٣٩" و ئودن"٤٠"، گەرانی تور بۆ دۆزینەوەی شوێنی شەیتان، جوێنفرۆشی لوکی"٤١" سروودی تریم"٤٢"، و سروودی ویلاند"٤٣".

٤- دوو کۆمەڵە کۆپلەی جۆراوجۆری ڕەمزی و فێرکاری.

٥- کۆی بیست هۆنراوەی سوارچاکی و دلاوەری کە چیرۆکی ڤۆلسونگ-ەکان دەگێڕێتەوە.

هەموو ئەم هۆنراوانە لەسەر بنەمای سەنعەتی تەوزیع (دووبارە کردنەوەی فۆنیمەکان) هۆنراونەتەوە. زۆربەی هۆنراوەکان کورت، راستەوخۆ، ریتم خێرا و بێرونگەرایانە و سەنگینن.

((ئیدای پەخشان)) (ئیدای سنووری):

ئەم بەرهەمە بە هۆنراوە و بە پەخشانە، دەدرێتە پاڵ سنووری ستورلوسون"٤٤" . بۆ رێنوێنی شاعیران دانراوە و بریتییە لە پێنج بەشی گرنگ:

١- کورتەی ئەفسانانی نورس.

٢- گوتاری براگی"٤٥"، نامەیەکە سەبارەت بە گوزارشت و هونەری شیعر.

٣- واژەنامەی زاراوە و هاوواتایانی شیعری.

٤- پێڕستی وەزن و قاڵبانی شیعری، بە نموونەوە.

٥- پاشکۆیەك دەربارەی مێژووی شیعر و شاعیری و نامەیەکی کورت سەبارەت بە دەستووری زمان و واتاناسی و روونبێژی.

هۆزانێن سکالدی:

سکالدەکان (شاعیرانی کۆنی ئەسکاندیناڤیایی) یا شاعیرانی گەڕۆك"٤٦" یا شاعیرانی دەربار بوون.

سەردەمی زێڕینی وان سەدەی هەشتەم تا سەدەی چواردەیەمە. لە حاڵێکا کە (ئیدای شیعری) زیاتر سەروساختی دەگەڵ ئەفسانان و سەربهووردی خواوەندان و پاڵەواناندایە، هۆزانی سکالدی لە شاهان و رابەرانی کۆن و زەمانی خۆیەوە ئیلهام وەردەگرێ.

زمانی ئەم شیعرانە یەجگار بتەو و سفت و رەوان و رازاوەیە، پڕە لە دەستەواژە و زاراوەی دوور و درێژی ئیستیعاری، چۆنیەتی هۆندنەوەی رێکخستنی پیتەکان یەجگار لێهاتووانە و ئاڵۆزە.

هەڵبەتە بایەخی هۆزانی سکاڵدی لە شیعری ئیدایی کەمترە، بەڵام لە بەیتە سکالدییەکاندا زۆر بابەتی مێژوویی تۆمارکراوە و پارێزراوە.

ساگەکان (Sagas):

لە ساڵانی نێوان ١١٠٠- ١٥٠٠ ژمارەیەکی زۆری حیکایەتی پەخشان یان ساگان – Sagas لە نەرویج و ئیسلەند دێتە نوسین. ئەم حیکایەتانە کە زۆربەیان ئەفسانەیین و پڕن لە گیانی میللی و تەبیعەتی دوورگەنشینی، هەندێ بەش و لایەن بەرجەستەی مێژووی وڵاتانی ئەسکاندیناڤی و ژیانی قارەمانانی واقیعی یا ئەفسانەیی ئەو مەملەکەتانە دەگێڕنەوە.

ساگان- Sagas کورت و چڕ و پڕ و بێرونگەرا و تەقریبەن هەمیشە خەمینن. دەبێ ئەوەش بگوترێ کە لە باری تانوپۆ و چنینەوە وەستایانە بەرهەم هێنراون.

"ڤولسونگاساگا" (دەوروبەری ١١٧٠):

ئەمە وەرگێڕانی چیرۆکی ڤولسونگانە بە پەخشان، وەکو لە ئیدای شیعری-شدا هاتووە رەنگە حیکایەتی جۆراوجۆر و هەندێ گۆرانی میللی، کە ئێستا نەماون، وەکو سەرچاوە بۆ ئەم ژانرە ئەدەبییە سوودیان لێوەرگیرابێ. ئەم ساگە چیرۆکی زیگورد ڤولسونگ دەگێڕێتەوە، کە ئەم حیکایەتە، لە ئەفسانەکەی زیگفریدی مەلحەمەی نیبلونگن، کۆنترە. زیگورد (زیگفرید نیبلونگن) نەوەی ڤولسونگ-ی پاشای هونەکانە. ئەو پاش کوشتنی فافنیری ئەژدیها، و بەدەستهێنانی ئەو موستیلە جادوویی و گەنجینە زێڕەی کە فافنیر پاسداری و پاسەوانی دەکرد، بە سواری بە نێو ئاگردا رەت دەبێ و براینهیلدی ( برونهیلد نیبلونگن) سەرکردەی ڤالکیرەکان"٤٧" لە خەوی تەلیسماوی بێدار دەکاتەوە. ئەم جووتە حەز لە یەکدی دەکەن، بەلام گریمهیلد-ی هاوسەری گیبوکی-ی شای نیبلونگ، شەربەتێکی ئەفسوناوی دەدات بە زیگورد کە دوای خواردنەوەی شەربەتەکە براینهیلد لە بیر دەکات. ئەوسا زیگورد لەگەڵ گودرونی کیژی کریمهیلدا پەیمانی زەوجین دەبەستێ، و براینهیلد لەگەڵ گونار (گونتەر)ی برای گودروندا زەماوەند دەکات. براینهیلد کە ئاگری حەسوودی ئۆقرەی لێ دەبڕێ، گوتروم، کە برایەکی دیکەی گودرونە، بۆ کوشتنی زیگورد هاندەدا. گوتروم بە شمشێرەوە پەلاماری گودرون دەدا و برینداری دەکات، بەلام گودرون ئەو دەکوژێ، براینهیلد-یش خۆی دەخاتە ئەو ئاگرەوە کە بۆ سوتانی جەنازەی خۆشەویستەکەی، زیگورد ئامادە کراوە و دەمرێت، گودرون شوو بە ئاتیلا-ی رابەری هونەکان دەکات. ئاتیلا کە لە هەوڵی دۆزینەوەی زێرەکانی زیگورددایە، بەخیانەتکاری برایەکانی گودرون دەکوژێ، بەلام زێرەکان لە راین شاردراونەتەوە، گودرون ئاتیلا دەکوژێت، ئاگر لە دەربار و بارەگاکەی بەر دەدا و دەیسوتێنێ و بۆ وڵاتی یوناکرشا هەڵدێ و لەگەڵ ویدا (یوناکرشا) زەماوەند دەکات.

ڤولسونگاساگا، سەرچاوەی سەرەکی ئۆپرای موستیلەی واگنر و زیگورد ڤولسونگ-ی بەرهەمی ویلیام موریس بووە.

"هاوپەیانان" (باندامانساگا):

تاقە ساگێکە کە لە بنەڕەتدا بە مەبەستی کومیکی نووسراوە و تەنزێکی سیاسییە. ئەم چیرۆکە بەرهەمێکی سوارچاکی تەوس و توانج ئامێزە. تیمەی چیرۆکەکە بریتییە لە ئاشتبوونەوەی کورێکی ئابڕومەند دەگەڵ بابێکی دەسبادی دەسبلاودا.

ئود-ی لاو بەهۆی ناخۆشی نێوان خۆی و ئوفیگی-ی باببیەوە دەتۆرێ و ماڵ بەجێدێڵێ. ساڵانێکی دوور و درێژ بە خۆشی دەقەتێنێ، سەرەنجام گیرۆدەی دادگایەك دەبێ. هەشت پیاوی هاوپەیمان کە حەسوودی و بەغیلی بە سەروەت و سامانەکەی دەبەن، لێدەبڕێن بە هەر شێوەیەك بووە زەمینەی مەحکوم کردنی خۆش بکەن، لە دەوروبەری بڕیاردانی یەکجارەکی دادگادا، ئوفیگ، بە رێکەوت خۆی بە دادگادا دەکات و هێندە زیرەکانە دەکەوێتە موناقەشە و گەنگەشە کە ئوسپاگ-ی نەیاری ئود مەحکوم دەبێ.

هاوپەیمانان بۆ خستنی ئود دەکەونە پیلانگێڕی و دەسیسە نانەوە، لێ ئوفیگ جارەکی دی بەهانای ئود-ەوە دەچێت و کارێکی وەها دەکات کە پیلانگێڕانی خەبەر لە یەکدی بدەن. باب و کوڕ جاریکی دی ئاشت دەبنەوە و ئوسپاگ بە مەرگی موفاجات دەمرێت.

هاوپەیمانان سادگا-یەکی بەرزە، لەڕووی وردکارییەوە بێ خەوشە و لە باری بونیادەوە بتەو سفت و کۆکە، رەنگە لایەنی هەرە پۆزەتیفی ئەم کارە ئامادەکردن و پەرداخی کەسایەتییەکان بێ: لە ئودەوە بیگرە، کە هەر چەندە تاقەتبەرە بەڵام شایانی ستایشە، تا دەگاتە هاوپەیمانانی لەخۆرازی و بەدخوا و لە هەر هەموویان جوانتر و بەرجەستەتر، ئوفیگ-ی خزمەتکار و نوێنەری خوای حەنەك و کۆمیدیا، کە رەخنەگری تەنزوێژ و ئیرادگری سەردەمی سوارچاکی و دلاوەرییە.

# پەراوێز و ژێدەران:

١- تیودوریك (٤٥٤- ٥٢٦) پاشای ئوستروگوت-ەکان بوو

٢- شارلمانی (٧٤٢- ٨١٤) شای فرانك-ەکان لە ٧٦٢- ٨١٤ و ئیمپراتۆری رومی رۆژئاوای جاران لە ٨٠٠- ٨١٤).

شارلمانی لە کاتی دامەزراندنی ئیمپراتۆرییەتە مەزنەکەی خۆیدا ئەو ناوچانەی کە جاران لە ژێر رکێف و دەسەلاتی ئیمپراتۆرییەتی رومی رۆژئاواییدا بوو، خستنیە سەر ئیمپراتۆرییەتەکەی خۆی و لە سالی هەشت سەدا پاپای وەخت تاجی ئەم ئیمپراتۆرییەتەی پێ بەخشی.

٣- رونی: ناوی ئەلفبایەکە کە تیرە جەرمەنییەکان لە جۆرە خەتێکی یونانییەوە وەریان گرت.

(*) تاقە بەرهەمێکی شایستەی سەر بە ئەلمانی ژێری، بەیتی (فریارەس)ە کە نووسەرەکەی پێوارە، ئەم بەیتە لە دەوروبەری سالی ٨٣٠دا بە زمانی ساکسونی کۆن هۆنراوەتەوە، ئەم بەیتە شەش هەزار بەیتە و دەربارەی ژیانی حەزرەتی عیسایە.

٤- هون – Huns:

هونەکان نەژادێکی ئاسیایین کە لە سەدەکانی چوارەم و پێنجەمی زایینیدا لە ئەوروپادا خەریکی تالان و برۆ بوون.

٥-ئوتفرید – Otfried: (٨٠٠- ٨٧٠ی ز):

٦- لامپرخت Lamprecht (١١٢٠ی ز): شاعیرێکی کۆنی ئەلمانیا و ئەندامی کلێسا بووە.

٧- کونراد Konrad: شاعیرێکی نیوەی دووەمی سەدەی دوازدەیەمی ئەلمان و کەشیشی شاری راتیسبون بووە.

٨- لومباردی Lombards: یەکێکە لە تیرە ئەلمانی نەژادەکان کە لە سەدەی شەشەمی زایینیدا ئیتالیان فەتح کرد و لەوێندەر حکوومەتێکی پاشاییان دامەزراند.

٩- ئۆتۆ-ی یەکەم Otto 1: (٩١٢- ٩٧٣) لە سالانی ٩٣٦- ٩٧٣دا گەورە ئیمپراتۆری روم بووە.

١٠- دیرگلیستەر:

شاعیرێکی ئەڵمانی باڵای ناڤین بووە لە سەدەی دوانزەیەمی زایینیدا .

١١- پروڤینسال:

یەکێکە لە زمانە رومیاییەکان، لە زمانی لاتینییەوە هاتووە، و لە باشووری رۆژهەڵاتی فەرەنسادا برەوی سەندووە.

١٢- دیتمارڤون ئایست (٩٧٥- ١٠١٨ی ز): واریقات نووسێکی ئەڵمانی بوو.

١٣- ئارتورشا:

(سەدەی شەشەمی ز): شای ئەفسانەیی یان واقیعی بەریتانیا بوو.

١٤- سێرگوین: برازای ئارتور شا و یەکێك بوو لە جەنگاوەران و دەست و پێوەندانی وی.

١٥- بریتانی Brittany: یا برتانی یا بروتانی: دەڤەر و ویلایەتێکە لە باکووری رۆژئاوای فەرەنسا، نیمچە دوورگەیەکە لە نێوان دەریای مانش و (لە باکوور) کەنداوی بیسکی (لە باشوور).

١٦- ستیریا Styria: ویلایەتێکە لە ناوەند و باشووری رۆژهەڵاتی نەمسا.

١٧- ئاتیلا Attila: (لە ساڵی ٤٥٣ی ز مردووە) بە (بەڵای ئاسمانی) بەناوبانگە، و لە ساڵانی ٤٣٥- ٤٥٣دا پاشای هون-ەکان بووە.

١٨- ئیرمانارك (٣٥٠- ٣٧٦): شای گوت-انی رۆژهەڵاتی (ستروگوتەکان) بوو.

١٩- تیودورك (٤٥٤- ٥٢٦): بە تیودورك-ی گەورە ناسراوە، لە ساڵانی (٤٧٤- ٥٢٦ی ز)دا شای گوت-انی رۆژهەڵاتی بووە.

٢٠- ئامال Amal: ناوی ماڵباتی پاشایەتی گوتە رۆژهەڵاتییەکان بوو.

٢١- نیبلونگ-ەکان Nibelungs: نەژادێکی کورتە باڵان لە ئەفسانانی ئەڵمانیدا.

٢٢- فردریك-ی گەورە (١٧١٢- ١٧٨٦): لە ساڵانی ١٧٤٠- ١٧٨٦ی ز دا شای پروس-ەکان بوو.

٢٣- کورتس (١٨١٣- ١٨٧٣)

رۆماننووس و شاعیر و وەرگێڕێکی ئەڵمانییە،

٢٤- لودویگ بور (١٨١٦- ١٨٨٩ی ز):

ئەڵمانییە، زانای خواناسییە.

٢٥- هیبیل (١٨١٣- ١٨٦٥):

شاعیر و شانۆنامەنووسێکی ئەڵمانییە.

٢٦- واگنەر (١٨١٣- ١٨٨٣):

شاعیر و ئاوازدانەرێکی ئەڵمانییە.

٢٧-فریزلەند:

بەشێکە لە هۆڵەندا.

٢٨- فرانك:

قەومێکی ئەڵمانی نەژادن کە لە سەدەی شەشەمی زایینیدا هاتوونەتە ویلایەتی روم و هوڵەندایان داگیر کردووە و لە کەنارەکانی رایندا ئاکنجی بوونە.

٢٩- Griffin= شێرداڵ، لە ئەفسانانی کۆن و سەدەکانی ناڤیندا بە گیانلەبەرێك دەگوترا کە نیوەی شێر و نیوەکەی دیکەی هەڵۆ بووە.

٣٠- زیلاند: ویلایەتی باشووری رۆژئاوای هۆڵەندایە.

٣١- تیرول- Tyrol: ناوچەیەکە لە باکووری ئالپ لە نەمسا.

٣٢- فردریکی دووەم (١١٩٤- ١٢٥٠): قەراڵی ئیمپراتۆرییەتی موقەدەسی روم (١٢٢٠- ١٢٥٠)و شای ئەڵمانی (١٢١٢- ١٢٢٠).

٣٣- هاینریش ڤون مایسن (لە ساڵی ١٣١٨دا مردووە):

شاعیرێکی لیریکی ئەڵمانی بووە.

٣٤- ئوبرامرگاو: گوندێکە لە باڤاریای باڵا، پیشاندانی شانۆنامانی ئازارەکانی مەسیح لێرەدا بەهۆی گەرپێدەکانەوە مایەی سەرنجە.

٣٥- شرۆڤیتاید: رەسمێکە کە سێ رۆژ بەرلە چوارشەممەی تۆبە ئەنجام دەدرێ.

٣٦- زایموند زیگفوسون (١٠٥٦- ١١٣٣):

زانایەکی ئیسلەندییە کۆمەڵێك بەرهەمی دەربارەی مێژووی ئیسلەندا داناوە.

٣٧- سیبل: لە ئایینی فریگیا، داپیرەی خواوەندانە.

٣٨- فری Frey: لە ئایینی جەرمەنیدا، خواوەندی خۆر و باران و فەڕ و بەرەکەتە.

٣٩- تور: لە ئایینی جەرمەنیدا، خواوەندی هەورەتریشقە و دەسەڵات و جەنگە.

٤٠- ئودین: لە ئایینی جەرمەنیدا، خواوەندی مەزنە، و سەرۆکی یازدە خواوەندی دیکەیە.

٤١- لوکی: لە ئایینی جەرمەنیدا، رەمزی شەڕ و خوای قەرقەشەیە.

٤٢- تریم Thrym: لە ئایینی جەرمەنیدا، پاشای بێشەی دێوانە.

٤٣- ویلاند: شارێکی کەنداییە، لە باشووری رۆژاوای تاڤگەی نیاگارایە.

٤٤- سنووری ستورلوسون (١١٧٨- ١٢٤١ی ز):

مێژوونووسێکی ئیسلەندییە، و بە گەورەترین ئەدیبی نورس لە سەدەکانی ناڤیندا دەژمێردرێ.

٤٥- براگی: لە ئەفسانانی نورسدا، خواوەندی شیعر و ئەدەبە.

٤٦- شاعیرانی گەڕۆك Minstrets: بەو شاعیرانە دەگوترێ کە لە سەدەکانی ناڤیندا بە دنیادا دەگەڕان و بەرلە برەوی هونەری چاپ، بەیتی زارەکیان (وەکو بەیتی شانسون دوژست) بۆ خەڵکی دەگوت و هەندێکیان لە دەرباری شاهانەوە نزیك بوونە.

٤٧- ڤالکیر-ەکان Valkyries: لە ئەفسانانی ئەسکاندیناڤیدا دەکەنە کیژانی جەنگاوەری ئودین کە بەسەر مەیدانی شەڕدا دەگەڕێن و لە نێو کوژراوەکاندا شایستەترین قارەمان لە جیاتی و تۆڵەی ئودیندا دەبەن.

# ئەدەبیاتی سیلتی "١"

<u>پێشینەیەکی مێژوویی:</u>

لقێکە لە قەومە هیند و ئەوروپاییەکان کە ئێستا بە سیلتییەکان یا کیلتییەکان ناسراون وا دیارە تا سەرەتاکانی سەدەی حەوتەمی پێش زایین لە ئەوروپای رۆژئاواییدا (فەرەنسا و لەگینە ئەسپانیا) ئاکنجی بووبن. دەستەیەك لە سیلتییەکان کە دانیشتووی سەرزەمینی گول بوون، تێکەڵاوی رومی و جەرمەنییەکان دەبن. گەیلی "٢" یەکان، کە وادیارە لە سەردەم و رۆژگارێکدا ناوچەیەکی بەرینی ئینگلیستانی ئەمڕۆیان داگیر کردبێ، لە دەوروبەری ساڵی ٤٠٠ی پێش زایینەوە بە هۆی شەپۆلێکی تازەی سیلتی و بریتونی "٣" یەوە بەرەو رۆژئاوا و باکوور راودەنرێن. پاشان گەیلییەکان لە ئیرلەندا و سکۆتلاندە ئاکنجی دەبن و بریتونەکان نیوەی باشووری جەزیرە داگیر دەکەن، لە نیوەی سەدەی پێنجەمی زایینیدا کە ئانگلەکان "٤"، ساکسونەکان "٥" و جوتەکان "٦". هێرش دەبەنە سەر بریتانیا، تاقمێك لە بریتونەکان بۆ ویلز و کورنسوال، و ئەوانی دی بۆ برتانی لە ئەوروپا کۆچ دەکەن.

گەیلییەکان لە سەرەتای قۆناغی مەسیحییەتەوە تا سەدەی شەشەم لە ئیرلەندەدا ئارام و ئاسودە دەبن. پاشان بۆ ماوەی سێ سەد ساڵ، هەوەڵجار لەلایەن نەرویجییەکانەوە و پاشان لەلایەن دانیمارکییەکانەوە بەر هێرش و پەلاماری بەردەوام دەکەون، تا لە ساڵی ١٠١٤دا، ئیرلەندییەکان بە سەرکردایەتی براین "٧" برۆ، کۆتایی بە دەسەڵاتی میللەتانی ئەسکاندیناڤی دێنن، ماوەیەك لەوە دوا هنری "٨" دووەمی پاشای ئینگلیستان پەلاماری ئیرلەندا دەدات و ئەم وڵاتە دەخاتە ژێر فەرمانڕەوایی و رکێفی خۆیەوە (١١٧٢).

رۆشنبیریی سیلتییەکان بە تایبەتی ئیرلەندییەکان، تاوەکو پێش هاتنی مەسیحییەت رۆشنبیریی میللەتانی هۆڤی و سەرەتایی بوو. ئەم قەومە پیاوانی دیلیان دەکوشت، ژنانیان بە

کۆیلەیەتی دەبرد، لەزەتیان لە نیشاندان و نمایشی سەری برداوی دوژمنان دەبینی، تەنانەت مێشکی دوژمنانی خۆیان لە شێوەی تۆپدا دەردێنا و وەکو دەستکەوت-ی جەنگی بۆ یادگار هەڵیاندەگرت، پیشەی سەرەکی سیلتییە کۆنەکان ئاژەڵداری، کشتوکاڵ و جەنگ بوو.

سیلتییەکان، خواوەندانێکی زۆریان، کەنیشانەی هێزە سەرەکییەکانی سروشت و تەبیعەت بوون، دەپەرست، و باوەڕیان بە جادوو و خورافات و دۆنای دۆنی گیانان و قوربانی کردنی مرۆڤان هەبوو. هەڵبەتە سەرکردایەتی و ئەنجامدانی سروودێن پەرستنی خودایانی سیلتییەکان بە درونیدەکان"[٩]" بوو، درونیدەکان ئەو کاهین و روحانیانە بوون کە نەك هەر دەسەلاتی مەزهەبی و ئایینییان هەبوو، بەڵکو لە مەیدانی کاروباری ناوخۆ، رامیاری و سوپاییشدا نەخش و رۆڵێکی گرنگیان دەستۆ دبوو. جگە لەمە خەریکی فالگرتنەوە و سیحربازیش دەبوون. مەسیحییەت، لە سەدەکانی سێیەم و چوارەمدا گەییە دەڤەرەکە، و لە میانەی سەدەی پێنجەمدا بە هیمەتی قەشە پاتریك"[١٠]" بوو بە ئایینی فەرمی، پاش ماوەیەکی کورت ئیرلەند بوو بە مەڵبەندی زانست و رۆشنبیریی مەسیحییەت و رەواجدەرانی ئایینی لەوێندەرەوە بۆ فەرەنسا و ئینگلتەرا چوون.

دیارە هەر کورتە مێژوویەکی سیلت ئەگەر سوکە باسێکی دەربارەی سروشت و تەبیعەتی زاتی خودی قەومی سیلت تێیدا نەبێ، ناتەواوە.

ئەم قەومە وێڕای شەقلی هۆڤیگەری سەرەتاییان، هێشتا زۆر لە جەرمەنەکانی سەدەکانی ناڤین کەمتر گرژ و مۆن، خەمین، و مالیخولیایی بوون سیلتییەکان خەڵکانێکی رۆمانسی بوون لەخۆرازی، بزێو، ناسك، خەیاڵپەروەر، خورافی و هەستیار بوون. ئەوانیش وەکو جەرمەنییەکان، حەزیان لە دادپەروەری و ئازایەتی دەکرد، هەروەها شەیدای سەیران و رابواردن و ئەفین و رەمز و رازی جوانییەکانی سروشت-یش بوون.

هیچ سەیر نییە کە سیلتییەکان هەرگیز لە ئەوروپادا نەگەییوونەتە دەسەلاتێکی سیاسی گەورە، پێشکەوتنی وان لە مەیدانانی دیکەدا بووە. سیلتییەکان لە وارێن ئەفسونگەری، پێکەنینۆك، و نوکتەبازیدا خزمەتی رۆشنبیریی ئەورووپای سەدەکانی ناڤینیان کردووە و بەشدارییان لەم بوارەدا رەنگە لە دامەزراندنی ئیمپراتۆرییەتێك گرنگتر بووبێ.

نۆڕینێکی گشتی:

هەر چەندە بە گوێرەی هەندێ ریوایەت و هەواڵنامان سەرەتا و دەستپێکی شیعری ئیرلەندی بۆ سەرەتاکانی یەکەمین سەدەی زایینی دەگەڕێتەوە، بەڵام دەکرێ بگوترێ تا پێش سەردەمی قەشە پاتریك (دەوروبەری ٤٣٢) شیعر و ئەدەب بە مانای دروستی وشە، لە

ئیرلەندەدا نەبووە، گەیلییەکان تا ساڵی ١١٧٢، کە سەرکەوتنی هونەری دووەم، کۆتایی بە ئەدەبیات و هونەری راستەقینەی سیلتی لە ئیرلەندەدا هێنا، لەرووی ئەدەبییەوە هەر چالاك و چەلەنگ بوون، بریتونەکان لە ویلزدا، درەنگتر روو دەکەنە ئەدەبیات و سەردەمی ئەدەبی وان پتر لە هاودینانی ئیرلەندی خۆیان دەوام دەکات. هیچ مێژوویەکی ورد و دروست لەبەردەستدا نییە کە سەرەتای ئەدەبیاتی زارەکی و فۆلکلۆری یان نووسراو دیاری و دەست نیشان بکات. بەلام گومان لەوەدا نییە کە بەرهەمێکی زۆر، بەر لەم شێوەی کە گەییوەتە دەستی ئێمە، بە درێژایی رۆژگاران چ بە شێوەی نووسراو و چ بە شێوەی زارەکی بەرهەم هاتووە و هەبووە. سەدان دەستنووسی سیلتی کە زۆربەیان لە ماوەی سالانی ١١٠٠-١٤٠٠ی زدا دانراون، لە چەپۆکی رووداو و قەوماوانی رۆژگار خەلەسیون و تاوەکو ئەمرۆ پارێزراون، کە ئەمە ناوی هەندێکیانە:

١- کتێبی دان کاو (دەوروبەری ١١٠٠).
٢- کتێبی لینستر (دەوروبەری ١١٥٠).
٣- کتێبی زەردی لکان (دەوروبەری ١٣٩١).

هەڵبەتە بەشی هەرە زۆر و سەرەکی ئەم بەرهەمانە تایبەتن بەرۆمانسەوە (واتە چیرۆکێن ئەڤینداری و سەرکێشی)، و هەموویان لێکدی دەچن و دەشوبهێنە سەر یەکتر، دەستنووسە بریتونیکە "١١" گرینگەکانیش بریتین لە:

١- کتێبی رەشی کرمارزن (سەدەی دوازدەیەم) کە بە شیعرە.
٢- کتێبی ئانیورین (سەدەی سیانزەیەم) کە ئەویش بە شیعر هۆنراوەتەوە.
٣- کتێبی تیلیسن (سەدەی چواردەیەم)، ئەمیش بە شیعرە.
٤- کتێبی سووری هرجست (سەدەی چواردەیەم)، کە بە هۆنراوە و پەخشانە.

هەم ئیرلەندییەکان و هەم ویلزییەکان بەرهەمێکی زۆریان چ بە شیعر و چ بە پەخشان داناوە کە بریتین لە: سروودێن مەزهەبی، هۆزانی ئەڤینی، وەسفی تەبیعەت، مێژوو، یاسا، مارشی مەلحەمی، سرودێن پالەوانی، رومانس و چیرۆکێن ئەڤینداری و سەرکێشی... هتد. هەرچەندە ئەم بەرهەمانە لە باری مێژووییەوە بایەخدار و گرنگن، بەلام بەیت و ئەفسانەکان بۆ خوێندکارانی ئەدەبیاتی پراکتیکی و خوێنەرانی ئاسایی زیاتر دلگیر و جوانن.

رۆمانس و (چیرۆکێن ئەڤینداری و سەرکێشی) سروودە پالەوانییەکان، وەکو چۆن لە یۆنان و ولاتانی جەرمەنیدا باو بووە، لە ماوەی سەدان ساڵدا پشتاوپشت لە نەوەیەکەوە بۆ نەوەیەکی

دیکـە هـاتووە و ماوەتـەوە. نەقڵبێـژان و حیکایـەتخوانان و بەشـێوەیەکی گـشتی (باردەکـان Bard"١٢") کە لە باری دەسەڵات و پایەی کۆمەڵایەتییەوە لە دوای پاشـایانەوە دەهـاتن، بـۆ گەیشتن بە پلەی (بارد)ی ئاسایی دەبوایە حـەوت سـاڵان موتـاڵا و کاریـان بکردایـە و ئەگـەر بیانویستایە بگەنە پلەیەکی باڵاتر، واتا بگەنە پلەی عولەمایی دەبوایە دوازدە ساڵان بخوێنن و نزیکەی ٣ سەدو پەنجا چیرۆك و ژمارەیەکی زۆر لە شیعری کورت ئەزبەر بکەن.

ئەفسوس کە شاعیرێکی بەهرەمەند پەیدا نەبوو تا ئەم چیرۆکانە لـە قـاڵبی مەلحەمـە و بەیتی مەلحەمی وەکو ئیلیـاد و سـروودی نیبلونگنـدا دابڕێـژێ و بهۆنێتـەوە. هـەر چـەندە ژمارەیەك لەو چیرۆکانە دراونەتە دەم یەکەوە، بەڵام لە دەستنووسی جۆراوجۆردا تۆمار کراون کە لەڕووی مێژوو و شوێنەوە لە یەکدی جیـاوازن، لەڕاسـتیدا کـاری داهێنـان و ئەفرانـدنی چیرۆکی یەکپارچەی یەکگرتووی هونەری بۆ نووسەران و دانەرانی تازە مایـەوەو کارەکـە بـە ملی ئەواندا هات.

وێڕای ئەوەی کە فۆرم و شێوەیەکی دیاریکراو لە بەیت و ئەفسانانی سیلتیدا بەدی نـاکرێ، بەڵام هەندێ تایبەتمەندێ هاوبەش لە هەموویاندا بەرچاو دەکەوێ. لەم بەرهەمانەدا هیچ جـۆرە نەزاکەت و وشەبازییەك بەدی ناکرێ، بەڵکو لێوان لێون لە زبری، ناپوختەیی و تەنانەت گیانی هۆڤیکاریش. چیرۆکەکان یان هەوێنی چیرۆکەکان هەر هەمووی لە بت پەرستییەوە وەرگیراوە... نێروی دراماتیکی، حەنەك کاری، دڵگیری و وەسفێن جوان و درەوشاوە لـە تایبەتمەندییـەکانی دیکەی ئەم چیرۆکانەن: فیشاڵبازی، دووبارە کردنەوەی سیفەتی کلێشەیی و درێژدادڕی ئاسیو و زیانی زۆری لێداون. هەڵبەتە هەندێ چیرۆکە شیعری قافیەداریشیان تێیدا هەیە.

## چیرۆکێن گەیلی

چـیرۆکێن گـەیلی (یـا ئیرلەنـدی) بەسـێ سـەردەمی سـەرەکی و بـە کۆمـەڵێك وردە قۆناغاندا تێ پەڕیوە.

<u>سەردەمی ئەفسانەیی:</u>

چیرۆکێن ئەفسانەیی، مێژووی ئیرلەندا لە کۆنترین رۆژگـارەوە تـا زاڵبـوون و سـەرکەوتنی میلیـسەکان"١٣" (Milesians) دەگێڕێتـەوە. سـەرهەڵدان و پەیـدا بـوونی تزاروپـارتولون-ی منالانی نوح، تـاڵان و بـڕۆی فورمورەکـان"١٤"، دوو شـەڕی موتیـورا"١٥" لـە نێـوان قـەومی

دانـا"١٦" و فیربولگــە"١٧"کــان، و ســەرەنجام شکــستی قــەومی دانـا لــە لایــەن میلیــسە ئەسپانیاییەکانەوە، هەر هەموو ئەمانە لەو چیرۆکانەدا دەگێڕنـەوە.. بـەناوبانگترین چـیرۆکانی سەربەخۆ کە باسی دوو شەڕەکەی مویتورا دەکەن بریتین لە: ((خوازبێنی ئاتین)). ((چارەنووسی منالانی توئیرن)) و (چارەنووسی منالانی لیر)). ئـەم دوو چـیرۆکەی دواییـان لەگـەڵ چـیرۆکی ئەسارەت و غەریبی منالانی ئوسناکدا (کە هی سەردەمی لقی سوورە) کۆ چیرۆکی ناسراو بـە (سێ چیرۆکی خەمناکی ئیرین) پێك دێنن.

سەردەمی لقی سوور (یان کوچولین):

چیرۆکانی سەردەی لقی سوور (یان کوچولین) زیاتر لە ژیانی کونچوبار، شای ئۆلیستیر"١٨"، و جەنگاوەرەکانی ئەوەوە هەڵێنجراون، کە بە گوێرەی ریوایەتان لە یەکـەمین سـەدەی زاییـندا دەژیان. زۆربەی ئەم چیرۆکانە بە دەوری کەسایەتی، لە دایك بوون، کـارە گـەورەکان و مـەرگی کوچولیندا، کە گەورەترین قارەمانی ئەفسانەیی ئیرلەندییە، دەسوڕێتەوە. بەشێك لەم سەردەم و قۆناغە تایبەتە بەو رووداوانەی کە ((تین بوکولی)) پێ دەگوترێ. بـەناوبانگترین چـیرۆکی ئـەم سەردەمە (ئەسارەت و غوربەتی منالانی ئوسناك))٥.

تین بوکولی (هێرش بۆ سەر کولی):

بە گەورەترین مەلحەمە (داستان)ی ئیرلەندی کۆن لە سەردەمی لقی سووردا دێتە ژمـاردن. میدب-ی مەلیکەی کونات"١٩"، داوا لە پیاوێکی خەڵکی ئالستر دەکـات، جوانەگایـەکی بـە ئەمانەت بداتێ. کابرا کە هەندێ جنێوی دەست و پێوەندانی مەلیکـەی بیـستبووەوە، نایـەوێ جوانەگاکەی بداتێ و خۆی دەدزێتەوە، میدب، تورە دەبێ و سەربازانی خۆی تـەیار دەکـات و لەشکر دەکاتە سەر کونچوبار، بەڵام ژمارەیەکی زۆر لە جەنگاوەرانی وی بـە دەسـتی کوچـولین دێنە کوشتن. لەشـکریانی میـدب کـە خـراپ دەشـکێن، پـاش کوشـتارێکی زۆر لـە کونـات وەدەردەنرێن، لە گەرمەی شەڕ و شۆڕ و هەرا و هەنگامەدا میدب جوانەگایەکە دەفرێنێ و بـۆ قەڵایەکی کونات-ی دەنێرێ. جوانەگای ئالستری، جوانەگاکـەی مێـردی مەلیکـە دەکوژێـت و دەگەڕێتەوە بۆ گەورەکەی خۆی لە کولی"٢٠". کە دەگاتەوە ئەوێندەر بە جۆرێکی هێندە دوور و درێژ دەبۆڕێنێ کە دڵی دەتەرەکێ و مردار دەبێتەوە.

ئەسارەت و غوربەتی منالانی ئوسناك:

ئەم چیرۆکە سەر بەهووردی خـەمناکی دیـردر"٢١"، کـە بـە هـیلنی ئەفـسانانی ئیرلەنـدی دەژمێردرێ، دەگێڕێتەوە. لە کاتی لەدایکبوونی (دیردر)دا کە تباد-ی غەیبزان پێشبینی ئـەوە

دەکات کە ئەم کیژە دەبێتە مایەی بەدبەختی و نەگبەتی بۆ ئالستر. بەڵام دیردر کە خۆی دەناسێتەوە هێندە جوان دەبێ کە کونچوبار شا لێبدەبڕێ بیخوازێ و بیکات بە هاوسەری خۆی ((دیردر)) بەم پەیوەندییە قاییل دەبێت، بەڵام گاڤێ کە (نیزی "٢٢") دەبینێ، بە سەد دڵ ئاشقی دەبێ و ناچاری دەکات پێکەوە بڕەڤن. ئەم جووتە ئاشقە دەگەڵ دوو برای نیزیدا، واتە لەگەڵ ئاینل، و ئاردندا، پەنا دەبەنە بەر ئوسکاتلاندە. ئەنجام هەر چواریان بە هێڤی عەفوی گشتی بۆ ئالستر دەگەڕێنەوە. لەوێندەر هەر سێ پیاوەکە بەر پەلامار دەدرێن و دەکوژرێن، ((دیردر))ش خۆکوژی دەکات. کە تباد پێشبینی ئایندەیەکی پڕ نەگبەتی بۆ کونچوبار دەکات و لەگەڵ جەنگاوەرەکانی دیدا لێی دوور دەکەونەوە و بڵاوەی لێدەکەن.

وەسفی خەیاڵاوی دیردر، شەرحی ئەڤینی سادە و بێ رتوشی دیردر دەرهەق بە نیزی، و کاراکتەرسازی سێ کوڕەکەی ئوسناك، وەکو نموونەێن چەلەنگی و راستگۆیی و بوێری، لە تایبەتمەندییە بەرجەستەکانی ئەم چیرۆکەیە.

سەردەمی فینی (یائوسانی):

شا قارەمان یان کاراکتەری سەرەکی زۆر چیرۆکی ئیرلەندی، ناوی (فین)ـە. ئەمە سەرکردەی گرووپی پاڵەوانانی فینی ـە (گرووپی فیانا)، واتە سەرکردەی ئەو سەربازە پیشەییانەی کە پشتیوانی پاشایانی جۆراوجۆر بوون، وڵاتیان لە هێرش و پەلاماری بێگانان دەپاراست، باج و خەراجیان کۆ دەکردەوە، و زیاتر بە راو و ماسیگری دەژیان. بە گوێرەی ئەفسانان، لاوی یان سەردەمی هەرزەکاری فین بە ئەنجامدانی کارێن گەورە و موعجیزە ئامێز دەگوزەرێ، لە جەنگ و نەبەردان‌دا بەشداری دەکات، گیرۆدەی گێرمە و کێشەی نێوخۆیی دەبێ و ئەنجام لە ساڵی ٢٨٣ی ز لە شەڕدا تیا دەچێت. ئوسین (ئوسسیان)ی کوڕی لە هەوەڵەوە بە جەنگاوەری و دەنگبێژی و شاعیری ناوبانگ دەردەکات، بەڵام لە ریوایەتەکانی دواتردا تەنیا وەکو شاعیر ناو دەبرێ. دەگێڕنەوە دەڵێن تا زەمانی قەشە پاتریك لە ئیرلەندەدا دەژیا. بە گوێرەی یەکێك لە ئەفسانەکان (ینامە)ی کیژی خواوەندی دەریا، شەیدای ئوسین دەبێ و دەیبات بۆ سەرزەمینی لاویی جاویدانی و هەمیشەیی، ئوسین سێسەد دانە ساڵ لەوێندەر دەژی. لە هەندێ ئەفسانانان‌دا دەگێڕدرێتەوە کە "فین"یش هەرگیز نەمردووە. هێشتا لە هەڵەتەکانی ئیرلەندەدا دەژی و لە کاتی پێویستدا دووبارە دەردەکەوێتەوە تا یارمەتی هاووڵاتییانی خۆی لە شەڕیان‌دا دەگەڵ دوژمنان‌دا، بدات.

## چیرۆکێن بریتانی

چیرۆکانی بریتانی (ولزی) بە پێچەوانەی چیرۆکێن ئیرلەندییەوە نە ئەوەندە زۆرن و نە ئەوەندەش هونەرمەندانە تۆمار کراون، گرنگی ئەم چیرۆکانە لە باری مێژووییەوەیە. ئەوەك هەر لەبەر ئەوەی رەنگدانەوەی داب و نەریت و نۆرینی خەلکی بریتانی کۆنن، بەلکو لەبەر ئەوەی کە یەکەمین ئاماژەیان بۆ ئارتور لە خۆ گرتووە، کە بە گوێرەی ریوایەتان دوایەمین شای بریتانی بووە بەر لە هاتنی داگیرکەرانی ئەنگلۆساکسونی. لە ئەدەبیاتی ولزدا بە پێچەوانەی ئەدەبیاتی ئیرلەندییەوە، هیچ قۆناغێکی دیاریکراو لە ئارادا نییە، لێ لە بەرهەمی ئەدەبی ئەم ولات و دەڤەرەدا، لە سەدەکانی ناڤیندا بەلای کەمەوە نۆجار ئاماژە بۆ ئارتور شا کراوە.

چیرۆکی پۆیل:

شازادە پویل-ی خەلکی دایڤید"٢٣"، لە شێوەی شای هادیس (پەن ئانوین)دا دەتوانێ ریانون"٢٤"-ی دەزگیرانی گوال"٢٥" تەفرە بدات و بیکات بە هاوسەری خۆی. پاشان بە فێلێ و دەهۆ گوال لە ناو کیسەیەکدا حەپس دەکات و بەو مەرجە ئازادی دەکات کە چاو لە ریانون بپۆشێت و دەستبەرداری ببێ. (پرایدری)ی فەرزەندی پویل و ریانون، پاش لەدایکبوونی بە ماوەیەکی کەم ون دەبێ، و دایکەکەی بەوە تاوانبار دەکرێ کە منداڵەکەی خواردووە، کەچی پرایدری پاش چەند ساڵێك دووبارە پەیدا دەبێتەوە.

کیهلوك و ئولون:

بە فەرمانی ئارتورشا، سێ کەس لە دلاوەران و سوارچاکان (کەی، بیدیڤر، و گاوین) یارمەتی کیهلوك دەدەن تا ئولون-ی کیژی هاپورن -ی سەرداری دێوان بخوازێ و بیکات بە هاوسەری خۆی، سێ دلاوەرەکە ئەو سیازدە گەنجە دەدۆزنەوە کە هاپورن وەکو ((دیاری زاوا)) داوای کردووە، ئەو گەنجینانەی کە وەدەست هێنانی هەر یەکێکیان کۆمەڵێك گێرمە و کێشەی گەرەکە.

ئەم چیرۆکە بە هۆی وێنەگرتنی کەسایەتی ئارتۆر وەکو شای پەریان، و نۆ پاشای سەردەمی سوارچاکی، شایانی ئاورلێدانەوەیە، پەیرەوانی ئارتور لە زومرەی جەنگاوەرانی لە مرۆڤ بالاترن، و نێروی ئەفسونئامێزی ئارتۆر سەرچاوەی فتوحاتی پرشنگداری ئەوانە، پێدەچێت جفری"٢٦" ئاومان موپ و کرتین دوتروا کاریگەری ئەم چیرۆکەیان بەسەرەوە بووبێ.

# پەراوێز و ژێدەران:

١- سیلتی- Celtic: وشەی سیلتی یا کیلتی لێرەدا بە ئیرلەندی و ویلزی گوتراوە.

٢- گەیلی- Caels: دانیشتووانی زۆزانەکانی ئوسکاتلەندا.

٣- بریتونی- Brythons: سیلیتانی لقی بریتانیا.

٤- ئانگل- Angles: قەومێکی جەرمەنی زمانن، کە لە سەدەی پێنجەمی زایینیدا هێرش دەکەنە سەر بریتانیا.

٥- ساکسون- Saxons: قەومێکی جەرمەنی زمانن، کە لە سەدەی شەشەمی زایینیدا لە بریتانیا ئاکنجی دەبن.

٦- جوت- Jutes: قەومێکی جەرمەنی زمانن، کە لە سەدەی پێنجەمی زایینیدا پەلاماری بریتانیا دەدەن.

٧- براین برۆ- Brian Boru: (٩٦٢- ١٠١٤ی ز) شاهنشای ئیرلەندا کە سەرانسەری ئیرلەندای خستە ژێر رکێفی خۆیەوە.

٨- هنری دووەم (١١٣٣- ١١٨٩ی ز): لە سالأنی (١١٥٤- ١١٨٩ی ز)دا پاشای ئینگلستان بووە.

٩- دروئید: Druids: کاهینانی بەریتانیای مەزنی سەردەمی سیلتییەکان بوون.

١٠- قەشە پاتریک- Saint patrick: (٣٨٥- ٤٦١ی ز): مژدەبەرێکی مەسیحی بوو، کە بە پەیامبەری ئیرلەندە بەناوبانگ بوو.

١١- بریتونیک- Brythonic: ناوی یەکێکە لە زمانە هیند و ئەوروپاییەکانی گرووپی سیلتی، کە زمانانی ویلزی، بریتانیی و کورنوالی دەگرێتەوە.

١٢- باردەکان- Bards: ئەمانە لەناو میللەتانی سیلتی کۆندا جۆرە شاعیرێکی فەرمی و دەرباری بوون کە ئەرکیان ئەوە بووە یادی رووداو و بۆنە نەتەوەیی و نیشتیمانییەکان، بەتایبەتی کار و سەرکەوتنە قارەمانییەکان بکەنەوە.

١٣- میلیسەکان- Milesians: پەیڕەوانی میلید-ی شای ئەفسانەیی ئەسپانیان، کە کوڕەکانی لە دەوروبەری ساڵی ١٣٠٠ پێش زایینداً بەسەر ئیرلەندەدا زاڵ دەبن، و ئیرلەندیانی ئەمڕۆ بە ئەوە و ئە تیرەی ئەوان دەزانرێن.

١٤- فورمورەکان- Formorians: (بە گوێرەی ئەفسانەی سیلتی): نەژادێکی دێوانی دەریایین کە ئەژدادیان خواوەنانی شەڕ و تاریکی بوون.

١٥- موتیورا- Moytura: دەڤەرێکە لە ئیرلەندا.

١٦- دانا- Dana: (بە پێی ئەفسانەی ئیرلەندی) کەسوکار و خزمانی دانا- Dana-ن (خواوەندی دایك و رەمزی مەرگ و ژیان) کە لە جەرگەی هەڵەتەکانی ئیرلەندەدا دەژین.

١٧- فیربولگەکان- Firbolgs: هێرشکارانی ئەفسانەیی کۆنی ئیرلەندەن.

١٨- ئولستیر — Ulster: باکوریترین چوار ویلایەتی مێژووی ئیرلەندا.

١٩- کونات- Connacht: ویلایەتی رۆژئاوای کۆماری ئیرلەندا.

٢٠- کولی- Cooley: ناوچەیەکە لە ئالستر.

٢١- دیردر- Deirdre: ژنێکی جوانە لە ئەدەبیاتی کۆنی ئیرلەندەدا. کیژی یەکێك لە داستان بێژانی کونچوبار بوو.

٢٢- نیزی- Naisi: جەنگاوەرێکی قۆزو یەکێك لە کوڕانی ئوسناك بوو.

٢٣- دایڤید- Dyvid: ناوچەیەکی کۆنە لە باکووری رۆژئاوای ولز.

٢٤- ریانون- Rhiannon: لە ئەفسانانی ولزیدا، ریانون هاوسەری شاهادیس-ە. ریانون سێ باڵندەی هەبوو کە ئاواز و دەنگیان دەبووە مایەی مەرگی زیندووان و زیندوو بوونەوەی مردووان.

٢٥- گوال- Gwawl: بە گوێرەی ئەفسانانی ولزی، خواوەندی هەتاوە.

٢٦- جفری ئاومان موت- Geoffrey ofmon mouth: (١١٠٠- ١١٥٤ی ز) کادری کڵێسا و واریقاتنووس بوو، یەکێك لەبەرهەمە بەناوبانگەکانی (مێژووی بریتونەکان)ـە.

# ئەدەبیاتی فەڕەنسی

پێشینەیەکی مێژوویی:

کۆنترین دانیشتووانی سەرزەمینی فەڕەنسای ئێستا قەومی گل (Galli)ـە کە لقێکی نەژادی سیلتییە، و رەنگە لە سەدەی حەوتەمی پێش زایینەوە لە ئەوروپای رۆژئاوادا ئاکنجی بووبن.

تاوەکو بەرلە سەرکەوتنی رومییەکان لە سالآنی ١٥٤- ٥٠پ. زدا، زانیارییەکی ئەوتۆ دەربارەی گولەکان لەبەردەستدا نییە. بە سەرکەوتنی رومییەکان، شارستانییەتێکی ئاوێتەی گولی و رومی پەیدا دەبێ و هەردوو قەومەکە لە یەکتردا دەتوێنەوە.

هێرش و پەلاماری بەربەرەکان (تیرە جەرمەنییەکان) دوو شوێنەواری گەورە بەسەر فەرەنساوە بەجێ دێلن، یەکەم ئەمەیە کە بەربەرەکان، وێڕای ئەوەی لە باری ژیاری و رۆشنبیرییەوە لە ئاستێکی نزمترا بوون و چاویان لە فەرهەنگ و رۆشنبیری لاتین بوو، سەرەنجام دەبن بە فەرمانڕەوایانی فەڕەنسا، و دووەم ئەمەیە کە لەگەڵ هێرش و پەلاماری ئەنگلوساکسونەکاندا بۆسەر ئینگلیستان، گەلێك لە سیلتانی بریتانی رەهەندەی نیمچە دورگەی باکووری رۆژئاوای فەڕەنسا، کە بە بریتانی بەناوبانگە، دەبن.

مێژووی فەڕەنسا لە سەدەی شەشەمەوە تا سەدەی یازدەیەم بریتییە لە چیرۆك و سەربهووردی شەڕی دەسەلآتخوازی نێوان تیرە جۆراوجۆرەکانی هێرشبەرانی جەرمەنی. لە سالی ٥٠٧دا کلۆڤس"١" دەبێ بە پاشای فرانکەکان و مەسیحیەت دەکات بە ئایینی فەرمی ولآتەکەی. لە سالی ٧٣٢دا شارل مارتل"٢"، لە جەنگی توردا"٣" ئەو موسولمانانەی کە ئەسپانیایان داگیر کردبوو و هێرشیان بۆ فەرەنسا هێنابوو، تێك دەشکێنێ.

شارلمانی لە ساڵی ٨٠٠دا بەشێکی گەورەی فەرەنسا و ئەڵمانیا یەك دەخات و تاجی ئیمپراتۆری لەسەر دەنێ. لە سەدەی دەیەمدا نورمانەکان باکووری رۆژهەڵاتی فەرەنسا داگیر دەکەن و لە ساڵی ١٠٦٦دا ئینگلیستان دەگرن.

سەدەی پانزەیەم بەتایبەتی لە باری پەرەسەندن و گەشەکردنی فیودالیزم و رێبازی سوارچاکی و دلاوەرییەوە مایەی سەرنجە. فیودالیزم رێك و پێك تر دەبێ و نەخش و رۆڵی ئافرەتان لە کۆمەڵگەدا لە جاران زیاتر دەبێ. ئیدی لە سەدەی دوانزەیەمدا سوارچاکی و فیودالیزم دەگاتە لوتکەی خۆی و پاشان روو لە نەمان دێتە خوارەوە.

شەڕی خاچپەرستان مەرگ و هەژار بوونی ژمارەیەکی زۆری فیودالانی بە دوودا دێ کە زیادبوونی توانای دەسەلات و بورژوازی لێدەکەوێتەوە. شووکردنی ئیلنورئا و ئاکویتین"[٤] بە هنری دووەم-ی پاشای ئینگلیستان لە ساڵی ١١٥٢دا، فەرەنسا و ئینگلیستان لەڕووی شارستانییەت و رۆشنبیریی و رامیارییەوە لێکدی نزیك دەکاتەوە. لە ئاخر و ئۆخری سەدەدا قوتابخانەی کلێسای پاریس دەبێ بە زانستگ، و پاریس دەبێ بە مەڵبەندی رۆشنبیری ئەورووپا و زانایان و دانایان لە سەرانسەری کیشوەری ئەورووپاوە لەوێندەر کۆ دەبنەوە.

لە سەدەی سیانزەیەمدا دەسەلاتی فیودال هێندەی دی دێتە خوارێ و دەسەلات-ی پاشایان و جەماوەری خەڵك زیاد دەکات، گەشەکردنی پیشەسازی و رەونەقی بازرگانی ئیحتوبارو بایەخی شاران دەباتە سەرێ، سەرهەڵدانی گیانی زانستی، بەشێك لە ئامۆژگاری و پرەنسیپەکانی کلێسا دەخاتە بەر پرسیاران و، خەلکی رۆژ بە رۆژ پتر دژی دەسەلاتی کلێسا بەسەر مەسەلە ئەخلاقی و هزرییەکانەوە دەوەستن.

جەنگی سەد ساڵەی (١٣٣٨- ١٤٥٣) نێوان فەرەنسا و ئینگلیستان رەوت و رێبازە فیکرییەکانی سەد و پەنجا ساڵە بۆ ماوەیەکی کورت دەگۆڕێ: پێشڤەچوونی رۆشنبیری و چەلەنگی بازرگانی دەگاتە حاڵی وەستان، و ئیحتویار و دەسەلاتی چینانی فیودالی و سوپایی تارادەیەك دەبوژێتەوە. بەلام لە کۆتایی جەنگدا بازرگانی و پیشەسازی رەونەق و برەو پەیدا دەکات، فیودالیزمی سەدەکانی ناڤین کۆتایی دێت، و بورژوازی، جگە لە دەسەلاتی سیاسی، هەر هەموو ئەو شتانەی کە لە دەستی دابوون، بە دەستیان دێنێتەوە. دەسەلاتی پاشایەتی بێ ئەندازە زیاد دەکات، سەرکەوتنەکانی جاندارك"[٥] یەکێتییەکی میللی و نیشتیمانپەروەرییەکی بێ وێنەی بەگەڵ دەکەوێ، بەمجۆرە سەدەکانی ناڤین لە فەرەنسادا کۆتایی دێت.

## نۆرینێکی گشتی:

زمانی فەرەنسی ڕاستەوخۆ لە زمانی لاتینییەوە وەرگیراوە، کە لە سەردەمی ڕومیاندا لەسەرزەمینی گولدا زمانی فەرمی حکوومەت، قوتابخانەکان، و ئەوجا کلێسا بووە، ئەم زمانە ئەو لاتینییە کلاسیکەیە کە سیسیرون و سزار بەرهەمەکانی خۆیان پێ نووسیوە، لە نێو سەربازان و چینەکانی خوارەوەی کۆمەڵگە بەرە بەرە لاتینی عامیانە ڕەواج پەیدا دەکات کە زمانێکی پچڕ پچڕتر، بێ سەروبەرتر، و لەڕووی دەستوور و ڕێزمانەوە پڕ هەڵە تر بووە، تا وەکو سەدەی پێنجەمی زایینی گۆڕانێکی زۆر بەسەر ئەم زمانە لاتینییە میللییەدا دێت. وێران بسوونی قوتابخانەکان و سیستەمی حکوومەتی بە دەستی بەربەرەکان دەورێکی زۆر لە برەوپێدانی ئەم زمانە عامیانەیەدا دەبینێ و دەیکات بە زمانی نەتەوەیی، سەرەنجام کلێسا کە یەجگار پابەندی لاتینی کلاسیك بوو بە ناچاری ڕێگە بە قەشە و کەشیشەکانی دەدات کە لە وەعز و خوتبەکانیاندا لاتینی عامیانە بەکار بێنن.

لە ساڵی ٨٤٢ شارل"٦" کچل و لویسی"٧" جەرمەنی سوێندە بەناوبانگەکەی ستراسبورگ دژی لوتار"٨"-ی برایان دەخۆن لویس سوێندەکەی خۆی بە فەرەنسی دەخوات، کە دەقی ئەو سوێندە بە کۆنترین نموونەی زمانی فەرەنسی دەزانرێ. لە سەدەی دەیەمەوە تا چواردەیەم بە دوو دیالێکتی سەرەکی قسان دەکرێ: "دیالێکتی ئوك" لە باشووری ڕووباری لوار، و "دیالێکتی ئوئی" لە باکووری لوار ("ئوك" و "ئوئی" هەردووکیان بە مانای "ئاری" دێن). لە سەدەی چواردەیەم بە دواوە دیالێکتی باکووری زاڵ دەبێ و دەبێت بەسەرچاوەی زمانی فەرەنسی ئێستا.

لە سەدەی دەیەمدا، چوار بەرهەمی کورت"٩" بەرهەم دێت، کە پتر لە باری زمانەوانییەوە بایەخدارن، بە هەر حاڵ مێژووی ئەدەبیاتی فەرەنسا لە سەدەی یازدەیەمەوە دەست پێدەکات.

ئەو بەرهەمە ئەدەبیانەی کە بەر لە ساڵی ١٤٨٠ نووسراون دەکرێن بە سێ گرووپی سەرەکییەوە: ئەدەبیاتی کلێسا و دێران، ئەدەبیاتی کۆشك و دەرباران، و ئەدەبیاتی شاری.

لە سەدەی یازدەیەمدا سێ جۆرە نووسینی ئەدەبی دەسەڵاتی کلێسا و فیودالیزم بەرجەستە دەکەن: ژیاننامەی قەدیسان، بەرهەمی مەزهەبی لاتینی تازە، و بەیتەکانی شانسون دوژست.

هەم چەندێتی و هەم چۆنیەتی بەرزی بەیتەکانی شانسون دوژست، واتا ئەو ڕۆمانسە شیعری و هۆزانە لیریکییانەی کە لە ماوەی سەدەی دوازدەیەمدا دەنووسرێن، ڕەخنەگرانی وەخت واڵێدەکەن کە ئەم سەردەمە ناوبنەن سەردەمی زێڕینی ئەدەبیاتی فەرەنسا لە سەدەکانی

ناڤیندا. شیعری ئەم قوناغە لە چاو شیعری سەدەکانی پێشووتردا رازاوەتر و پوختەترە و لەرووی هۆشیاری کۆمەڵایەتیشەوە دەوڵەمەندتر و لە پێشترە.

ئەدەبیاتی سەدەی سیانزەیەم هەر لە رۆمانسی بە پەخشان نووسراو، شانۆنامە، تەنز، شیعری لیریکی و تا دەگاتە حیکایەتی رەمزی مایەی سەرنجە. زۆربەی بەرهەمی ئەم سەدەیە نیشانەی گەشەکردنی بورژوازییە. ئەم بەرهەمانە رەنگدانەوەی کەلکەڵەی ئەقلگەرایی "١٠"، واقیعگەرایی و رەشبینی زەمانی خۆیانن.

ئەدەبیاتی سەدەکانی چواردەیەم و پانزەیەم کاریگەری موسیبەت باری جەنگەکانی سەد ساڵە دەگێرێتەوە. لەم قۆناغەدا هیچ دەلیڤەیەك بۆ ئەفراندنی بەرهەمی خەیاڵی لە ئارادا نییە. چەند چیرۆکێکی شیعری، چەند واریقاتنامەیەکی پەخشانی و چەند قەسیدە و هۆنراوەیەکی لیریکی دەنووسرێن، بەڵام بە شێوەیەکی گشتی ئەم سەدانە لەرووی ئەدەبییەوە بە نەزۆك دادەنرێن.

## ئەدەبیاتی کلێسا و دێران

کلێسا وەکو بەهێزترین فاکتەری یەکێتی و مەدەنییەتی سەدەکانی ناڤین، کارێکی قووڵ و سەیر لە ئەدەبیاتی کۆنی فەرەنسی دەکات. بۆ ماوەی چەند سەدەیەك هەر هەموو مەتن و دەقە فەلسەفی و پەیڤەوانییەکانی فەرەنسا بە لاتینی تازە دەنووسرێن، چونکە تەنیا ئەهلی کلێسا دڵبەند و پابەندی ئەم جۆرە پەخشانە بوون، ئەمە جگە لەوەی بۆ ماوەی ساڵانێکی دوور و درێژ وا باو بوو کەزمانی فەرەنسی بە کەڵکی دەربڕینی هزرێن تەجریدی نایەت. ژیاننامەی روحانیات و پەرجووەکانی مریەمی موقەددەس-یش بە هەردووك زمانی لاتینی تازە و فەرەنسەوی دەنووسران. کلێسا بە مەبەستی فێرکردنی پرەنسیپەکانی ئەخلاق پەنای وەبەر تەنز و حیکایەتان دەبرد (بە تایبەتی ئەو چیرۆك و حیکایەتانەی بە زمانی گیانلەبەران و بەردانەوە دەگوتران). ئەوە بوو لە ئەنجامدا نمایشی سروودێن خواپەرستی لە کلێساوە دەستی پێکرد، بەڵام زۆر زوو لە بازنەی کلێسا دەرباز بوو و قاڵب و شێوەی نمایش و شانۆنامەی نە مەزهەبی وەرگرت.

## ئەدەبیاتی کۆشك و دەرباران

دەکرێ ئەو بەرهەمانەی کە بۆ ئەجیمزادە و فیودالان دەنووسران بکرێن بە دوو بەشەوە، ئەدەبیاتی فیودالیزم (پتر هەردووسەدەی یانزەیەم و دوانزەیەم دەگرێتەوە)و ئەدەبیاتی سوارچاکی (بە تایبەتی لە نێوان ساڵانی ١١٥٠و ١٣٠٠).

## ١- ئەدەبیاتی فیودالیزم:

### شانسون دوژست.

داب و نەریت و رێورەسمان، خۆزیا و ئاواتان، و خولیا و کەلکەڵەی خەڵکی، لە رۆژگارانی هەوەڵی فیودالیزمی فەرەنسییەوە، لە نەوەد و پێنج بەیتی مەلحەمیدا بە ناونیشانی شانسون دوژست (واتە گۆرانی شاکاران) پارێزراوە و ماوەتەوە، ئەم بەیتانە بریتین لە سەربهووردی ئەو قارەمانانەی کە لە سەدەکانی هەشتەم و نۆیەمدا دەژیان، بەڵام هاماجی رۆژگارانی فیودالیزم، شەڕێن خاچپەرستی سێبەری خستبووە سەر ژیانی هەر هەموویان. ئەم شانسون-انە نیمچە مێژوون، و بە زۆری کار و کردەوەی دوو یان چەند کەسایەتییەکی واقیعی دەدرێتە پاڵ یەك قارەمان، ئەم بەیتانە جەخت لەسەر هێز و توانای بەدەنی، ئازایەتی، سەبر و وەفاداری دەرهەق بە خاوەنی هەمووان و خودا دەکەنەوە.

سەرچاوەی بەیتەکانی شانسون دوژست تاڕادەیەك نادیارە رەنگە لەو بەیتە مەلحەمیيانەوە وەرگیرابن کە ماوەی دوو سەد، سێ سەد ساڵێك دەماودەمیان کردووە و پشتاوپشت هاتوون. یا لەوەیە یەکێك لە ئەربابانی کڵێسا لە سەدەکانی ناڤیندا کە ئارەزوومەندی راکێشانی رێبواران بووە بۆ زیارەتگە و مەزارەکان، بە پشکنینی سەرچاوە نووسراوەکان و گوێ گرتن لە ژونگورەکان (نمایشکارانی پیشەیی گەڕۆك) ویستبێتی هەندێ بابەت دەربارەی قارەمانێك کە کارە بەرجەستەکانی یان شاکارەکانی بە شێوەیەك لە شێوەکان بەو مەزار و زیارەتگەیەوە پەیوەست بووبێ، کۆبکاتەوە، و ئەوسا شانسونێك-ی دەربارەی ئەو قارەمانە داناوە.

زۆربەی شانسون-کان لە قاڵبی بەیتێن دە سیلابی و دە بڕگەییدا داڕێژراون، هەندێکیانیش لە قاڵبی بەیتێن دوانزە بڕگەییدا هۆنراونەتەوە، لە شانسون-ە کۆنەکاندا سیلابە هاودەنگ و سەداکانی کۆتایی، بەیتەکان پێکەوە دەبەستنەوە، پاشان، قافیە جیگەی بڕگە هاودەنگ و سەداکان دەگرێتەوە، هەرچەندە هەر بەیتێك یەك بەند لەخۆ دەگرێت، و ژمارەی بەیتەکانی کەم و زیاد دەبێ، هەموو بەیتەکانی هەر بەندێکیش بڕگەی هاوسەدا یان قافیەی یەکسانی هەیە.

نێوەڕۆکی هەموو بەیتەکانی شانسون دوژست بەکاروباری فەرەنساوە پەیوەستە- ئەو چیرۆك و سەربهووردانەن کە باسی شارلمانی، فەرزەندانی وی، و فیوداڵی فەرەنسە دەکەن، لە شانسون-ەکاندا سێ قۆناغی سەرەکی بەرچاو دەکەوێ، قۆناغی شارلمانی، قۆناغی گیوم دورانژ، و قۆناغی دومایانس.

**قۆناغی شارلمانی (کارەکانی پاشا):**

بەرهەمی ئەم قۆناغە بریتین لەو بەیتانەی کە شارلمانی دەوریان تیادا دەبینێ، ئەگەر دەورەکەی بچووك و لاوەکیش بێ.

**"سروودی رولان" (شانسون دو رولان) (دەوروبەری ١١٠٠)**

کۆنترین و باشترین مەلحەمەی فەرەنسییە و بریتییە لە ٤٠٠٢ چوار هەزار و دوو بەیتی دە سیلابی و هاوسەدا.

دانەرەکەی نادیارە، لەوەیە تورولدوس ناوێك بێ، کە لە کۆتایی نوسخە دەستنووسەکەی ئوکسفوردا ناوی هاتووە، بەڵام لەگوینە تورولووس تەنیا نووسەرێك بوو بێ و نوسخەکەی نووسیبێتەوە. بە گوێرەی واریقاتنامەیەکی ئاینهارد-ی رەبەن"١١"، لە ساڵی ٧٧٨دا دەستەیەك لە باسکەکان"١٢" رێگەی پشتەوەی لەشکری شارلمانی لەملەی پیرنە دەبڕن و هرودلاندوس-ی خواناس دەکوژرێ، لەم چەکەرە بچووکەوە، ئەو درەختە گەورەیە سەر دەردێنێ کە بە زۆری مەلحەمە و داستانی نەتەوەیی (فەرەنسای ئازیز)ی پێ دەگوترێ، بەمجۆرە لەشکرکێشییەکی سوکەڵە بۆ سەر باسکەکان تەشەنە دەکات و دەبێ بەشەڕێکی پیرۆز لەگەڵ ساراسنە"١٣"کانی (عەرەبەکان)ی ئەسپانیادا و ئیدی ناوی رولان-ی برازای ئازیزی شارلمانی و دلاوەری نموونەیی فەرەنسا دەکەوێتە ناو ناوان.

<u>چیرۆکی "سروودی رولان" بەمجۆرەیە</u>: شارلمانی پاش حەوت ساڵ شەر دەگەڵ ساراسنەکاندا لە ئەسپانیا، هەموو شارەکان دەگرێ جگە لە ساراگوسا"١٤" کە بە دەستی مارسیل-ی فەرمانڕەوای موسوڵمانەکانەوە دەبێ. مارسیل داوای ئاشتی و مەسلەحەت دەکات، و شارلمانی گانیلو زڕبابی رۆلان بۆ گفتوگۆ دەربارەی هەلومەرجەکانی ئاشتی و سولح دەنێرێ.

گانیلو کە بەغیلی بە رۆلان دەبات دەکەوێتە بیری خیانەت و بەهاوکاری مارسیل، پیلانی هێرش بۆ سەر پاشینەی لەشکرەکە بە فەرماندەیی رولان دەکێشێت، ئەم پیلانە سەر دەگرێ و پاشینەی لەشکرەکە نابوت دەبێ، بەڵام رۆڵان و هێزەکەی رۆلان پێش ئەمە بیست هەزار کەس لە ساراسنەکان دەکوژن.

رۆلان بە چەند ساتێك بەرلە مردن فوو بە شەیپوردا دەکات، سەربازانی شارلمانی بە هانایەوە دەچن و پاشماوەی ساراسنەکان لەناو دەبەن، بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا لەشکرێکی دیکەی موسوڵمان دەکەوێتە بەرگری و بەرەڤانی لە ساراگوسا و فەرەنسییەکان ناچار دەبن بچنە شەڕەوە. شارلمانی بۆ ئیکس لاشاپل"١٥" دەگەڕێتەوە و بە تاوانی خیانەت گانیلو لە سێدارە

دەدات، ئەود-ی دەزگیرانی رۆلان، کە هەواڵی مردنی دەزگیرانەکەی دەژنەفێ لە داخ و سوێیاندا دیق دەکا و دەمرێت.

عەیبی گەورەی ئەم بەیتە زێدەرۆیی و درێژدادڕی و دووبارە کردنەوە و کاراکتەرسازی ناپوختە و نەخەملیوە: هەر کاراکتەرێك دەگری یان بە باش وێنەگیراوە یان بە خراپ، واتە چ کاراکتەرێك لەو نێوانەدا نییە، بەڵام وێڕای ئەممیش سروودی رۆلان جۆرە دەربڕینێکی هەرە جوان و دلگیری نیشتیمانپەروەریی فەرەنسەوی و گیانی مەسیحییەتی خەباتگێرە.

چوونی شارلمانی بۆ بەیتول مەقدیس (دەوروبەری ١١١٥):

ئەم بەیتە لە قالبی بەیتی دوانزە هیجاییدا هۆنراوەتەوە و پێدەچێت دەربارەی شەرح و شرۆڤەی کار و توحفە موبارەکەکانی قەشەدنی"١٦" هۆنرابێتەوە. کاتێ کە هاوسەرەکەی شارلمانی بە دەم قسەکردنەوە ئاماژەیەك بۆ ئەوە دەکات کە هیو-ی ئیمپراتۆری قوستەنتەنیە، لە مێردەکەی ئەو باڵا بەرزتر و جوانترە، شارلمانی بۆ بەیتول مەقدس دەڕوات، لەو شارەدا کۆمەڵێك توحفە و کۆنینەی موفەڕك بە دەست دێنێ و ئەوجا بۆ قوستەنتەنیە دەڕوات، لەوێندەر پاش ئەوەی هەندێ کاری سەیر لە سایەی بەرەکەتی ئەو توحفانەدا ئەنجام دەدرێ، شارلمانی باڵای خۆی بە باڵای هیو دەگرێ و بۆی دەردەکەوێ کە چەند پەنجەیەك-یش لە هیو بەرزترە، ئیدی بە پەلە بۆ فەرەنسا دەگەڕێتەوە و هاوسەرەکەی دەبەخشێت و کۆنینە و توحفەکان پێشکەش بە دێر-ی قەشەدنی دەکات. ئەم بەیتە تەژی نوکتەو حەنەك و پێکەنینۆکە، و لە راستیدا مایەی سەرگەرمییە تا سەرچاوەی ئیلهام بێ.

هویون دو بوردو (دەوروبەری ١٢٠٠):

ئەم بەرهەمە زیاتر لاسایی کردنەوەی رۆمانسە پڕ رووداو و سەرەکێشییەکانە. هویون-ی کوڕی دۆقی بوردو، بە مەبەستی بەرەڤانی لە خۆی، شارلوت-ی کوڕی شارلمانی دەکوژێت، و مەحکوم بە ئەنجامدانی زنجیرە کارێکی مەحاڵ دەبێ، بەڵام ئوبرون"١٧"ی شەمولە بە هانایەوە دەچێ و فریای دەکەوێ.

قۆناغی گیوم دورانژ:

ئەم قۆناغە ئەو سەربهوورد و چیرۆکانە دەگرێتەوە کە دەربارەی گیوم دوانژ-ی پشتیوانی لویس-ی کوڕە بودەڵە و ترسنۆکەکەی شارلمانییە. گیوم بە قارەمانی بەهێزی مەسیحی-ش دەژمێردرێ کە بەرانبەر بە ساراسنەکان دەوەستێت.

جوانترین سروود و هۆنراوانی ئەم قۆناغە بریتین لە:

سروودی گیوم (١١٢٠)، ئالیسکانس و تاج لەسەر نانی لویس (١١٥٠). ئەم قۆناغە لە قۆناغی شارلمانی یەکگرتوو تر و خەملیوتر و پوختەترە.

قۆناغی دون دومایانس:

ئەم قۆناغە دەربارەی ئەو سەرکێشییانەیە کە دژی ئەربابانی گەورە و بەتایبەتی شارلمانی دەکرێن. زۆربەی شیعری ئەم قۆناغە پڕە لە توندوتیژی و بێ رەحمی و هۆڤیگەریتی.

## ٢- ئەدەبیاتی سوارچاکی و دلاوەری:

رۆمانس:

رۆمانسە کۆنەکانی فەرەنسا، وەکو شانسون دوژست، چیرۆکی شیعرین، لەگەڵ ئەمەشدا، جیاوازی ئاشکرا لە نێوان ئەم دوو جۆرە بەیتانەدا هەیە:

١- رۆمانس، بەپێچەوانەی بەیتەکانی شانسون دوژست-ەوە هیچ زەمینە و تیمە و هەوێنێکی مێژوویی تێدا نییە.

٢- رۆمانسەکان، بە شێوەی زۆر هونەرمەندانەتر و پوختەتر نووسراون.

٣- رۆمانس، پتر دەربارەی ئەڤین دەدوێ.

٤- رۆمانس، زیاتر سەروساختی دەگەڵ خەیاڵ، موعجیزە و کاری سەیر و سەمەرەدایە تا لەگەڵ فتوحاتدا بێ کەرەگی دەچێتەوە سەر توانا و دەسەڵات و ئازایەتی.

رۆمانس بەسەر سێ قۆناغی سەرەکیدا دابەش دەبێ: رۆمانسانی کۆن، کە رەگی دەچێتەوە سەر بابەتەکانی مێژووی روم. رۆمانسانی برتن"[١٨]"، کە بابەتی چیرۆکە سەرەکییەکانی لە نێوەرۆکە برتانییەکانەوە وەرگیراوە.

رۆمانسانی سەرکێشی.

**رۆمانسێن کۆن:**

"چیرۆکی ئەسکەندەر": وا دیارە لە دەوروبەری ساڵی ١١٤٧دا لەلایەن لامبرلوتور-ەوە دەستی پێکراو و لە ساڵی ٢٢٧٦دا لەلایەن ئەلکساندەر دوبرنە-ەوە تەواو کراوە. ئەم بەیتە کە لە قالبی بەیتی دوانزە هیجاییدا دارێژراوە، ژیاننامەیەکی خەیاڵی ئەسکەندەری گەورە نیشان دەدات.

**"چیروکی تب" (دەوروبەری ١١٥٠):**

دانەرەکەی نادیارە، ئەم بەرهەمە ئەفسانەی تب-ی کۆن دەگێڕێتەوە.

**"چیرۆکی ئاینیاس" (دەوروبەری ١١٥٥):**

دانەرەکەی نادیارە، زیاتر چیرۆکی ئانیئید-ی ڤیرجیل دەگێڕێتەوە.

**"چیرۆکی ترواده" (دەوروبەری ١١٦٥):**

ئەم چیرۆکە لەلایەن (بنوا دوسنت- مور) "١٩"ەوە دانراوە، ئەمە چیرۆکێکی شیعری سێ هەزار بەیتییە کە لە قالبی بەیتی هەشت برگەیی قافیەداردا هۆنراوەتەوە. بنوا بۆ دانانی ئەم بەرهەمە سوودی لە نووسینەکانی هۆمەر و بەرهەمەکانی دارس فریگیایی "٢٠" و دیکتس کرتی "٢١" وەرگرتووە.

ئەم بەیتە ئەگەرچی پڕە لە درێژدادڕی و دووبارە کردنەوە و کاوێژکردنەوە، بەڵام بایەخێکی زۆری هەیە چونکە بۆ یەکەمین جارە ئەفسانەی ترویلوس و کرسیدا "٢٢" دەگێڕێتەوە و زەمینە بۆ بەرهەم و چیرۆکی نووسەرانی وەکو بوکاچو، چاسر، شەکسپیر، درایدن، مورلی و زۆری دیکە خۆش دەکات.

**رۆمانسێن برتن:**

دڵبەندی نورماندیان بە ئەفسانانی سیلتی، و دڵبەندی پرووانسال بە ئەڤینی دەرباری و سوارچاکی، دەبێتە سەرچاوەی ئیلهامی ئەو چیرۆکە رۆمانسییانەی دەربارەی ئارتوشا و پیاوەکانی، تریسترام و ئیسولت، و جامی پیرۆز دێنە نووسین، ئەم سێ رەگەز یان بابەتە (کە لە بنەڕەتدا هیچ پەیوەندییەکیان پێکەوە نییە) لە ئەنجامدا چەند بەشێك لە یەك قۆناغ پێك دەهێنن. مێژووی شاهانی بریتانیا-ی بەرهەمی جفری ئاومان موپ (کە بە لاتینییە ١١٤٧)و رۆمانسی بروتوس (دانانی واس ١١٥٥) دوو سەرچاوەی تۆمارکراوی گرنگی رۆمانسێن ئارتوری فەرەنسەوین.

لێرەدا لەوە پتر دەرفەتی باسکردنی رۆمانسێن برتن نییە، تەنیا ئەوەندە دەکرێت ئاماژەیەکی خێرا بۆ کاریگەری قوڵ و برەو و رەواجی بابەتێن بریتانیایی بکرێت، چاسر، مالوری، سپنسر، درایدن، تنی سین، سوین برن، فۆکنر، جوزیف یدیە، لوول، و ئی ئەی رۆبینسن، تەنیا هەندێکن لەو نووسەرانەی کە ئیلهامیان لە ئەفسانانی تریسترام و سوارچاکی دیکەی ئارتوری وەرگرتووە.

**تریسترام و ئیسولت "٢٣":**

باپ برول (١١٥٠)و توماس برتانی (١١٧٠)، شاعیرانی نورمانی ئینگلیستان، چیرۆکی ئەشقی تریسترام و ئیسولت دەگێڕنەوە، کە تەنیا هەندێ کۆپلە و بەشی ئەم بەیتانە ماوەتەوە

ئەم ئەفسانەیە لەڕادەبەدەر شۆرەت و نێوبانگ پەیدا دەکات، و لە سەرانسەری ئەورووپادا بەشێوەی جیاواز دێتە گێڕانەوە و دەکەوێتە سەرزاران، بەنێوبانگترین ریوایەت و گێڕانەوەی ئەم ئەفسانەیە بەمجۆرەیە:

تریسترام لەلایەن مامییەوە، واتە لەلایەن مارك-ی پاشای کورنوال-ەوە رادەسپێردرێت کە بچێ بۆ ئیرلەندا و خوازبێنی شازادەخانم ئیسولت-ی بۆ بکات. ئیسولت و تریسترام لە کاتی گەڕانەوەدا بۆ کورنوال، شەربەتێکی ئەفسوناوی دەخۆنەوە و گیرۆدەی ئەڤینی یەکدی دەبن. مارك بە مەسەلەکە دەزانێ و دەمودەست بۆ تاراوگەیان دەنێرێ، بەلاّم دواتر ئیسولت دەبەخشێت. تریسترام دەچێ بۆ ئارموریکا، لە برتانی و لەوێندەر لەگەڵ ئیسولت-ێکی دیکەدا زەماوەند دەکات. لە ئەنجامدا تریسترام کە زۆر بریندار دەبێ پەیامێك بۆ ئیسولت-ی کورنوالّ دەنێرێ و داوا لە قاسیدەکە دەکات لە کاتی گەڕانەوەدا، ئەگەر سەرکەوتوو بێ، چارۆکەی سپی هەڵبدات، ئیسولت چاو لە هەموو شتێ دەپۆشێت و بەرەو ئارموریکا وەڕێ دەکەوێ، بەلاّم ئیسولت-ی برتانی هەواڵ بە مێردەکەی دەدات کە کەشتییەك بە چارۆکەی رەشەوە دێ و نزیك دەبێتەوە. تریسترام — دڵشکاو، لە داخ و کەسەردا دەمرێت، و ئیسولت-ی کورنوال-یش کە هەواڵی مردنی دڵدارەکەی دەژنەوێ دەمرێت.

**جامی موقەدەس:**

ئەفسانەیەکی بەناوبانگی دیکەی قۆناغی ئارتوری، چیرۆکی جامی موقەدەسە (ئەو قاپەی کە حەزرەتی عیسا لە عیشای رەبانیدا نانی تیا دەخوات، یا ئەو جامەی شەرابی تیا دەخواتەوە). واباوە کە قەشە یوسف-ی رامەیی"٢٤" دەیبات بۆ بریتانیا، بەلاّم پاشان ون دەبێ. ئیدی ئەم جامە بایەخێکی رازئامێز پەیدا دەکات، و منە کردنی جامەکە لەلایەن سوارچاکان و جوامێرانی ئەفسانەییەوە بەجۆرە جیهاد و کۆششێك دەژمێردرێ، لە ئەفسانە کۆنترەکاندا پرسیوال قارەمانی ئەم چیرۆکەیە، لە ئەفسانەکانی دواتردا (تازەتر) گەڵەد"٢٥" دەبێ بە قارەمانی چیرۆکەکە و جێی پرسیوال دەگرێتەوە.

**ماری دوفرانس: (١١٤٧- ١١٨٩)**

ئەم ئافرەتە شاعیر و حیکایەتخوانێکی نورماندییە کە سالاّنێکی زۆری تەمەنی خۆی لە دەرباری هنری دووەم-ی پاشای ئینگلیستاندا بەسەر دەبات، ماری بە چیرۆکە شیعری کورت بەناوبانگە و نزیکەی پانزە بەیتی شیعری هەیە، و سادەیی، روونی، هەڵچوون، سۆز و

سۆزداری، دەرکی قوڵی خۆشەویستی مرۆڤانی، لە تایبەتمەندییەکانی چیرۆکە شیعرییەکانی مارییە. بەناوبانگترین بەیتی ماری بریتییە لە:

١- لانڤال، چیرۆکی سوارچاکێکە کە پەریزادەیەك حەزی لێدەکات، بەڵام سوارچاکەکە رازی ئەم ئەڤینە ئاشکرا دەکات، و پەریزادەکە وازی لێدێنێ.

٢- فرسنە، حیکایەتێکە دەربارەی ژنیکی بەسەبر.

٣- لاولاو، گۆشەیەکە لەسەربەووردی ئەڤینی تریسترام و ئیسولت.

٤- دوو دڵدار، چیرۆکێکی پڕ هەست و سۆزە دەربارەی کوڕێکی گەنج کە لە پێناوی گەیشتن بە کیژە شایەکی خشکۆك دا گیانی خۆی لە دەست دەدات.

ماری، جگە لەو بەرهەمانە سەد و سێ فابیلی"٢٦" لە ژێر سەرناوی زوپەدا لە پاش بەجێماوە.

<u>کرتین دوتروا (١١٣٠- ١١٨٠ی ز):</u>

گەورەترین چیرۆکنووسی فەرەنسییە لە سەدەکانی ناڤیندا. و بۆ یەکەمجار ئەڤینی لانسلو دەرهەق بە مەلیکە گوینڤیر"٢٧" دێنێتە ناو ئەدەبیاتی نووسراوەوە، کرتین بۆ ساڵانێکی زۆر لەلایەن ماری کنتس شامپانییەوە پشتیوانی لێدەکرێت، کرتین حیکایەتخوان و دەروونناسێکی کارامە و بەهرەدارە و شێوازێکی سادە و دڵگیر و جوانی هەیە، کرتین پێنج بەیتی شیعری لە پاش بەجێماوە: ئیرك، لانسلو، کلیجە، یڤێن، و پرسیوال.

**رویردو بورو (١١٧٠- ١٢١٢):**

ئەم نووسەرە خەلیفە و جێگری کرتین-ە، یەکێك لە بەرهەمە هەرە بەناوبانگەکانی بەیتێکی سێ بەشی ئارتوری-یە (١٢١٠)، ئەم بەرهەمە لە سێ چیرۆك پێکهاتووە:

١- یوسف-ی رامەیی یا جامی مقەدەسی گەورە، کە چیرۆکی کۆنی جامەکە دەگێڕێتەوە.

٢- میرلین، کاراکتەری سەرەکی ئەم چیرۆکە شیعرییە بابایەکی سیحر بازە.

٣- پرسیوال، کە دۆزینەوەی جامەکە و کۆتایی جیهانی ئەفسانەی ئارتوری دەگێڕێتەوە و باس دەکات.

**٤- رۆمانسێن سەرکێشی:**

ئەو بەیتە بە رەگەز رۆژهەڵاتی و چیرۆکە کورتانە (کە زۆر ئەستەمە بتوانرێ لە خانەی رۆمانس دا دابنرێن) دەگرێتەوە کەتیمە و ناوەڕۆکیان لە دەڤەر و وڵاتانی رۆژئاواییەوە وەرگرتووە. ئەم رۆمانسانە ئیلهامیان لە بەیتەکانی شانسون دوژست-ی سەدەکانی دوازدە تا پانزدەیەم وەرگرتووە و لاسایی ئەو بەیتانەیان (منظومە) کردووەتەوە.

تایبەتمەندی و شەقلی سەرەکی ئەم رۆمانسانە بریتییە لە زاڵی لایەنی رۆمانتیکی، و پڕن لە رووداوانی نائاسایی و سەیر، و ئەڤینداری ئاگرین و سوارچاکی و جوامێری.

"فلوروبلانشفلور" (سەدەی دوانزەیەم):

ناوەڕۆکی ئەم بەیتە بریتییە لە واریقاتی ئەڤینداری نێوان دوو دڵدار: فلور، کیژە مەسیحییەك بە نێوی بلانشفلور، لە یەخسیری لە بابیل رزگار دەکات، جووتە ئاشق بۆ ئەسپانیا دەگەڕێنەوە، فلور لەبەر خاتری بلانشفلور دەبێ بە مەسیحی و واریقاتەکە کۆتایی دێت.

"ئوکاسن و نیکولت" (سەدەی دوانزەیەم):

ئەم بەرهەمە چیرۆکی ئەڤینداری سەدەکانی ناڤینە و لەڕووی پێکهاتەی پەخشانی و شیعرییەوە بێ هاوتایە. ئەم چیرۆکە بابەتێکی خەیاڵییە و بونیادێکی سست و لاوازی هەیە. رووداوەکان دوا بەدوای یەکدی دێن بێ ئەوەی هیچ پەیوەندییەکی لۆجیکی پێکیانەوە ببەستێ، بەڵام لەڕووی دەربڕین و نیشاندانی ئەڤینێکی رۆمانتیکییەوە کەم چیرۆك هەیە بیگاتێ. قارەمانی چیرۆکەکە لە پێناوی ئەڤیندا هەموو شتێك فیدا دەکات، و نیکولت، بە گوێرەی داب و نەریتی ئەڤینی دەرباری، بە حوسن و رەزای خۆی تەسلیمی ئەو دەبێت، ناوەڕۆکی چیرۆکەکە بەمجۆرەیە: کونت گارن دوبیوکر کەپێی وایە نیکولت لە چینی هەژارانە نایەڵێ ئوکاسن-ی کوڕی بیخوازێ، بۆیە جووتە دڵدار بە ناچاری رێگەی رەڤین دەگرنەبەر و رووبەڕووی زۆر رووداوی باوەڕ نەکردەنی دەبنەوە. سەرەنجام کونت گارن دەمرێت، ئوکاسن پەی بەوە دەبات کە نیکلولت کیژە پاشایە و زەماوەندی دەگەڵ دا دەکات.

**واریقاتنامەکان:**

مێژووی بنەڕەتی فەرەنسا تا نیوەی دووەمی سەدەی دوازدەیەم بە زمانی خۆماڵی نەنووسراوەتەوە. هەندێ رووداوێن ناوچەیی و نەتەوەیی لەلایەن کەسانی ئەهلی کلێساوە بە لاتینی بۆ توێژەرانی زانستی دەنووسرێنەوە، بەڵام جەماوەری خەڵکی فەرەنسا هیچ سەرچاوەیەکیان لەبەر دەستدا نابێ، تەنیا ئەو رووداو و واریقاتانە نەبێ کە بەشێوەیەکی پەراگەندە لە بەیتەکانی شانسون دوژستدا ئاماژەیان بۆ کراوە. بە هەر حاڵ لە ساڵی ١١٥٠ بە دواوە، واریقاتنووسان و مێژوونووسان هەندێ بەرهەم بە شیعر و پەخشان دادەنەن کە بەرە بەرە ژمارەیان زیاد دەکات.

واریقاتنامە شیعرییەکان:

واس (١١١٩- ١١٧٥):

بەناوبانگترین شاعیری واری واریقاتی شیعرییە، لە ساڵی ١١٧٠دا رۆمانسی بروتوس، یان سەرکەوتنی برتونەکان-ی لە قاڵبی شیعری هەشت هیجاییدا هۆنیوەتەوە کە باسی رەگ و رەچەڵەك و مێژووی برتونەکان دەکات.

بەرهەمێکی دیکەی واس بریتییە لە رۆمانس-ی رو، یان سەرکەوتنی نورمانەکان (ئەم بەرهەمە تەواو نەبووبوو پاشان لەلایەن بنوا دوسنت- مورەوە تەواو کراوە) کە باسی مێژووی کۆنی نورمانەکان و نورمانانی ئینگلیستان دەکات، ئەم بەرهەمە لەڕاستیدا وەرگێڕانێکی ئازادی (مێژووی شاهانی بریتانیا)یە، کە لەلایەن جفری ئاومان موپ-ەوە دانراوە.

واریقاتنامە پەخشانییەکان:

ژوفروادو ویلا رودوین (١١٥٠- ١٢١٨) یەکەمین نووسەری دیار و بەرجەستەی مێژوو بە پەخشان نووسراوی فەرەنسایە. ئەم نووسەرە لە کتێبە بەناوبانگەکەی خۆیدا (فەتحی قوستەنتەنیە)دا باسی ئەوە دەکات کە چۆن چوارەمین جەنگی چەلیپایی لە ئارمانج و مەبەستی خۆی، واتە گرتنی بەیتول مەقدس، دوور دەکەوێتەوە و شێوەی لەشکرکێشی بۆ سەر قەوستەنتەنیە وەردەگرێت، گرینگی ئەم واریقاتنامەیە پتر لە شێوازە پەخشانییە روون و لۆجیکی و رەوانەکەیدایە کە بە سەر مەشقی پەخشانی نوێی فەرەنسی دەژمێردرێ. ویلاردوین، لە تۆمارکردنی مێژووەکان و شرۆڤەی مێژوویی رووداوەکاندا ورد و جێگەی متمانەیە، بەڵام لە تەفسیر و راڤەی هۆکارەکاندا زۆر سەرکەتوو نییە.

جان دو جوینڤیل (١٢٢٤- ١٣١٧):

مێژوونووسی فەرەنسی و شیرەتکاری سن ملویس-ە. لە ساڵی ١٣٠٤دا ژیاننامەی سن لویس دەنووسێت کە گێڕانەوەیەکی بێ سەروبەر و تەژی پروپاگەندە و بانگەشەی بێ بنج و بناوان-ە، بەڵام لەبەر ئەوەی وێنەیەکی زیندووی ژیانە لە فەرەنسای سەدەی سیانزەیەمدا، بەسەرچاوەیەکی بەنرخ و شایستە دەژمێردرێ، لەم ژیاننامەیەدا هەندێ جاریش هەندێ چمکی ژیانی نووسەریش، بە تایبەتی لە بەرانبەر سن لویسدا دێتە دەربڕین و وێنەگرتن.

جان فرواسار (١٣٣٣- ١٤١٠):

گەورەترین واریقاتنووسی فەرەنسییە لە سەدەکانی ناڤیندا، لە دەوروبەی ساڵی ١٤٠٥دا کتێبە چوار بەرگییەکەی خۆی (واریقاتنامان) تەواو دەکات کە بریتییە لە مێژوو و واریقاتی

فەرەنسا، ئینگلیستان، ئەسپانیا، برتانی، گاسکونی "٢٨"، فلاندر "٢٩"، و هەندێ دەڤەری دیکە. پێدەچێت ئەم واریقاتنامانە بە مەبەستی تۆمارکردنی فتوحاتە گەورەکانی لەشکریانی فەرەنسە و ئینگلیستان لە ماوەی سەدەی چواردەیەمدا نووسرابن، بەلاّم لەڕاستیدا ئەم بەرهەمە میژووی ئەورووپای رۆژئاوای لە ساڵی ١٣٢٥ەوە تا ساڵی ١٤٠٠ی ز دەگرێتە خۆ.

فرواسار لە دەربڕین و تۆمارکردنی رووداوەکاندا بێلایەن نییە و هەندێ جاریش تووشی لادان و هەڵە و خزین دەبێ. هەمیشە لایەنگری فیوداڵانە و رەمەکی خەڵکی بە کەم و نزم دەزانێ و ستایشی ژیان و شکۆی دەربارى دەکات. هەروەها بە لەزەتێکی زۆرەوە وەسفی شمشێربازی، جەنگ، دیمەنان، سوارچاکانی زرێپۆش، و خانمانی ناسك و جوان دەکات، فرواسار جگە لە واریقاتنامەکان کە بە (دوا غەزەلی سوارچاکی) بەناوبانگە، شیعری زۆریشی نووسیوە.

فیلیپ دوکومین (١٤٤٧- ١٥١١):

یەکەمین میژوونووسی نوێخوازی فەرەنسایە. فیلیپ هزرڤانێکی رەخنەگرە و پێی وایە میژوو دەبێ فەلسەفەیەکی رەسەنی هەبێ، بۆیە هەمیشە هۆکار و ئەنجامەکانی خستوەتە بەر باس و وردەبینی لێکۆڵینەوەوە. کتێبە بەنێوبانگەکەی (بیرەوەرییان- ١٥٠٠) بریتییە لە میژوویەکی گشتی و رووداوەکانی ساڵانی ١٤٦٤- ١٤٨٣و ١٤٩٤- ١٤٩٥)ی فەرەنسا لە خۆدەگرێت.

## هۆزانێن لیریکی

### هۆزانێن لیریکی کۆنی فەرەنسای باکووری:

لە سەدەی شەشەمدا لە مەجلیسی وەعز و ئامۆژگاریدا، گەندەڵی شیعری لیریکی فەرەنسای باکووری، بە هۆی بێهودەیی و سەرچاوە و بناوانی کوفرئامێزییەوە دەخرێتەبەر رەخنە و نارەزایی. شیعری لیریکی لە سەدەی شەشەمەوە لە فەرەنسای باکووریدا گەشە دەکات و دەبوژێتەوە، و بە زۆری بە دەم سەما و رەقسەوە بە ئاوازەوە دەگوترێ، لێ ئەم شیعرانە فەوتاون و ژمارەیەکی زۆر کەمیان لێ ماوەتەوە. کۆنترین میژووی هۆزانێن لیریکی بۆ سەرەتاکانی سەدەی دوانزەیەم دەگەڕێتەوە. ئەم شیعرانە دەکرێن بە چوار گرووپ و بەشەوە:

١- گۆرانی کار، ئەو شیعرە نیمچە چیرۆکیانەن کە ژنان بە دەم رستن و چنینەوە لەبەر خۆوە بە ئاوازەوە گوتوویانن.

٢- سترانی ژنانی خەمگین، بریتییە لە سکاڵا و گازاندەی ژنێکی گەنج لە هاوسەرەکەی.

٣- گۆرانی شوانکارەیی، نێوەرۆکی ئەم شیعرانە بریتییە لە ئەشقی سوارچاکێکی لاو دەرهەق بە کیژێکی شوانکارە.

٤- سترانی جەنگی چەلیپایی، کە بە بۆنەی شەرەکانی چەلیپییەوە گوتراون- جارێ سوارچاکێك لە پێناوی عیسادا دەچێ بۆ شەر، گاڤێ سوارچاکێك بەرەو ولاتی پیرۆز دەروات و خەمی جودایی مەحبوبە دەگێرێتەوە، و هەندێ جاریش کیژێکی گەنج خەم و نیگەرانی خوی بە هۆی رۆییشتنی دلدارەکەیەوە بۆ شەرەکانی چەلیپی دەگێرێتەوە.

<u>ترۆبادورەکان و تروڤەرەکان( سەدەکانی ١١-١٣):</u>

کاریگەری رۆشنبیری و شارستانی رومیان و ساراسنەکان بەسەر دەڤەری باشووری فەرەنسادا (پرووانسال) قولتر و زیاتر بوو تا لەسەر دەڤەری باکوور. بۆیە کۆمەلگەی فیودالی لە باشووردا خەملیوتر بوو، و سوارچاکی لە شیعری لیریکیدا رەنگی دایەوە و بەرجەستەبوو. نەجیمزادە و فیودالان حەزیان چووە سەر ترۆبادورەکان و کەسانێکی زۆر کەوتنە شیعر گوتن. ترۆبادورەکان کە بە شاعیرانی لیریکی دەژمێردرێن، نێوەرۆکی بنەرەتی شیعرەکانیان بریتی بوو لە ئەڤینی دەرباری"[٣٠]. ئەمرۆ دەتوانین ناوی پتر لە چوارسەد شاعیری ترۆبادور، ئەوانەی کە لە سالانی ١٠٩٠- ١٢٩٢دا ژیاون بەرین کە بەناوبانگترینیان ئەمانەن:

گیوم دوپواتیە"[٣١]، ژوڤر رودل"[٣٢]، برناردوڤانتادور"[٣٣]، گیرودوبورنی"[٣٤]، و برتران دوبورن"[٣٥].

کاریگەری شەرەکانی چەلیپایی و زەماوەندی ئالیونور دو ئاکتین لەگەل لویسی هەفتەمدا (١١٣٧) بووە مایەی پەرەسەندنی رۆشنبیریی پرووانسال لە فەرەنسای باکووریدا.

لەوێندەر شاعیرانی تروڤەر، یان شاعیران و ئاشقانی پیشەیی نێوەرۆك و شێوازی تروبادورەکانیان هەلبژارد. تروڤەرەکان سادەیی و ناسکی تەبع و تەبیعەتی باکوورییەکانیان نەبوو، و داب و نەریتی ئەڤینی دەرباری لە شیعری ئەواندا وردتر و جدی تر رەنگی داوەتەوە و بەرجەستە بووە، ئەمەش ناوی هەندێ لە بەناوبانگترین شاعیرانی تروڤەرە: کرتین دوتروا، جان بودل"[٣٦]، شاتلن دوکسی"[٣٧]، و تیبودوشامپانی"[٣٨].

<u>شاعیرانی لیریکی سەدەکانی چواردەیەم و پانزەیەم:</u>

شیعری لیریکی فەرەنسی لە نیوەی دووەمی سەدەکانی ناڤینەوە وەکو سەدەکانی پێشووتر پڕ بووە لە سنعەتبازی و تەکەلوف، قالب و فۆرمە شیعرییەکانیش ئالۆزتر و دژوارتر دەبێ.

گیوم دوماشو (١٣٠٥- ١٣٧٧):
ناوبانگی ماشۆ پتر بە شێوازی شیعرەکانییەوەیە تا بە سۆز و گوداز و ناوەڕۆکیانەوە. شانازی بە ئاڵۆزی و سەختی شیعر و بەیتەکانییەوە دەکات. چیرۆك و حیکایەتی رەمزی (بەیتی سەرچاوەی ئاشق)ی ماشۆ بووە بەسەرچاوەی ئیلهامی چاسر لە دانانی (کتێبی دوشس)دا.

ئوستاش دیشان (١٣٤٠- ١٤٠٧):
خاوەنی پتر لە هەشتا هەزار بەیتە شیعرە. جگە لە هۆزانێن غەزەل و لیریکی، زۆر قەسیدە و هۆنراوەی تەنز ئامێز و مێژوویی لە پاش بەجێماوە، زۆربەی شیعرەکانی دیشان هۆزانێن ئەفسانەیی و بەیتی کورت کورتن. ئەویش وەکو ماشو کاری لە چاسر کردووە.

کریستین دو پیزان (١٣٦٣- ١٤٣١):
ئەم ئافرەتە ئەجیمزادەیە لە ئیتالیا لەدایکبووە و لە بیست و پێنج ساڵیدا و بەسێ منداڵەوە بێوەژن دەکەوێ و بۆ بەڕێوەبردنی ژیان و بژێوی، نووسەری دەکات بە پیشە. یەکێك لە بەرهەمە نێودارەکانی کریستین (کتێبی سێ فەزیلەت)ە نامەیەکە دەربارەی ئامۆژگاری و پەروەردەی ژنان، کریستین لەم بەرهەمەدا بە توندی رەخنە لە دید و بۆچوونە تەنزئامێزەکانی جان دومون"٣٩" و گەڕکردنی وی بە ژنان کە لە بەشی دووەمی چیرۆکی گوڵەباخدا بەرجەستەی کردووە، دەگرێت، کریستین کۆمەڵێك هۆنراوەی ناسك و راستگۆیانەشی هەیە کە رەنگدانەوەی هەست و سۆزی خودی شاعیرن.

ئالن شارتیە (١٣٨٥- ١٤٣٣):
شارتیە کە بە باوکی زمانپاراوی لە زمانی فەڕەنسیدا ناسراوە، زۆر هۆنراوە و هۆزانی پوختە و ئاوازەی داناوە، شاعیرانی کلاسیکی لاتینی دەناسێت و هەوڵدەدات بە فەڕەنسییەکانیان بناسێنێت. شارتیە نیشتیمانپەروەرێکی دڵسۆز بووە و لە زۆر شیعردا فەڕەنسا بۆ ئەوە هاندەدات کە لە ناوەوە خۆی چاك بکات و ئینگلیزەکان بۆ ئەوبەری کەناڵی مانش وەدەربنێ.

شارل دو ئورلیان (١٣٩١- ١٤٦٥):
باوکی لویسی دوانزەیەمە و لە خانەدانانی شاهانی فەڕەنسایە، ٢٥ ساڵی تەمەنی لە زیندانانی ئینگلیزەکاندا دەباتە سەر و لەو ماوەیەدا خۆی بە دانانی (کتێبی زیندان)ەوە مژول دەکات. ئەم بەیتە زۆر وشك و رەق و دەستکرد و خاڵی لە هزر و هەستە، بەڵام وەستایی لە شێوەی مامەڵە کردنی دەگەڵ بابەتەکەدا، شەقڵێکی سادەیی سروشتی بە هۆزانەکانی دەبەخشێت.

## ئەدەبیاتی شاری

لەگەڵ دارووخانی فیودالیزم و رەواج و رەونەقی بازرگانی و پیشەسازیدا، شارەکان دەوڵەمەند و بەهێز دەبن و بۆرژوازی (سێیەمین سیستەمی سیاسی تەقلیدی) بەرە بەرە بایەخی خۆی پەیدا دەکات و کاریگەری خۆی لەرووی شارستانی و هزرییەوە دەنوێنێ. و لە ماوەی سەدەی سیانزەیەمدا قەبارەی بەرهەمی ئەدەبیاتی بورژوازی تەواو زیاد دەبێ. ئەم بەرهەمانە تارادەیەکی زۆر لە شەقڵی بەرهەمێن سوارچاکی و رۆمانتیزمی ئەدەبیاتی دەرباری دوورن، و لە بری ئەوە گیانی شادی و شۆخی و ریشخەنی و تەنزی ناسکی بەسەردا زاڵە، و لە واقیع و ناوەزگەراییەوە هەڵدەقوڵێ.

خەڵکی و دام و دەزگا و ئەو هزر و بیرانەی کە جاران بەرێزەوە سەیر دەکران، لە ئەدەبیاتی بۆرژوازیدا گاڵتەیان پێدەکرێ و بابەتی رەخنەن، ژن، کڵێسا و سوارچاکیش دەبن بە بابەتی دڵخوازی رەخنەگران.

ژانرە گرنگەکانی ئەدەبیاتی بورژوازی بریتین لە: تەنز، شانۆنامە، و هۆزانێن لیریکی، فێرکاری و تەمسیلی(مەجازی).

### تەنز

رِوتبوف (١٢٣٠- ١٢٨٥):

ئاشق و شایەر، قومارباز، بە تواناترین شاعیری چەرخی خۆی، و گەورە ترین نووسەری فەرەنسی سەدەی سیانزەیەمە، زانیارییەکی زۆر کەم لە بارەیەوە هەیە. لە بورگوندی یا پاریس هاتۆتە دنیاوە، و بە هەژاری و کلۆڵی ژیاوە، بەرهەمەکانی دەکرێن بە سێ بەشەوە:

بەیتێن شەخسی و کۆمیدی:

لەم بەشەدا ئەو شیعرە تەنزئامێزانە کۆکراونەتەوە کە باسی گلەیی و سکاڵای شاعیر دەکەن لە نەگبەتی و بەدبەختی (وەکو دەستکورتی روتبوف). شیعرەکانی دیکە پڕ کینایەترن و تەوس بەریاکاری و هەندێ حوکمی مەزهەبی دەکەن، تەنزی ناو ئەم بەیتانە زۆر زیندوو و پرشنگدارە و دوورە لە پێکەنینۆك و شۆخیان. هەندێ لە بەیتەکانی ئەم بەشە دەچنە خانەی فابیلانەوە.

بەیتێن بۆنەیی:

ئەم بەیتانە کە زۆر لەبەیتەکانی بەشی یەکەم گەورەتر و سەنگین ترن. بریتین لە بەرەڤانیانی شاعیر و لاواندنەوەی گەورە پیاوان. هەندێکیانیش شرۆڤە و راڤەی تەنزئامێزی رووداوەکانی رۆژن.

بەیتێن خواناسی:

ئەم بەیتانە ژیانی روحانیان، ئیعترافاتی شەخسی و نمایشی پەڕجووی تیوفیل لەخۆ دەگرن.

فابیلو:

لە فابیلودا گیانی شادی و سوعبەتچیاتی بە روونی دیارە. فابیلۆ چیرۆکێکی شیعرییە (بە زۆری بەیتەکانی هەشت هیجایی یان بڕگەیین) کە زۆربەی هەرە زۆری پێکەنیناوی و کۆمیدییە و رووداوانی واقیعی یان ئەو رووداوانەی لەگوینە لە ژیاندا روو بدەن، دەگێڕێتەوە.

فابیلو لە ڕێگەی دڕکە و توانج پۆشییەوە گاڵتە بە هەموو توێژەکانی کۆمەڵگە دەکات، بەتایبەتی ژنان، ئەشراف و کەشیشان. گەلێك لەم چیرۆکانە ناشیرین و تەنانەت بێ پەردەن، و تەژی نێرەنگ و فریوی سوعبەتامێزن.

نزیکەی دوو سەد فابیلوی فەرەنسی لەبەر دەستدان کە ژمارەی بەیتەکانیان لە نێوان سی تا سەدان بەیتی جیاوازن، زۆربەی هەرە زۆریان بێ خاوەنن، یا دراونەتە پاڵ نووسەرانێك کە جگە لە ناوەکانیان چ شتێکی تریان دیار نییە، مێژووی دانان و هۆندنەوەی ئەم چیرۆکانە بۆ دەوروبەری ساڵانی ١١٥٠- ١٣٤٠ دەگەڕێتەوە.

زۆر راوبۆچوونی جیاواز دەربارەی بایەخ و گرنگی فابیلویان هاتۆتە دەربڕین. پرۆفیسۆر رایت پێی وایە بایەخی ئەم فابیلویانە لەو دید و بۆچوونە واقیعیانەدایە کە تیایانە، هەندێ لە رەخنەگرانی دیکە ئەم چیرۆکانە بە وێنەیەکی گاڵتە نامێزی داب و نەریتی خەڵکی سەدەکانی دوانزەیەم و سیانزەیەم دەزانن.

بە هەر حاڵ بایەخ و گرنگی ئەم چیرۆکانە هەرچییەك بێ، زۆر بە قوڵی کاریان کردۆتە سەر نووسەرانی وەکو بوکاچو، چاسر، مولیر، لافونتین و زۆر نووسەری دیکە.

پزیشکی دێهاتی:

مولیر، بۆ نووسینی چیرۆکی "پزیشکی ناچاری" راستەوخۆ ئیلهامی لە (پزیشکی دێهاتی) وەرگرتووە. ژنێکی دێهاتی کە لە دەستی تەمێکاری مێردەکەی بێ تاقەت دەبێ و خەبەر بە دوو پەیکی دەربار دەدات کە هاوسەرەکەی دکتۆرێکی بەناوبانگە، کابرای دێهاتی بۆ دەربار بانگ دەکرێ تا ئێسقانی ماسی لە گەروی شازادە دەربێنێ. رەفتار و ئەتواری سەیر و سەمەرەی کابرای دێهاتی، بە جۆرێ شازادە دەخاتە پێکەنین کە ئێسقانەکە لە گەرووی دەردەپەڕێ، لە دوای ئەم رووداوە، خەڵکی بە مەبەستی چارەسەر لە دەوری کابرای گوندی خڕ دەبنەوە، و ئەویش کە تیا دەمێنێ و نازانێ چی بکات، پێشنیاز دەکات کە تاقە مەرجی ئەو

بۆ چارەسەر کردنیان ، سوتاندنی دەغەزارترین نەخۆشە. کە گوێیان لەم مەرجە دەبێ هەموو ژێوان دەبنەوە و دەڵێن کە چاك بوونەوە.

کەو:

ژنێکی زۆرخۆر هەموو ئەو کەوانە دەخوات کە هاوسەرەکەی بۆ خۆی وەلاوەی ناون، ئیدی بۆ دامرکاندنەوەی توڕەیی مێردەکەی پەنا وەبەر یەکێك لەو فێڵە هەمیشەییانە دەبات کە لەم بابەتە چیرۆکانەدا دەخرێتە بەردەم ژنان.

فابیل و تەنزان بە زمانی گیانلەبەرانەوە:

لە سەدەکانی ناڤیندا فابیل بە هەموارترین و گونجاوترین چیرۆکی فێرکاری دەژمێردرا، لەم قۆناغەدا فابیلەکانی (چیرۆك) فیدروس "٤٠" ، هیزۆپ "٤١" ، و ناڤیانوس "٤٢" ، خوێنەری یەجگار زۆریان هەبوو، لە فەرەنسادا بە چاولێکەری چیرۆکەکانی هیزۆپ، نەقلّ و حیکایەتێکی یەجگار زۆر دادەنرێ. هەندێ لەم حیکایەتانە زیاتر لایەنی تەنزیان لەخۆ گرتبوو تالایەنی فێرکاری.

"حیکایەتی رێوی" (رۆمانی رینارد):

باوترین بەیتی سەدەکانی ناڤینە بەزمانی گیانلەبەرانەوە. ئەم بەرهەمە تەنیا یەك نەقلّ (حیکایەت) نییە، بەڵکو کۆمەڵە حیکایەتێکی چوار قۆناغییە، و بریتییە لە ٢٥ بەیت، کەلە لایەن نووسەرانی جیاوازەوە و لە ساڵانێکی دووروودرێژدا نووسراون. هەوەڵین بەیتەکان (١١٧٤)، مایەی سەرگەرمی و فەنبازی بوو، لەگەڵ زیاد بوونی ژمارەی ئەم بەیتانەدا تەنز و تەمسیلی هۆنراوەکان چڕتر دەبوو، بە جۆرێ کە لە دوا بەیتەکاندا، گیانلەبەران وەکو نمایندەی نموونان (وەکو فرایرەکان "٤٣" ) یا تاکی تایبەتی دەردەکەوتن، بەیتەکانی قۆناغی یەکەم (رناردی کۆن) هەندێ چیرۆکی هەمە جۆر بە زمانی گیانلەبەرانەوە دەگێڕنەوە وەکو رناری رێوی، شێری نەجیب، کەڵەشێری پاڵەوان، و.... هتد، ئەم گیانلەبەرانە لەو چیرۆکانەدا توانای بیرکردنەوە و پەیڤینیان هەیە.

قۆناغی دووەم، واتە تاج دانانی رنار، ١٢٦٠ی ز) تانە و تەشەر لە گرووپانی کاتولیکی رومی فرانسیسیان و دومینیکیان دەدات و بەرتەنزیان دەدات. قۆناغی سێیەم (رناردی نوێ، لە ساڵی ١٢٨٨ نووسراوە) لەم قۆناغەدا گیانلەبەران لەڕاستیدا لاسایی سوارچاکانی سەدەکانی ناڤین دەکەنەوە: زرێ لەبەر دەکەن، سواری ئەسپ دەبن، بە چەك شەڕ دەکەن و زۆر کاری دیکەی لەم جۆرە، دیارە لاسایی کردنەوەی زۆر، ئەم حیکایەتانەی لە فۆرم و شەکڵ خستووە، واتە شێوە و قاڵبی ئەم حیکایەتانەی تەواو شێواندووە. قۆناغی چوارەم (رناری حیلەباز،

١٣٣٥) بریتییە لە کۆمەڵە حیکایەتێکی درێژ، کە یەکێك لە نوسخە دەستنووسەکان گەییوەتە ٣٢ هەزار بەیت. ئەم حیکایەتە بەڕواڵەت لاسایی کاری و داشۆرین ئامێزانە لە باس و خواسی ئامۆژگاری ئەخلاقی بەدەرنین. لە هەندێ نوسخەدا فابیلۆ و رۆمانسانی سەرگەرم کەر لە نێو بەیتەکاندا بەرچاو دەکەون، و هەندێ جاریش ئاماژەی توانج پۆشیانە بۆ مەینەتییەکانی جەماوەری خەڵك دەکرێ.

فوڤل (١٣١٠- ١٣١٤):

جەرڤو دوبوی نورمانی لەم بەیتە مەجازییە دوو بەشییەدا لاسایی قوناغی سێیەمی (واتە رناری نوێ) کردووەتەوە. فوڤل ئەسپێکە ناوەکەی لە یەکەمین شەش پیتی وشەیەکی فەرەنسی هاو واتای: زمانلوسی، چاوچنۆکی، هەرزەیی، بێکاری، بەغیلی، و ترسنۆکی، وەرگیراوە: ئەم ئەسپە رەمزی هەموو خراپییەکانە، بەتایبەتی درۆ، لە یەکەمین بەشی بەیتەکەدا هەموو چینە جیاوازەکان —شاهان، ئەشراف، روحانیان، و تەنانەت پاپاش- بۆ دڵخۆشی ئەسپەکە دەکەونە زمانلوسی و ماستاو ساردکردنەوە و خۆ رەپێش خستن و خۆشیرینکردن، لە بەشی دووەمدا پێشنیازی زەماوەندی فوڤل لەگەڵ (ئیقبال)دا رەفز دەکرێ، و ئەویش دەگەڵ (خۆپەسندێك)دا زەماوەند دەکات و زۆری پێناچێت کە منالەکانیان دەبنە مایەی سەریەشە و گێرمە و کێشەی دنیا، ئەم بەیتە بە پێشبینی سەرەنجامی فوڤل و هەموو خراپییەکانی کۆتایی دێت.

## هۆزانێن مەجازی و فێرکاری

خەڵکی سەدەکانی ناڤین لەڕادەبەدەر حەزیان لە مەجاز بووە، لەم سەردەمەدا جگە لە چیرۆکی گیانلەبەران، زۆر بەیتیش (چیرۆکی شیعری) دێتە ئاراوە کە بیر و خەیاڵی رووت لە چوارچێوە و قاڵبی چیرۆکێن مەجازی و تەمسیلییەوە دەگێڕنەوە ، دیارە مەبەستی سەرەکی شاعیرش چەسپاندنی هەندێ پرەنسیپی ئەخلاقی بووە، واتە پەند و ئامۆژگاری ئەخلاقی بووە، کڵێساش زۆر بە گەرمی ئەو جۆرە ئەدەبیاتەی پەسند کردووە و، تەنانەت چاوپۆشی لە ئەفسانانی کوفرئامێزیش کردووە و بە دەربڕینێکی مەجازی هەواڵەکانی کتێبی مقەدەسی لێك داوەتەوە. لە سەرەتاکانی سەدەی چواردەیەمدا (میتامۆرفوس)ی ئوڤید تەرجەمە دەکرێت و ستایشێکی زۆر دەربارەی کتێبی (فابیلەکانی ئوڤیدی گەورە) دەنووسرێت. لەم قۆناغەدا، باوترین بەرهەم چیرۆکی گوڵەباخ بووە.

چیرۆکی گوڵەباخ:

ئەم رۆمانسە شیعرییە بە یەکێك لە بەرهەمە هەرە گرنگ و کاریگەرەکانی سەدەکانی ناڤین دەژمێردرێ، چاسر بەشێکی لەم بەیتە هەڵبژاردووە و بۆ زمانی ئینگلیزی ناوەڕاستی وەرگێڕاوە، ئەم رۆمانسە دوو بەشە، و هەر بەشێکی لەلایەن شاعیرێکی جیاوە نووسراوە. ئەم دوو بەشە لەڕووی شێواز و گیانی چیرۆکڤانییەوە زۆر جیاوازن.

بەشی یەکەم (٤٠٥٨ بەیتە) لە ساڵی ١٢٣٠ دا لەلایەن گیوم دولوریس"٤٤"ەوە نووسراوە، لوریس، چیرۆکی رەمزی، لەڕادەبەدەر رۆمانێکی ئەڤینداری نێوان سوارچاکێك و کیژێکی جوان (بەناوی روز) دەگێڕێتەوە. روز لە باخی ئەشقدا ئاکنجییە، و دیوارێك ئەو لە نێگەرانی و مەترسییەکانی جیهانی دەرەوە وەکو پیری، بەغیلی، بێ کاری، ئەفرەت و ئەو جۆرە شتانە دەپارێزێ، رۆژێ سوارچاکێك خۆی بە باخی نێوبراودا دەکات، و بەر تیرێکی زێڕینی کوپید"٤٥" دەکەوێ و ئاشقی روز دەبێ. ئیدی دەکەوێتە هەوڵ و تەقەللای گەییشتن بە دلبەرەکەی. بەخت بەپیرییەوە دێ، بەڵام خەتەر، شەرم، ترس، تورەیی و تۆمەت لە هەموو شوێنێ رێی لێدەگرن. لە ئەنجامدا سوارچاکی ئاشق بە دلبەر دەگات، بەڵام تۆمەت ئەو جووتە دەبینێ و حاڵ و حیکایەتەکە بۆ بەغیلی دەگێڕێتەوە. بەغیلی، بەخت حەپس دەکات و دیوارێك لە دەوری روز دروست دەکات، و سوارچاکی ئەڤیندار لەگەڵ بەختی رەشی خۆیدا لەو دیو دیوارەکە دەمێنێتەوە.

کە چیرۆکەکە دەگاتە ئێرە دوو لوریس بە سەریا دەمرێت. ئەگەر مردن مەودای دابایە، بێگومان چیرۆکەکە بە شێوەیەکی دیکە کۆتایی دەهات، رەنگە کابرای سوارچاك بەخت-ی لە زیندان رزگار بکردایە و بە خۆیشی بە ئاواتی خۆی بگەیشتایە.

بەشی دووەم (نزیکەی ١٨ هەزار بەیتە) لە ساڵی ١٢٧٧دا لەلایەن جان دو مون"٤٦"-ەوە نووسراوە. ئەم نووسەرە، هەر هەموو ئەو شتانە رەت دەکاتەوە کە دولوریس بە پیرۆزیان لە قەڵەم دەدات. لە کاتێکدا کە شاعیرێکی خەیاڵپەروەری وەکو گیوم دولوریس، لە زیارەتگەی ژن و ئەڤیندا سەرگەرمی عیبادەتە، ستایشی سوارچاکی دەکات، رێز و حورمەتی کڵێسا و روحانیان دەگرێ، و ستایشی ئەجیمزادەکان دەکات، کەچی جان دوو مون، بابایەکی ریالیستی رەشبینە، ژن، داب و ئەریتی سوارچاکی، کڵێسا، روحانیان، و ئەجیمزادەکان بەر تانە و تەشەری جزودار دەدات و بە کەیفی خۆی دایاندەشۆرێ. پەنا وەبەر ئەقڵ و لێکدانەوە دەبات و خەوش و کەم و کورپییەکان لە قاو دەدات و ژن بە گەوج و هەوەسباز دەزانێ، پێی وایە کڵێسا لەڕادەبەدەر پابەندی عیبادەتە، ئەشراف و شاهان خەڵکانێکی خۆپەسندن.

بەشی دووەمی چیرۆکی گوڵەباخ مەیدانێکی بەرینە بۆ خۆنواندن و فەزڵفرۆشی دومون، لەوێوە لە دەرگای فەلسەفە، میتولۆژی، و زانستەکانی سەدەکانی ناڤین دەدا. بە رواڵەت بەشێوەی رێکەوتەکی هەوڵ و تەقەلاکانی ئاشق و دوا تەقەلاکانی روز دەگێڕێتەوە. ئەگەرچی ئەم بەشە لەڕووی ئەدەبییەوە لە بەشی یەکەم لاوازترە، بەڵام ئەنجامگیرییەکانی دومون جوانترن و پڕن لە گیانی کنو کۆیی و تەنز و ئەقڵگەرایی بورژوازی تازە کورە.

## شانۆنامە

شانۆنامەی جدی (تراجیدی)

شانۆنامەی عیبادەتکاری (لیتورجی"٤٧")

شسانۆنامەی جدی لە فەرەنسادا، وەکو یونان، ئەڵمان و ئینگلیستان لە سروودە ئایینییەکانەوە هەڵێنجراوە، هەر چەندە کە عیبادەتی کڵێسا بە زمانی لاتینی ئەنجام دەدرا، بەڵام رەگەزی شانۆییش بایەخێکی زۆری هەبووە. خوێندنەوەی ئینجیل لە قالبی دیالۆگیدا بووە، کە لە هەندێ برگەی تایبەتیدا بە خوێندنی سروود دەهاتە برین. ئیدی بەرە بەرە دیالۆگ و ئاماژە و رەفتار هاتنە ناو موناجات و پاڕانەوەکانەوە. لە ئەنجامدا کەشیشان هەموو چیرۆکەکانی پەیدا بوون و ژیانەوە و رابوونی حەزرەتی عیسایان لە بۆنەکانی کریسمەس و جەژنی پاکدا لەسەر پلەکانی میحرابدا نمایش دەکرد، زمانی ئەم درامایانە لاتینی بوو. ئەم شانۆنامە لیتورجی-یانە شانۆنامەی واقیعی بوونە و، پێدەچێت تا سەرەتاکانی سەدەی دەیەم هەر بەردەوام بووبن.

دوای ماوەیەك کە شانۆنامەکان درێژتر و دیمەنسازی پوختەتر و پێشکەوتووتر دەبێ، شوێنی نمایش کردن دەگوازرێتەوە بۆ ناو حەوشەی کڵێسا و دواتر ئەنجامدانی شانۆنامە دەگوازرێتەوە بۆ دەرەوەی کڵێسا و دەبرێ بۆ حەوشی کاروانسەراکان. هەندێ پەرەگراف و کۆپلەی نەمەزهەبی دێتە ناو شانۆوە، ئەکتەرانی غەیرە کەشیش رۆڵی جۆراوجۆر لە ئەستۆ دەگرن. ئەنجام، لە ئاخر و ئوخری سەدەی یازدەیەمدا، شانۆنامە بە زمانی فەرەنسی ئەنجام دەدرێ.

<u>شانۆنامەی ئادەم (١٢١٥):</u>

ئەمە کۆنترین شانۆنامەی فەرەنسییە. ئەم شانۆنامەیە خۆی لە خۆیدا رەنگدانەوەی پەرەسەندن و پێشکەوتنی شانۆنامەی عیبادەتکارییە (لیتورجی)، واتە شانۆنامەی رەمز و راز (نهێنی) شانۆنامەی ئادەم بە زمانی ئەنگلۆنۆرمانەکانی فەرەنسایە، بەڵام دەرهێنانی

شانۆنامەکە بە لاتینییە. ئەم شانۆنامەیە چیرۆکی کەوتنی ئادەم و حەوا و کوژرانی هابیل بە دەستی قابیل دەگێڕێتەوە، و بە پێشبینی دەرکەوتن و هاتنی مەسیح کۆتایی دێت.

شانۆنامەی راز و نهێنی:

ئەم جۆرە شانۆنامەیە زیاتر رەگی دەچێتەوە سەر چیرۆکەکانی کتێبی موقەدەس و رووداوە مێژووییەکان. واتە رووداوە مێژووییەکان و چیرۆکەکانی کتێبی موقەدەس بابەتی سەرەکی ئەو جۆرە شانۆنامانەن. زۆربەی شانۆنامانی راز و نهێنی، مامەڵە لەگەڵ بابەت و نێوەڕۆکی ئایینیدا دەکەن و هەندێ جاری کەمیش بابەتی نە مەزهەبی بەکار دێنن. نزیکەی شەست شانۆنامەیەکی راز و نهێنی، سەردەمی سەدەی پانزەیەم ماوەتەوە، بەڵام شانۆنامانی کۆنتر لە بەین چوون و نەماون، شانۆنامانی راز و نهێنیی بە ناوەڕۆك ئایینی بەسەر سێ قۆناغدا دابەش دەبێ:

١- قۆناغی سەردەمی کۆن، کە بە شانۆنامەی بەهەشتی عەدەن دەست پێدەکات و تا سەردەمی حوکمڕانی ئوگوستوس تزار دێ.

٢- قۆناغی سەردەمی نوێ، کە لەدایکبوونی حەزرەتی عیسا تا چالاکی یاوەرەکانی پاش مردنی ئەو دەگرێتەوە.

٣- قۆناغی قەدیسان، کە هەر شانۆنامەیەکی ئەم قۆناغە ژیان و مەرگی هەندێ لەو روحانیانە وێنە دەگرێت. زۆربەی شانۆنامانی راز و نهێنی دوور و درێژن و ئەنجامدانیان چەند رۆژێك دەخایەنێ. جگە لەوەی ئەم جۆرە شانۆنامەیە کەم دابێژێك بێ سەروبەر و پەشێوە، و نووسەر بە کەیفی دڵی خۆی ناوەڕۆکی کۆمیدی و نەمەزەبی تێ هەڵکێش دەکات، بە دەگمەن سێ یەکێتییەکەی کات، شوێن و کرداریش رەچاو دەکرێت، بەڵام کەرەستەی دیمەنسازی و جلوبەرگ زۆر وەستایانە ئامادە دەکرێ.

لە سەرەتادا ئەکتەرانی خۆبەخش شانۆنامانی راز-یان ئەنجام دەدا، ئەوجا یەکە و دەزگای تایبەتی پەیدا بوو.

هەندێ جار سەدان ئەکتەر، و جارێك ٥ سەد ئەکتەر، لە یەك شانۆنامەدا بەشدار بوون، لە ساڵی ١٤٠٢دا شارلی شەشەم مۆڵەتی ئەنجامدانی شانۆنامانی راز و نهێنی بە ئەنجوومەنی پاسیون"[٤٩]" بەخشی. قۆناغی شانۆنامانی رازدار لە ساڵی ١٥٤٨دا کۆتایی هات. لەم ساڵەدا نواندنی ئەم جۆرە شانۆنامەیە کە تەواو لە حاڵی داروخان و هەرەسدا بوو قەدەغە کرا.

بەناوبانگترین شانۆنامانی سەر بەخۆی رازدار بریتییە لە:

١- ئازارەکانی مەسیح (١٤٥٠)، لەلایەن ئارنولد گیربان"٥٠"-ەوە نووسراوە کە لە سی و چوار هەزار و پێنج سەد و حەفتا و پێنج بەیتدا ژیانی تەواوی مەسیح بە دەستەوە دەدات.
٢- کرداری پەیامبەران (١٤٥٠) لە نووسینی ئارنولد گیربان و سیمون گیربانە و بریتییە لە ٦٠ هەزار بەیت و پێنج سەد ئەکتەری هەیە.
٣- گەمارۆی ئورلیان (١٤٣٩)، شانۆنامەیەکی نە مەزهەبییە دەربارەی جاندارك.
٤- مێژووی وێرانبوونی تەروادە، نووسینی جاك"٥١" میلە.

شانۆنامەی موعجیزە:

زۆربەی هەرە زۆری شانۆنامانی موعجیزە، موداخەلەی قەدیسان -لە هەموویان زیاتر مریەمی موقەدەس- لە کاروباری مرۆڤانی وێنە دەگرێت. شانۆنامەی پەڕجوو هاوکات لەگەڵ شانۆنامەی رازداردا گەشە دەکات، ئەگەرچی مێژووی نووسخە دەستنووسەکانی شانۆنامەێن موعجیزە لە جۆرە شانۆنامەکانی دی کۆنترە.

زۆربەی شانۆنامانی موعجیزە میلو"٥٢" درامین، و زۆربەی جار گرێی چیرۆکی شانۆنامەکە بە دەرکەوتن و پەیدا بوونی کتوپڕی حەزرەتی مریەم- فریادرەسی غەیبی- دەکرێتەوە. هەروەها مەسەلە مرۆڤانی و واقیعییەکان بایەخی زیاتریان هەیە لە ئەندێشە مەزهەبییەکان. لە شانۆنامەی موعجیزەدا، بە پێچەوانەی شانۆنامانی رازدارەوە، تەنیا پێنج شەش کاراکتەر دەور دەبینن و بەشداری دەکەن.

کۆنترین شانۆنامەی موعجیزە، شانۆنامەی قەدیس نیکولایە (١٢٥٠) کە جان بودل"٥٣" نووسیویەتی. موعجیزەی تیوفیل (١٢٦٠)یش کە لە نووسینی روتبوف-ە یەکێکە لە شانۆنامە هەرە جوانەکانی ئەو مەیدانە و رەنگە کۆنترین چیرۆك بێ دەربارەی پەیمانی نێوان مرۆڤ و شەیتان. گەورەترین کۆمەڵە شانۆنامەی موعجیزات، کۆمەڵەیەکی چل و یەك شانۆییە بە ناوی موعجیزاتی خانمی مە) و دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی چواردەیەم، کۆنترین شانۆنامەی جدی غەیرە مەزهەبی کە بە زمانی فەرەنسی نووسرابێ (مێژووی گریزلدایە (١٣٩٣). ئەم شانۆنامە موعجیزە ئەمەزهەبییە چیرۆکی گریزلدای بە سەبرو کارەساتەکانی وی دەگێڕێتەوە.

شانۆنامەی ئەخلاقی:

ئەم جۆرە شانۆنامەیە پتر کێشمانەکێش و ململانێی نێوان چاکە و خراپە یان شەڕ و خێر دەنوێنێ، شانۆنامەی ئەخلاقی تاسە و کەلکەڵەی خەڵکی سەدەکانی ناڤین بۆ مەجاز بەرجەستە دەکات: کاراکتەران لەم جۆرە شانۆنامەیەدا فەزیلەتی ئەخلاقی و گوناهانی شەیتانی بەرجەستە

دەکەن. شانۆنامەی ئەخلاقی راپەڕین و بزوتنەوەیەکی دیارە لە رەوتی پەرەسەندنی شانۆنامەی فەرەنسیدا، و شان بە شانی بەرجەستەکردنی ململانێی هەردوو هێزە ناکۆك و هەڤرکەکە، واقیعییەت و چاوەڕوانیش لە شانۆنامەکەدا بەرجەستە دەکات.

شانۆنامەی ئەخلاقی لە ئاخر و ئۆخری سەدەی پانزەیەم و سەرەتاکانی سەدەی شازدەیەمدا نەشونما دەکات و گەشە دەکات.

هەندێ لە شانۆنامە ئەخلاقییە هەرە بەناوبانگەکانی فەرەنسا بریتییە لە:

١- هوشیار، کە قارەمانی ئەم بەرهەمە لە دنیادا بەختیار دەبێ و، لەبەر رۆشنایی ئاوەز، ئیمان، پەشیمانی، ئیعتراف و تۆبەدا رێگەی بەهەشت دەگرێتە بەر.

٢- ناهۆشیار، کە قارەمانی ئەم بەرهەمە بە رێگەی شەیتاندا دەڕوات، و سەرەنجام رێگەی دۆزەخ دەگرێتەبەر.

٣- منالآنی ئەمڕۆ، ئەم بەرهەمە چیرۆك و بەسەرهاتی دوو کوڕی هەرزەکارە کە دوای رابواردن و عەیش و نۆش دەکەون تا لە ئەنجامدا یەکێکیان بە تاوان و تۆمەتی گەندەڵی لە سێدارە دەدرێ، ئەوی دیکەیان تۆبە دەکات، و سزا دەدرێ، و رزگار دەبێ.

<u>شانۆنامەی کۆمیدی:</u>

<u>پەیدابوون و سەرهەڵدانی:</u>

سەرچاوە و بنج و بناوانی کۆمیدیای فەرەنسی نادیارە. وادیارە شاعیرانی دەنگبێژ لە بەرنامە شانۆییەکانی خۆیاندا لە پاڵ چیرۆکانی سوارچاکی، رۆمانس، و حیکایەتی گیانلەبەراندا سێ جۆرە شانۆنامەیان پێشکەش دەکرد بە ناوانی گەنگەشە، گوتار، وەعزی شاد.. گەنگەشە، گفتوگۆیەکە لە نێوان دوو کەسدا و هەر کەسەیان بەرەڤانی لە راوبۆچوونی خۆی دەکات، هەڵبەتە راوبۆچوونەکان پێچەوانەی یەکدی دەبن. بۆ نموونە دەکرێ گەنگەشەی نێوان زستان و هاوین یان ئاو و شەراب بە نموونەیەکی ئەم جۆرە شانۆنامەیە بژمێردرێ.

گوتار، جۆرە مەنەلۆگێکی دراماتیکییە، و بەناوبانگترین نموونەی ئەم جۆرە شانۆنامەیە (مەنەلۆگی سەربازی پیادەیە. لەم مەنەلۆگە دراماتیکییەدا (لە ساڵی ١٤٦٨دا دانراوە و دانەرەکەی نەناسراوە) بەسەرهاتی سەربازێك دەگێڕدرێتەوە کە فشە بە ئازایەتی خۆیەوە دەکات و لە پڕ وا دەزانێ بەرانبەر سوارچاکێك یان دلاوەرێك وەستاوە، و دووچاری ترس دەبێ، بەڵام پاشان پەی بەوە دەبات کە کابرای سوارچاك داهۆڵێکە و هیچی دی، و لەوە بەدواوە ترسی

دەڕەوێتەوە و ئازا دەبێتەوە... وەعزی شاد، لاسایی کردنەوەیەکی هەجوئامێزی هەندێ بەشی داب و ڕێورەسمانی کلێسایە.

ئادەم دولائال (١٢٦٠):

بە یەکەمین کومیدیانووسی فەڕەنسی دادەنرێ، دوو کومیدیای نووسیوە بە ناوانی: "شانۆنامەی کەپر" و "روبن و ماریون". کەپر، لە سێ دیمەنی شاش پێك دێت.

لە دیمەنی یەکەمدا، شاکەسی شانۆکە، ئادەم، لێدەبڕێ هاوسەرەکەی بەجێ بێڵێ و بۆ قوتابخانە بڕوات، زۆر بە توندی باوکی و هاوسەرەکەی خۆی و بورژوازی ئاراس "٥٤" دادەشۆرێ. لە دیمەنی دووەمدا، دوو پەری هەندێ دیاری بە ئادەم پێشکەش دەکەن، بەڵام پەری سێیەم کە پشتگوێ دەخرێ، ئەو ناچار دەکات لەگەڵ هاوسەرەکەیدا بژی. لە دیمەنی سێیەمدا باسی ئەوە دەکرێ کە چۆن ڕەبەنێك فریو دەخوات و کۆنینە موفەڕکەکان لە دەست دەدا. روبن و ماریون، شانۆنامەیەکە لە جۆری شانۆنامانی شوانکارەیی، نەخشە و تیمەیەکی سادەی هەیە بەڵام پڕە لە ئاواز و گۆرانی، سەما، و کایە و گەمەی دێهاتییانە، ئەم جۆرە شانۆنامەیە لەڕاستیدا بە سەرەتای ئوپرای کۆمیدی "٥٥" دەژمێردرێ.

کۆمیدیای سەدەی پانزەیەم:

لە سەروبەندی سەدەی پانزەیەمدا دوو جۆە کۆمیدیا لە فەڕەنسادا ڕەواج و ڕەونەق پەیدا دەکات: سوتی، و فارس، سوتی، لە هەوەڵەوە بورلیسك "٥٦"-ێك بووە کە لەوێدا کەشیشانی پلەنزم ئانە و تەشەریان لە کەشیشانی باڵادەستی خۆیان دەدا و گاڵتەیان پێدەکردن، و پاشان قاڵبی هەجوی وەرگرت، کە پاشا، دەوڵەت، ئەشراف، یا کلێسای نەدەبوارد و ڕەخنەی لە هەموویان دەگرت، دیارترین و مەنشوورترین نموونەی ئەم جۆرە کۆمیدیایە (شانۆنامەی شازادەی گەوجان)ە (١٥١٢) کە هێرش دەکاتە سەر پاپا یولیوس "٥٧"-ی دووەم و کلێسا..

فارس، وەکو نێوان پەردەیە(*) لە ئەدەبیاتی ئینگلیزیدا (نێوان پەردە: پارچەی نمایشێکی کورتە لە نێوان ئەنجامدانی دوو بەشی یەك بەرنامە). ئەم جۆرە کۆمیدیایە لەڕاستیدا فابلۆیەکی کورتە لە قاڵبێکی نمایشیدا، کە لە بنەڕەتدا وەکو تابلۆیەکی کۆمیدی لە شانۆنامەی ڕازداردا بەکار دەبرا. گەنجەفە و بێ پەروایی لە تایبەتمەندی و خەسڵەتەکانی ئەم کۆمیدیایەیە. ئەوەی مابێتەوە و لەبەردەستدا بێ نزیکەی سەد و پەنجا فارس دەبێ. ئەم جۆرە شانۆنامەیە تەنیا شێوەیەکە لە شانۆنامەی فەڕەنسی کە پاش ڕینیسانس-یش هەر لە برەو و ڕەواجدا بووە.

"تەشتی جلشۆری"و "ئەوقاتی پاتلن" دوو نموونەی دیاری فارسن. لە تەشتی جلشۆری دا مێردێکی گوێڕایەڵ، پێداویستییەکانی باشبوونی وەزعی خۆی سەبارەت بە هاوسەرەکەی فەراهەم دەکات. لە ئەوقاتی پاتلندا، ئەوقاتێکی زیرەك موکیلەکەی فێردەکات کە چۆن خۆی لە دانەوەی قەرز بدزێتەوە، موکیلەکەش بە هەمان فێڵ ئەوقاتەکەی دەستخەڕۆ دەکات و هەقدەستەکەی ناداتێ.

## هۆزانی لیریکی

### فرانسوا ڤیون (١٤٣١- ١٤٨٠):

بە گەورەترین شاعیری فەڕەنسایی سەدەکانی ناڤین دەژمێردرێ. ناوی راستەقینەی وی فرانسوا دو مونکوربیەیە، بەڵام ناوی خانەوادەیی و شۆرەتی زڕبابەکەی (گیوم ڤیون) هەڵدەبژێرێ. فرانسوا لە زانستگەی پاریسدا ماستەرنامە وەردەگرێ (١٤٥٢)و تا ماوەیەکیش حەزی دەکرد ببێ بە قەشە، بەڵام بە هۆی هاونشینی دەگەڵ دزان و بەرەڵڵایاندا چەندین جار دەکەوێتە زیندانەوە. سێ جاران تووش دەبێ: جارێك بە تۆمەتی پیاوکوژی (١٤٥٥)، جاری دووەم بە تاوانی دزی (١٤٦٢)، و جاری سێیەم بە تۆمەتی شەڕ (١٤٦٢) فرانسوا لە ئەنجامدا حوکمی ئیعدام دەدرێ، بەڵام حوکمەکە سووك دەکرێ بۆ نەفی و دوورخستنەوە. لە ساڵی ١٤٦٣ بە دواوە هیچ زانیارییەك دەربارەی فرانسوا لەدەستدا نییە.

بەرهەمی شیعری ڤیون کەمە، دوو بەرهەمی درێژی هەیە بە ناوی (وەسێتنامەی بچووك- ١٤٥٦)و (وەسێتنامەی مەزن- ١٤٦١). ڤیون لەم بەرهەمانەدا زۆر شت و خەسڵەتی خەیاڵی دەداتە پاڵ دۆست و دوژمنانی خۆی -کە لە خەڵکانی پایە بەرزەوە تا لات و لەوێرانیان تێدایە- هەڵبەتە زۆر شیعری لیریکی کورتیش لە نێو بەرهەمەکانیدا دەبینرێ، و دوو شیعری لیریکی زۆر مەنشووری هەیە لە ژێر سەر ناوی (بەستەی خانمانی ونبوو) و (گۆرانی ئیعدام کراوان).

ڤیون خاوەنی هەستی قوڵ و راستگۆیانە بووە، و شێوازێکی راستەوخۆ و جوان و دڵڕفێنی هەبووە و لەو بارەیەوە شایانی ستایشە. سۆز و گوداز و نوکتەبازییەکی گەرم و گوڕ و خۆش لە بەرهەمەکانیدا بەدی دەکرێت. لەو دەمەدا کە بۆ ناپایەداری و تیژتێپەڕی جوانییەکان دەگەڕێ، بە روو گرژییەوە گەنجەفە بە نزیك بوونەوەی کاتی ئیعدام کردنەکەی خۆی دەکات، ڤیون یەجگار تامەزرۆ رەمودەی لەزەتە بەدەنییەکانی وەکو شەراب، خواردن، پەناگەی گەرم لە زستاندا و ژنانی جوان بووە، چەرخی رۆژگارو تەبیعەت، زۆر بە دەگمەن بە بەختی ڤیون گەڕاوە، و زۆر دڵی بە

لێقەوماوان و بێ کار و بێنەوایان سووتاوە. لەگەڵ ئەمەشدا ڤیون هیچ کاتێك نە گلەیی لە بەختی خۆی کردووە و نە تاوانی وەزع و حاڵی نالەباری خۆی داوەتە پاڵ قەدەر و چارەنووس. ئیعتراف بە گوناحەکانی خۆی دەکات و داوای بەخشین تەنیا لە خودا دەکات.

تەسلیم بوونی ڤیون بە مەرگ، لەگەڵ جۆش و خرۆشی بۆ ژیان، سیمایەکی پێ دەبەخشن کە باشترین جیلوەی قۆناغە گۆڕکێی فەرەنسایە لە سەدەکانی ناڤینەوە بۆ رینیسانس.

# ژێدەرەکان:

١- کلوڤیس- Clovis: (٤٦٦- ٥١١ی ز): شای فرانکەکان بووە لە ساڵانی ٤٨١- ٥١١.

٢- شارل مارتل: (٦٨٨- ٧٤١ی ز): فەرمانڕەوای فرانکەکان و باپیری شارلمانی بووە.

٣- تور- Tour: شارێکە لە فەرەنسا.

٤- ئیلنورناو ئاکویتین (١١٢٢- ١٢٠٤ی ز): کیژی ویلیامی دەیەم (دۆکی ئاکویتین) بوو، شوو بە لویس (پاشان بوو بە لویسی حەوتەم-ی پاشای فەرەنسا) دەکات و مێردەکەی دوای یەك مانگ دەبێ بە پاشای فەرەنسا. لە ئەنجامدا و پاش جیابوونەوە لە لویس شوو بە هنری دووەم دەکات.

٥- جاندارك (١٤١٢- ١٤٣١ی ز): قارەمانی نەتەوەیی فەرەنسا بوو.

٦- شارل کچل، شارلی دووەم (٨٢٣- ٨٧٧ی ز) ئیمپراتۆری ئیمپراتۆرییەتی موقەدەسی روم( ٨٧٥- ٨٧٧): شای فەرەنسا (٨٤٣- ٨٧٧ی ز).

٧- لویسی جەرمەنی (٨٠٤- ٨٧٦ی ز): شای فرانکانی رۆژهەلاتی بوو.

٨- لوتار (٧٩٥- ٨٥٥ی ز): ئیمپراتۆری ئیمپراتۆرییەتی موقەدەسی روم (٨٤٠- ٨٥٥ی ز) بوو.

٩- چوار بەرهەمی کورت: سروودی قەدیس ئایولالیوس (رەنگە بۆ ئاخر و ئۆخری سەدەی نۆیەم بگەڕێتەوە) شیعرێك لەمەڕ ئازایەتی عیسا، ژیانی قەدیس لیجە، شیعرێك دەربارەی بوئیتوس.

١٠- ئەقلگەرایی: تیۆرییەکی فەلسەفییە کە ئەقڵ بە گرنگترین ئەوزاری وەدەستهێنانی مەعریفەت دەژمێرێ.

١١- ئانیهارد (٧٧٠- ٨٤٠ی ز): مێژوونووسێکی فرانکییە، و ژیاننامەی شارلمانی نووسیوە.

١٢- باسکەکان: قەومێکی ئاکنجی باکووری ئەسپانیا و باشووری رۆژئاوای فەرەنسایە، کە رەگ و رەچەڵەکیان نادیارە.

١٣- ساراسنەکان: یونانی و رومییە تازەکان، خەڵکی خێوەت نشینی سوریا و عەرەبستانیان، کە پێ دەچێ لە بنەڕەتدا خەڵکی نیمچە دوورگەی سینا بەرەو سنووری میسر بووبن، بەو ناوەوە ناو دەبرد، پاشان وشەی "ساراسن" بە مانای عەرەب و تەنانەت لە سەروبەندی جەنگی چەلیپاییدا بە مانای موسوڵمانان بەکارهاتووە.

١٤- ساراگوسا: ویلایەتێکی باکووری رۆژهەڵاتی ئەسپانیایە.

١٥- ئیکس لاشاپل: شارێکە لە رۆژئاوای ئەڵمانیا، لە نزیکی بەلجیك و سنووری هۆڵەندایە.

١٦- قەشە دنی: (سەدەی سێیەم): قەشەی پارێزەری فەرەنسایە، دەڵێن یەکەمین ئەسقوفی پاریس بووە.

١٧- ئوبرون: لە ئەدەبیاتی ئەورووپای رۆژئاواییدا، شای پەرییان و مێردی تیتانیا-ی شابانۆی پەرییانە.

١٨- برتن: دەڤەری برتانی.

١٩- بنوا دوسنت- مور: شاعیری تروڤەری فەرەنساییە لە سەدەی دوانزەیەمی میلادیدا.

٢٠- دارس فریگیایی: م کاهینی شاری تەروادە بووە و بەدانەری "مێژووی رووخانی تەروادە" دەژمێردرێ، ئەم کتێبە لە سەدەی پێنجەمی زایینیدا وەرگێردراوەتە سەر زمانی لاتینی.

٢١- دیکتس کرتی: خەڵکی کرت-ە، واریقاتنامەیەك دەربارەی جەنگی تەروادەیە کە دەدرێتە پاڵ ئەو، ئەم بەرهەمە یەکەجار لە سەدەی چوارەمی زایینیدا کراوە بە لاتینی.

٢٢- ترویلوس و کرسیدا: چیرۆکێکی ئەڤینداری سەدەکانی ناڤینە کە رەگی دەچێتەوە سەر ئەفسانەیەکی یونانی، ترویلوس-ی شازادەی تەروادەیی، ئاشقی کرسیدا دەبێ، لێ کرسیدا بێ وەفایی دەرهەق دەکات، ترویلوس بە دەستی ئاخیلوس دەکوژرێ.

٢٣- تریسیترام و ئیسولت: ئەم دوو ناوە بە شێوەی دیکەش تۆمارکراون وەکو: ترسیترم، تریستران، تریستان، و ئیزۆ، ئیسولد، ئیزولدە، ئیزوت...

٢٤- قەشەیوسفی رامەیی: جولەکەیەکی دەوڵەمەندە کە جەستەی عیسای لە گۆڕ ناوە.

٢٥- گەلەهەد: لە ئەفسانانی ئارتوریدا، نەجیب ترین و پاکترین دلاوەر و سوارچاکی باوەڕپێکراوە.

٢٦- فابیل — Fable: چیرۆکێکی ئەخلاقی کورتی شیعری یان پەخشانییە کە قارەمانەکانی بە زۆری گیانلەبەران یان شتی بێگیانن.

٢٧- گوینڤیر: لە ئەفسانەی ئارتوریدا۔ هاوسەری ئارتورشا و ماشوقەی لانسلوت-ە.

٢٨- گاسکونی: دەڤەر و ویلایەتێکی کۆن بووە لە باشووری رۆژئاوای فەرەنسا.

٢٩- فلاندر: دەڤەرێکە لە رۆژئاوای بەلجیك و باکووری فەرەنسا.

٣٠- ئەڤینی دەرباری: یاسا و رێسا و داب و نەریتی ئەڤینی دەرباری بابەتێکی ئاڵۆزە، بە کورتی ئەم جۆرە ئەڤینە بریتییە لە پەیوەندی حەرامی نێوان ئاشقێك و خانمێکی مێردار، بەکێك لە ئەتەکێتە

گرینگەکانی ئەم ئەڤینە، رێزگرتنی لەڕادەبەدەر و بێ چەند و چوونی ژنان و پابەندییە بە خزمەتکردنی ئەو ژنانەوە. ئەڤینی دەرباری هەندێ جار ئەخۆشییەکە و تەنیا تەسلیم بوونی یەکجارەکی ماشوقە شیفای دەدات. ئاشق-یش بۆ سەلماندنی ئەڤینی خۆی دەبێ مل بۆ هەر هەموو ئارەزووەکانی ماشوق بدات و لەسەر خواستی ئەو دلاوەری و بەهێزی خۆی لە ئەنجامدانی کارێن شایستە و بەرجەستەدا نیشان بدات، هەڵبەتە بە گوێرەی داب و نەریتی ئەم جۆرە ئەڤینە، بێوەفایی و پەیمانشکێنی بە گەورەترین گوناح و تاوان دەژمێردرێ و تەسلیم بوونی ماشوقە بە ئاشق-ی دلاوەر نەك هەر گوناح نییە بەڵکو جۆرە عیبادەتێکیشە، هۆ و سەرچاوەی سەرهەڵدانی ئەڤینی دەرباری زیاتر دەگەڕێتەوە بۆ زەوجینی نابەدڵ و مەسەڵەحەت کە لە سەدەکانی ناڤیندا بە پێی مەسەلە سیاسی و کۆمەڵایەتی و داراییەکان ئەنجام دەدرا و گوێ بە ئەڤینداری نێوان کیژان و کوڕان نەدەدرا.

٣١- گیوم دو پواتیە (١٠٧١- ١١٢٧) کۆنترین تروبادور-ی پرو وانسال-ە.

٣٢- ژوفر رودل: لە ناوەڕاستی سەدەی دوازدەیەمی زایینیدا ژیاوە.

٣٣- برناردو ڤانتادور (١١٤٥- ١١٨٠ی ز).

٣٤- گیرودو بورنی ( لە ساڵی ١١٧٠- ).

٣٥- پرتران دو بورن ( ١١٤٠- ١٢١٥ی ز).

٣٦- جان بو دل (١١٦٥- ١٢١٠ی ز).

٣٧- شاتلن دوکسی (١١٨٦- ١٢٠٣).

٣٨- تیبو دو شامپانی (١٢٠١- ١٢٥٣) شای ناوار لە ساڵانی (١٢٣٤- ١٢٥٣)و بە ناوبانگترین شاعیری تروڤەر بووە.

٣٩- جان دومون (لە ساڵی ١٣٥٥ی ز مردووە) شاعیرێکی فەرەنسەوییە.

٤٠- فیدروس (فەیلەسووفێکی یونانی سەدەی پێنجەمی پێش زایینە).

٤١- هیزۆپ: حیکایەتنووسێکی یونانی ناوەڕاستی سەدەی شەشەمی پێش زایینە.

٤٢- ئاڤیانوس: فابیلنوسی لاتینی سەدەی چوارەمی پێش زایینە.

٤٣- فرایرەکان: ناوێکە بەرەبەنانی مەسیحی بەتایبەتی بەرەبەنانی چینی هەژارانی مەسیحی دەگوترا.

٤٤- گیوم دو لوریس (١٢١٥- ١٢٧٨).

٤٥- کوپید (بەپێی ئەفسانانی رومی) خوای ئەڤینە.

٤٦- جان دو مون (١٣٠٥).

٤٧- عیبادەتکاری (لیتورجی): جۆرە عیبادەتێکی دەستەجەمی ناو کڵێسای مەسیحییانە، بە واتای قوربانی پیرۆز دێ. ئەم ڕەسمە نیشاندەری کاری مەسیحە دەگەڵ پەیڕەوەکانیدا لە دوا شامدا، و بەرپا کردنی ئەم ڕەسمە بۆ وەبیرهێنانەوەی لە خاچدانی مەسیحە.

٤٨- شارلی شەشەم (١٣٦٨- ١٤٢٢) بە شارلی مەحبوب ناسراوە، لە ساڵانی ١٣٨٠- ١٤٢٢دا شای فەرەنسا بوو.

٤٩- پاسیون: یەکێك بووە لە ئەنجوومەنە ناودارە مەزهەبییەکان، گرووپە ئەکتەرێك-ی خەڵکی پاریس و شارەکانی دیکەی فەرەنسا بوون، کە لە سەدەکانی پانزەیەم و شانزەیەمدا شانۆنامانی مەزهەبییان، بە تایبەتی شانۆنامەی ژانەکانی مەسیح، پێشکەش دەکرد.

٥٠- ئارنولدگیربان: ئەواژەن و رابەری کۆراڵی کڵێسای نوتردام بووە، و لە شاعیرانی سەلیقەداری فەرەنسەویی ناوەڕاستی سەدەی پانزەیەم بوو.

٥١- جاك میلە: (١٤٢٨- ١٤٦٦): شاعیرێکی فەرەنسایی بوو.

٥٢- میلودراما: شانۆنامەیەکی سووکەڵەیە بە ئاواز و گۆرانی و مۆسیقاوە ئەنجام دەدرێ، و مامەڵە لەگەڵ بابەتی پڕسۆز و گوداز و هەستیاردا دەکات و بە زۆری ئەنجام و ئاکامەکەی خۆش و شادە.

٥٣- جان بودل (١١٦٥- ١٢١٠ی ز): شاعیرێکی تروڤەری فەرەنسایییە.

٥٤- ئاراس- Arras: شارێکە لە باکووری فەرەنسا، کە لە ئاخر و ئۆخری سەدەکانی ناڤینـدا ڕەونەقی هەبووە.

٥٥- ئۆپرای کۆمیدی: شانۆنامەیەکی نیوە تراجیدی و نیوە کۆمیدییە کە لە نێوان دیالۆگەکاندا گۆرانی و ئاوازیشی تێ دەکەوێ.

٥٦- بورلیسك: شانۆنامەیەکی پێکەنیناوی موجامەلە ئامێزە.

٥٧- پاپا یولیوس: پاپای ساڵانی ١٥٠٣ -١٥١٣ی ز بووە.

# ئەدەبیاتی ئەسپانیایی

سەرەتایەکی مێژوویی:

نیمچە دورگەی ئێستای ئەسپانیا و پرتوغال بە چەند سەد ساڵێك بەرلە زایین دەبێ بە شوێنی ئاکنجی بوونی ئیبریان "١" و بەربەکانی "٢" ئەفریقای باکووری، لە سەدەی پێنجەمی پێش زاییندا سیلتەکان پەلاماری ئەم نیمچە دورگەیە دەدەن و، تێکەڵبوونێکی نەژادی دێتە ئاراوە. ئیبریان لە بەشی رۆژهەلات و سیلتەکان لە بەشی رۆژئاوادا، کە دەکاتە پرتوغال و گالیسیا "٣" ی ئەمرۆ، جێگیر دەبن. بەرلە هێرشی سیلتییەکان، فینیقییەکان، یۆنانییەکان، و کارتاژیەکان لە بەشێکی ئەسپانیادا نیشتەجێ دەبن و، کارتاژییەکان دەبن بە دەسەلاتی حوکمرانی نیمچە دورگەکە. رومیان لە ساڵی ٢٠٦پ.ز کارتاژییەکان وەدەردەنەن و داب و نەریت و یاسای رومی لە ئەسپانیادا دەسەپێنن. دەسەلاتی رومییەکان تا ساڵی ٤٠٩ی ز کە ئەسپانیا لەبەر سویبەکان، ئالانەکان، و ڤاندالەکاندا، کەتیرە و تایفەی جەرمەنی بوون، هەلدێ و دەشکێ، هەر بەردەوام دەبێ. پێنج ساڵ دواتر ویزیگوتەکان دێنە ئەسپانیا، ئەمانە تارادەیەکی زۆر کەلتووری رومی قەبوول دەکەن، بەلام هەندێ گۆڕانکاری لە یاسا و داب و نەریتاندا دەکەن.

لە ساڵی ٧١١ی ز هێرشی موسوڵمانان بۆ سەر ئەسپانیا دەست پێدەکات و تا ساڵی ٧٥٨ کە خەلافەتی کوردوبا "٤" (قرطبە) دادەمەزرێ، موسوڵمانەکان بەسەر سەرانسەری نیمچە دورگەکەدا زاڵ دەبن جگە لە ناوچە کوێستانییەکانی باکووری رۆژئاوا، کە لەبەر سەختی و دژواری پێیان ناگیرێ، مەسیحییانی ئەسپانیایی سەرزەمینی خۆیان بۆ موسوڵمانەکان چۆڵ ناکەن، بەڵکو ئەم دوو نەژادە بۆ چەندین سەدە لە پاڵ یەکدا دەژین، و شارستانییەتی ئەسپانیاییەکان لە رۆشنبیری و فەرهەنگی پرشنگداری فاتیحانی موسوڵماندا دەتوێتەوە.

موسوڵمانان، ئەسپانیاییەکان بە زانستی دەوڵەمەندی خۆیان لە بوارەکانی پزیشکی، بیرکاری، و ئەندازە ئاشنا دەکەن، بەڵام کاریگەری ئەدەبی موسوڵمانان زۆر کەمە.

ئەسپانیاییەکان لە ساڵی ١٠٨٥دا کاتێ کە تولدو "٥" Tuleytele: لە دەستی موسوڵمانان دەردێنن، فەتحی دووبارەی وڵات و سەرزەمینی خۆیان دەست پێدەکەنەوە. لە ساڵی ١٢٣٦دا کوردوبا و لە ساڵی ١٢٤٨دا سەڤیل "٦" دەگرنەوە. لە ئەنجامدا، بە هۆی زەماوەندی فردیناند "٧" ئاراگون لەگەڵ ئیزابیل کاستیل "٨"دا تا ئەندازەیەك یەکێتی و یەکپارچەیی وڵات دابین دەبێ. لە ساڵی ١٤٩٢دا گرانادا "٩" Xernateی دوا قەڵای موسوڵمانانیش دەکەوێتە دەستی ئەسپانیاییەکان.

خەڵکی ئەسپانیا بە شێوەیەکی گشتی، ئارام، بەویقار، تاکپەروەر، دیموکراسیخواز، و خۆشتەبعن کە ئەمەش تاڕادەیەك بۆ فاکتەرە جوگرافیایی و مێژووییەکانی ئەم وڵاتە دەگەڕێتەوە و، بەخەستی و بە چڕی لە ئەدەبیاتی ئەسپانیادا رەنگی داوەتەوە.

نۆڕینێکی گشتی:

لە ساڵی ٢٠٦ی پ.ز. دا لاتینی دەبێ بە زمانی فەرمی ئەسپانیا، و بەشی هەرە زۆری کەلەپوری سیلتی-ش هەر زوو لە بەین دەچێت. لە ئەسپانیاش وەکو فەرەنسا، زمانی جەماوەری خەڵك زمانی لاتینی عامیانە بووە، کە بە درێژایی ساڵان گۆڕانی زۆری بەسەردا دێت و دەبێ بە زمانی میللی و نەتەوەیی وڵات. هەڵبەتە فتوحاتی بەربەران و موسوڵمانانیش کارێکی ئەوتۆ ناکاتە سەر ئەم زمانە.

ئەدەبیاتی ئەسپانیایی لە سەدەی دوانزەیەمەوە دەست پێدەکات. لە دەوروبەری ساڵی ١١٤٠ەوە تا دەستپێکی رینسانس لە ئەسانیادا (دەوروبەری ١٤٦٩) بەرهەمێکی زۆر بە شیعر و بە پەخشان دادەنرێ. کە بە دەگمەن بەرهەمی ئەدەبی ناوازەیان تێدا بەدی دەکرێ. زۆربەی ئەم بەرهەمانە یان لاسایی کردنەوەی بەرهەمی فەڕەنسین یان وەرگێڕانی بەرهەمێن فەڕەنساوین. بە هەرحاڵ زۆر چیرۆکی جۆراوجۆر (بەتایبەتی حیکایەتی ئەخلاقی، ئەفسانەێن مەجازی، و رۆمانسێن وەکو رۆمانسە فەڕەنسییەکان).

نووسراوانی مافپەروەری، تەنز، مەجاز، و بەیتێن ئایینی و فێرکاری دێتە ئاراوە. درامای ئەسپانیایی-ش، وەکو فەرەنسا، لە نەریت و داب و سروودەکانی کلێساوە سەرهەڵدەدات، لێ شانۆنامانی موعجیزە و رازداری ئەسپانیایی هەرگیز ناگەنە ئاستی رەسەنایەتی و بەرزی شانۆنامانی فەڕەنسەوی. بەرجەستەترین ژانری ئەدەبیاتی ئەسپانیا لە

سەدەکانی ناڤیندا بریتییە لە: (مەلحەمە، -داستان-، واریقاتنامە، شیعری لیریکی، و بالاد -شیعری ئەفسانەیی).

## داستان (مەلحەمە)

هەڵبەتە مشتومڕێکی زۆر لەسەر ئەوە هەیە کە ئاخۆ داستانی ئەسپانیایی دەچێتەوە سەر داستانی فەرەنساوی یان جەرمەنی. بەڵام حەقیقەتەکە هەرچییەك بێ، هەم کاریگەری فەرەنسی و هەم کاریگەری جەرمەنی بەسەر داستانی ئەسپانیاوە زۆر قوڵ و زەقە، پێدەچێت هەندێ لە داستان و مەلحەمە قەومییەکان لە سەدەی دەیەمەوە دەماودەم هاتبێ، و کۆنترین بەرهەمی ئەم بوارە دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ١١٤٠. داستانە قەومییەکان لە چاو بەیتەکانی شانسون دوژست-ی فەرەنسەویدا زبرتر و ناپوختەترن. درێژی دێڕەکانیش ناڕێکوپێکە و پابەندی ڕێسا نییە.

شەش جۆرە داستانی قەومی سەرەکی لەسەر بنەمای کەسایەتی مێژوویی یان ئەفسانەیی ئەسپانیا-ی وەکو روژریگوگوت "١٠"، برنارد و دل کارپیو، و رودریگو دیاز (سید) رۆنراوە. بەڵام ئەوەی لە داستانانی ئەسپانیایی ماوەتەوە تەنیا هەندێ بەشە لە سێ داستان: بەستەی سید "سەروەر" (دەوروبەری ١١٤٠)، و رونسوو، (ئەو نوسخەیەی لەبەردەستدایە دەگەڕێتەوە بۆ دەوروبەری ١٣١٠)و واریقاتنامەیەکی شیعرییە (دەوروبەری ١٤١٠). گەلێك لە داستانە قەومییەکان جارێکی دی و بە پەخشان لە (واریقاتنامەیەکی گەورە)دا داڕێژراونەتەوە.

بەستەی سەید (سەروەر):

رەنگە لە ساڵی ١١٤٠دا و لەلایەن شاعیرێکی کاستیلییەوە دانرابێ، ئەم بەیتە کە بە زەقی کاریگەری سروودی رولان-ی پێوە دیارە، تاقە داستانی ئەسپانیاییە کە تەقریبەن بە تەواوی لە چەپۆکی رۆژگار دەرباز بووە و وەکو خۆی ماوەتەوە. ئەم بەرهەمە سێ هەزار و حەوت سەد و سی و پێنج بەیتە، کە نزیکەی پەنجا بەیتێکی سەرەتاکەی فەوتاوە. بەستەی سەید، نیوەی دووەمی ژیانی کەسایەتی مێژوویی، روژریگو دیاز دوبیڤار (١٠٤٠-١٠٩٩) دەگێڕێتەوە، کە لە دەرباری سانچۆی "١١" دووەم-ی شای کاستیل، و ئالفونسوی "١٢" شەشەمی شای لیوندا خزمەتی دەکرد: چیرۆکەکە (وەکو لە بەیتەکەدا گێڕدراوەتەوە) بەمجۆرەیە: شا ئالفونسو، روژریگوی ناسراو بە سەید (لە وشەی سەیدی عەرەبییەوە وەرگیراوە، کە بەمانای سەروەر و پێشەوا دایت) بە درۆ بەوە تاوانبار دەکات کە دەستکاری باجی کردووە، و حوکمی

دوورخستنەوە و نەفی کردنی دەردەکات. روزریگو بە خەمبارییەوە مل بۆ فەرمانەکە دەدات و پەناوەبەر زۆزانەکان دەبات، و پەیڕەوانێکی ئەمەکدار لە دەوری خۆی خڕ دەکاتەوە و بە یارمەتی وان دەچێتە جەنگی موسوڵمانانەوە. لە دوای هەر سەرکەوتنێك کۆمەڵێك دیاری بۆ ئالفونسو دەنێرێ، بەو هیوایەی کە دڵی پاشا نەرم بێ و فەرمانی دوورخستنەوەکەی هەڵبوەشێنێتەوە. لە ئەنجامدا روزریگو ، ڤالینسیا دەگرێت، و بۆ خۆی دەبێ بە فەرمانڕەوایەکی سەربەخۆ، ئالفونسو ناچار دەست لە سەرسەختی هەڵدەگرێت و بە گەرمی پێشوازی لە گەڕانەوەی پێشکارە ئەمەکدارەکەی دەکات. سەید بە سووربوونی ئالفونسو، و بە نە بە دڵی، بە شووکردنی دوو کیژەکەی بە شازادانی کاریون "١٣" قایبل دەبێ. جووتە زاوا پاش زەماوەندەکە نامەرد و خوێڕی و دژەژن دەردەچن. سەید داوای سزادانیان دەکات. دادگاکەیان بەشێوەی ئەزموونێکی جەنگی دەبێ کە لەهەنبەر سەیددا بە شێوەیەکی حەیابەرە شکست دێنن. کیژەکانی روزریگو-ش شوو بە شازادانی ناڤارا "١٤" و ئاراگون دەکەن.

چونکە "بەستەی سەید" چل ساڵێك پاش مردنی قارەمانەکەی نووسراوە، بە واقیعیانەترین داستان (مەلحەمە) دەژمێردرێ، ئەم داستانە لەڕووی مێژووییەوە بێ ئەندازە وردە، هیچ شوێنەوارێکی جادووگەری لەو بەرهەمەدا نییە، زۆر بەکەمی سوودی لە موعجیزاتی مەسیحی وەرگرتووە، تەواو لە موبالەغە دوورە. تۆن و ئاوازێکی سادە و ئەدەبیانەی هەیە، لە توخم و رەگەزی ئەڤینی رۆمانتیکی-ش بەدەرە. ئەم بەیتە لە باری رەنگدانەوەی یاساکانی کاستیلین داب و نەریت، و شێوەی ژیان و گوزەران لە سەدەی یازدەیەمدا یەجگار بایەخدار و گرنگە.

نووسەرانێکی وەکو دوکاسترو "١٥" ، کورنی، هردروساوپی لە ژێر کاریگەری ئەم داستانەدا زۆر بەرهەمیان نووسیوە.

## واریقاتنامە

لە سەدەی پێنجەم بەدواوە، گەلێك لە بنکە و دەزگا مەزهەبیەکان رووداونامە و واریقاتنامەکان بەلاتینی تۆمار دەکەن و دەنووسنەوە. زۆربەی ئەم بەرهەمانە نوقستان و ئالۆزن. روزریگوخیمنپ درادا (١١٧٠- ١٢٤٧)و لوکاس دوتوی (؟ -١٢٤٩ی ز) هەندێ هەوڵیان هەیە کە رووداوە جیهانی و نەتەوەییەکان بە گوێرەی ریزبەندی مێژوویی پەیگیری بکەن. ئەم پیاوانە دەتوانن مێژووی واقیعی بنووسنەوە، بەڵام ئەوانیش بەلاتینی دەنووسن، یەکەمین واریقاتنامە (مێژوو)ی گرینگ بە زمانی خۆماڵی لەلایەن ئالفونسوی زاناوە دەنووسرێت.

ئالفونسوی زانا (١٢٢٦- ١٢٨٤):

شای کاستیل، ئەدیب، شاعیر و مێژوونووسە، بە چاولێکەری بەرهەمەکانی روژریگو لوکاس، واریقاتنامەی جامیع-ی بە زمانی کاستیلی دا ناوە کە بە گرنگترین سەرچاوە و بەرهەمی مێژوویی سەدەکانی ناڤین دەژمێردرێ. ئەم واریقاتنامەیە بە تۆفانەکەی نوح دەست پێدەکات و پاشان مێژووی تەواوی ئەسپانیا لە رۆژگاری نیشتەجێ بوونی یونانی و کارتاژییەکانەوە تا پاشایەتی فردیناند-ی سێیەم (١٢٥٢) دەگێڕێتەوە. ئەم بەرهەمە وەکو مێژوو جێی متمانە نییە و پشتی پێ نابەسترێ، و تەنانەت خودی نووسەرەکەشی کەمترین هەوڵی نەداوە کە حەقیقەت و ئەفسانە لێکدی هەڵاوێرێ. بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا بەرهەمێکی جوان و لەبەر دڵانە. لەڕووی ئەدەبییەوە گرنگترین بەشی ئەم واریقاتنامەیە، نووسینەوە و شەرح و شرۆڤەی داستان و مەلحەمە کۆنەکانە کە نووسەر بە هەواڵ و زانیاری رەسەنی مێژوویییان دەزانێ.

## هۆزانێن لیریکی

تەقریبەن هیچ بەرهەمێکی شیعری لیریکی کۆنی ئەسپانیایی نەماوەتەوە، کەچی لەگەڵ ئەمەشدا کۆمەڵێك نیشانە و گەواهی ئەوە هەن کە لە سەدەکانی ناڤیندا زۆر هۆزانی لیریکی نووسرابن، لەوانە گۆرانی نیگابانان، گۆرانی کریسمەس، گۆرانی ئەڤینی و گۆرانی شوانکارەیی. شاعیرانی ترووبادور-ی پرووانسال لە سەدەکانی دوازدەیەم و سیانزەیەم-یشدا برەویان هەبووە، بەتایبەتی لە کاتولونیا و گالیسیادا.

خوان رویت (١٢٨٣- ١٣٥١):

کەشیشباشی (اسقف) ئیتا[١٦]، یەکەمین پێکەنینۆك نووسی ئەسپانیایی و گەورەترین هۆزانڤانی لیریکی ئەم وڵاتە بووە لە سەدەکانی ناڤیندا. هەڵبەتە بەرهەمی خوان رویت یەکجار هەمە رەنگ و جۆراوجۆرە و بە ئاسانی ناخرێتە خانەیەکی تایبەتییەوە. ناوبانگ و شۆڕەتی وی بە یەك بەرهەمیەوەیە کە ئەویش "کتێبی ئەڤینی پەسند"ە (کە مەبەستی ئەشق و ئەڤینی خوا و چاکەیە). بەڵام ئەم بەرهەمە کەشکۆڵێکە لە چیرۆکێن مەکشوف، دوعا و نزا، سروودی پاڕانەوە، چیرۆکێن مەجازی، هۆزانێن شوانکارەیی، گۆرانی ئاشقانە، و حیکایەتی ئەخلاقی. وادیارە شاعیر مەبەستی فێرکردنی پەند و ئامۆژگاری ئەخلاقییە، لە رێگەی دەرخستنی جیاوازی ئاشکرای نێوان ئەشقی حەقیقی و ئەشقی سێکسییەوە.

جوانی و ناسکی ئەم بەرهەمە لـە ئاشـکراکردنی کەسـایەتی نووسـەرەکەی، و وێنـەگرتنی تەواو و راستگۆیانەی ژیانی سەدەی چواردەیەمدایە.

## بالادەکان (Ballads):

بالاد، رەنگە پڕ خوێنەرترین ژانری ئەدەبیاتی ئەسپانیای سەدەکانی ناڤین بووبێ، کە لێرەدا مەبەست لە بالاد، کورتە هۆزانی داستانی- لیریکییە. هەندێك لە ئەدیبان پێیان وایە کە بالاد لە کۆنەوە هەبووە و سەرچاوەی بەیتە داستانییە قەومییەکانە، هەندێکی دیکە پێیـان وا نییـە کە بالاد پێشینەیەکی دوور و درێژی هەبێ و بە هەندێ کۆپلەی پاشماوەی مەلحەمە و داسـتانی دەزانن، بە هەر حاڵ ئەم باسە هێشتاش هەر جێی مشتومڕ و گەنگەشەیە. لەوەیە گـەلێك لـەم شیعرە کورتانە بـە درێـژایی رۆژگـارێکی دوور و درێـژ (تـۆ بڵـێ سـەد سـاڵ ) دەمـاودەم لـە نەوەیەکەوە بۆ نەوەیەکی دیکە هاتبێ، لەوە دەچێ زۆربەی ئەم بالادانـە (بـەلای کەمـەوە بـەم شێوەیەی ئێستایان) لە پاش ساڵی ١٤٠٠ەوە دانرابن. چەند کۆمەڵەیـەکی گرنگـی ئـەم ژانـرە شیعرە لەبەر دەستدان، بەڵام هەر هەموویان لە سەدەی شانزەیەم یـان پاشـتردا کۆکراونەتـەوە، لەبەر ئەمە دەگەڕێنەوە بۆ قۆناغی رینیساس.

گەلێك لە بالادانی تەقلیدی، شاد و رۆمـانتیکین، و سـکاڵا و گلـەیی، تـاڵی، ئازایـەتی و دوژمنایەتی رۆژانی شەڕی مەسـیحیان دەگـەڵ ساراسـنەکان وەبیر دێننـەوە. ژمارەیـەك لـەم بالادانە، جوامێری و قارەمانێتی قۆناغە داستانی و مەلحەمییـەکان دەگێڕنـەوە. ژمارەیـەکی دیکەشی، چیرۆکی ئەڤینـدارین، هەنـدێکی تریـان رووداوە مێژووییـەکان بەرجەسـتە دەکـەن، کۆمەڵێکیانیش رووداوێن کۆمیدی باس دەکەن.

هەندێ لە بالادە مەنشورەکان بریتین لە: "شیوەنی دون رودریك"، "ئەشـقبازی سـەید"، و "کۆنت ئارنالدو".

ژێدەران:

١- ئیبریان: قەومێکی کۆنن کە لە چاخی بەردینی تازەدا لە ئەفریقاوە بۆ نیمچە دوورگەی ئیبری باکووری رۆژئاوای ئەورووپا کۆچ دەکەن.

٢- بەر بەرەکان: دانیشتووانی بەربەری زمـانی ئـەفریقای بـاکووری کـە لـە دەوروبـەری ٣٠٠٠پ. ز لەم دەڤەرەدا دەژیان.

٣- گالیسیا: لە سەرچاوە ئیسلامییەکاندا بە جلیقیە ناو براوە، مەملەکەتێکی کۆنە لە باکووری رۆژئاوای ئەسپانیا.

٤- کوردوبا: لە سەرچاوە ئیسلامییەکاندا قرطبە-ی پێ دەگوترێ، دەڤەرێکی باشووری ئەسپانیایە.

٥- تولدو: ویلایەتێکە لە ئەسپانیای ناوەندیدا، لەسەرچاوە ئیسلامییەکاندا "کلیگلە"یە.

٦- سەڤیل: دەڤەرێکی باشووری رۆژئاوای ئەسپانیایە، لەسەرچاوە ئیسلامییەکاندا "ئەشبیلیە"یە.

٧- فردیناند ئاراگون (١٤٥٢- ١٥١٦ی ز): فەردیناندی پێنجەم لە خانەدانی شاهانی ئەسپانیا، فردیناندنی دووەم لە خانەدانی شاهانی ئاراگون و سیسیل، فردیناندی سێیەم لە خانەدانی شاهانی ناپل، ناسراو بە فەردیناندی کاسولیك.

٨- ئیزابیل کاستیل (١٤٥١- ١٥٠٤): بە ئیزابیل-ی کاسولیك ناسراوە. شابانۆی کاستیل کە پاش شوکردن بە فردیناند ئاراگون دەبێ بە شابانوی ئەو وڵاتە.

٩- گرانادا: ناوچەی باشووری ئەسپانیایە، لەسەرچاوە ئیسلامییەکاندا (غرناگە)یە.

١٠- روژریگوگوت: دوایەمین پاشای "گوتە رۆژئاواییەکان" بوو لە ئەسپانیادا، کە لە ساڵی ٧١٥ی ز هاتە سەر حوکم.

١١- سانچوی دووەم ( ١٠٧٢ی ز): کوڕی فردیناندی یەکەم و شای کاستیل بوو (١٠٦٥- ١٠٧٢).

١٢- ئالفونسوی شەشەم (١٠٣٠- ١١٠٩): ناسراو بە دلاوەر، شای لیون لە ساڵانی (١٠٦٥- ١١٠٩ی ز) و شای کاستیل لە ساڵانی ١٠٧٢- ١١٠٩ی ز).

١٣- کاریون: ناوچەیەکە لە باکووری ئەسپانیای ناوەندی.

١٤- ناڤارا: ویلایەت و حاکم نشینی جارانی باکووری ئەسپانیایە

١٥- دوکاسترو "١٥٦٩- ١٦٣١" شانۆنامەنووسێکی ناوداری ئەسپانیاییە.

١٦- ئیتا: شارێکە لە ئەسپانیای ناوەندی.

# ئەدەبیاتی ئیتالیایی

سەرەتایەکی مێژوویی:

یەکێك لە خەسڵەتە خودی و تایبەتەکانی مێژووی ئیتاڵیا ناکۆکی و جیاوازییە-جیاوازی نەژاد و دیالێکت، جیاوازی پەیوەندی سیاسی، جیاوازی پێشکەوتنی ناوخۆ و داب و نەریت و رێرەسمی باو. لە ساڵی ٤٧٦ی ز کە دوا ئیمپراتۆر بە دەستی هەندێ تیرەی هۆڤی دەروخێ و دەکەوێ، ئیدی ئیتاڵیا تا نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەیەم هیچ کاتێك یەکێتی و یەکپارچەیی بە خۆیەوە نابینێ. ئوسترو گوتەکان، ویزگوتەکان، ڤاندالەکان و بیزانسەکان، بە درێژایی سەدەکانی پانزەیەم و شانزەیەم ئەم وڵات و سەرزەمینە غەرقی ئاژاوە و پاشاگەردانی دەکەن، لومباردەکان لە ساڵی ٥٦٨دا پەلاماری ئیتالیا دەدەن و بۆ ماوەی دوو قەرن حوکمڕانی ئەوێندەر دەکەن، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا، هەرگیز ناتوانن ناوچەی رۆژهەڵاتی نیمچە دوورگەکە، بەشێك لە باشوور، روم، سیسیل، ساردنی و کرس بگرن و کۆنترۆڵی بکەن. شارلمانی لە ساڵی ٧٧٤دا لومباردەکان دەشکێنێ، و لە ساڵی ٨٠٠دا وەکو ئیمپراتۆری ئیمپراتۆرییەتی موقەدەسی روم تاج لەسەر دەنێ و تا ساڵی ٨٨٨ ماڵبات و خانەدانی وی لەسەر حوکم دەمێنن. پاشان ئیتاڵیا دەکەوێتە گێژاوی پەشێوی و پاشاگەردانییەوە و هەر بەو دەقەوە دەمێنێ تا لە ساڵی ٩٦٢دا ئوتوی ساکسون (ئوتوی[١] مەزن) جڵەوی حوکم دەگرێتە دەست. لە سەرەتاکانی سەدەی پانزەیەم دا نورمانەکان دزە دەکەنە ناو ئیتاڵیای باشووری و حوکمڕانی سیسیل، ناپل، کاپوا[٢]، و ئاپولیا[٣] تا ساڵی ١١٣٧ دەگرنە دەست. ئەنجام لە ساڵی ١١٩٧دا یەکێتی لە نێوان حکوومەتی دەڤەری باشوور و ئیمپراتۆرییەتی موقەدەسی رومدا چێدەبێ.

لە سەدەکانی دوازدەیەم و سیانزەیەمدا ئیتالیا دوو ڕووداوی مێژوویی بە خۆیەوە دەبینێ کە بۆ توێژەرانی ئەدەبیاتی ئەم وڵاتە یەجگار گرنگن، کە بریتین لە: پەیدا بوون و سەرهەڵدانی دەوڵەتی —شاران لە باکوور و هەوڵ و کۆششی پاپا لە پێناوی دەسەڵاتی سیاسیدا.

لە سایەی سەرهەڵدانی چینی شارنشین و لەبەر ڕۆشنایی بڕەوی بازرگانیدا، گەلێك لە شارەکانی ئیتالیای باکووری و ناوەندی سەروەت و سامانێکی فرە بە دەست دێنن و بە جۆرێك دەسەڵاتی ڕامیاری خۆ فراوان دەکەن کە- هەر چەند بەناو بە پەیڕەوی ئیمپراتۆری موقەدەسی ڕوم یان ئیمپراتۆری بیزانس دەژمێردرێن- بە ئاشکرا خودموختارییان پێوە دیار دەبێ، فلورانس، ڤینیز، جەنەوا، پیزا، میلان، بولونی، پاویا، و کریمونا، لەڕووی بازرگانی، ڕامیاری، و ڕۆشنبیرییەوە بایەخێکی شایستە پەیدا دەکەن.

کاتێ کە هنری "٤" شەشەم، پاپائینوسنت-ی سێیەم "٥" بە سەر وەسێتی شازادە فردریك "٦" هەڵدەبژێرێ، مشتومڕێکی توند دەست پێدەکات و تاوەکو سەدەی چواردەیەم درێژە دەکێشێت. لەگەڵ مردنی هنریدا لە ساڵی ١١٩٧، سەنگی سیاسی پاپا زیاد دەکات، و لە لایەن ئوتوی برونسویکی "٧"، لە خانەدانی گویلف "٨" (ویلف)، و داواکاری پاشایەتییەوە پشتیوانی دەکرێت. ئیمپراتۆری لاو فردریکی دووەم، لە ماڵباتی گیبلین "٩"، سەرکردایەتی ئۆپۆزسیۆن لە ئەستۆ دەگرێت. هەڤرکی و ڕقبەرقێی نێوان ئەم دەوڵەت و شار و ئەو دەوڵەتی-شار، دەبێتە مایەی تاقم تاقمێنە و ململانێیەکی زۆر کە بە زۆری لە ناو شارەکاندا دروست دەبێ، شەڕێکی یەجگار زۆر ڕوو دەدا، بەڵام هیچ یەکێك لەو شەڕانە چارەنووسساز نابێ، لە ئەنجامدا هەردوو هەڤڕکەکە واتە گویلف-ەکان و گیبلینەکان لە پێناوی بردنەوەی شەڕەکاندا پەنا وەبەر شاهانی بێگانە دەبەن، و ئەم وەزع و حاڵە پەشێو و ناڵەبارە تا زەمانی مردنی دانتی (١٣٢١) بەردەوام دەبێ.

<u>نۆڕینێکی گشتی:</u>

زمانی ئیتالیایی دەچێتەوە سەر زمانی لاتینی — بەتایبەتی لاتینی کلاسیك- ئەم زمانە بەرە بەرە گەشە دەکات و دەخەملێ و تا دەوروبەری ساڵی ٩١٥ وەکو زمانێکی سەربەخۆ و تازە ئیعترافی پێناکرێت.

شان و شەوکەت و سەنگ و پایەی نووسەرانی گەورەی ئیمپراتۆریەتی ڕومی کۆن و قایل نەبوون و ئیعتراف نەکردن بە ئیتاڵی وەکو زمانێکی نوێ —نەك لەهجەیەکی میللی- کردییە کارێك زۆربەی نووسەرانی ئیتالیایی بەرهەمەکانی خۆیان بە لاتینی بنووسن. بۆیە ئەدەبیاتی ئیتالیایی لە سەدەکانی ناڤیندا، بەو مانا و چەمکەی ئەدەبیاتی فەڕەنساوی، ئەڵمانی، یا

ئەسپانیایی لە سەدەکانی ناڤیندا، نایەتە ئاراوە، بەلاّم لەگەلّ ئەمەشدا لە سەدەی سیانزەیەمدا، گوئیدو گوئینیچلی "١٠"، گوئیدو دل کولونە "١١"، قەشە فرانسیس ئاسیزی "١٢"، گوئیدو کاڤالکانتی "١٣" و چینودا پیستویا "١٤" کۆمەڵە شیعرێکی لیریکی جوان دەنووسن، و برونتولاتینی "١٥" ئەنسکلوپیدیایەك و، گەنجینە کە بەیتێکی فێرکاری درێژە لە قاڵب و چوارچێوەی ڤیز "١٦" یوندا دەنووسێت. هەڵبەتە دانان و نووسینی یەکەمین بەرهەمەی ئەدەبیی بەسەنگ و قەدر و ئیحتوباری جیهانی بۆ دانتی دەمێنێتەوە.

## دانتی (دورانتی) ئالیگێری
## (١٢٦٥- ١٣٢١):

دانتی ئالیگێری، شاعیری گەورە و دەوڵەتڕانی ئیتالیایی لە خانەدانی دیار و ناوداری گویلف-ە و لە فلورانس هاتۆتە دنیاوە، زانیارییەکی ئەوتۆ دەربارەی سەرەتاکانی ژیانی شاعیر لە بەردەستدا نییە، بەلاّم گومان لەوە نییە کە لەلای برونتولاتینیی زانای ئیتالیا خوێندویەتی. دانتی بە خۆی دەڵێت لە مانگی ٥/ ١٢٧٤دا، کە تەمەنی نزیکەی نۆ ساڵێك دەبێ، تووشی بیاتریچە پورتیناریی کیژی (کە هەشت ساڵان دەبێ) یەکێك لە دەوڵەمەندانی شاری فلورانس دەبێ و یەکسەر ئاشقی کیژە دەبێ. بیاتریچە دوای نۆ ساڵ بۆ یەکەمین جار قسەی لەگەڵدا دەکات و ئەمە دانتی دەکات بە شاعیر. دانتی هەمیشە لە دوورەوە، و تەنانەت پاش شووکردنی بیاتریچە بە پیاوێکی دیکە، دەیپەرستێ. مەرگی مەحبوبە لەساڵی ١٢٩٠دا شاعیر لە نائومێدییەکی قوڵدا غەرق دەکات. دانتی لە ساڵی ١٢٨٩دا لەگەڵ گویلفەکاندا دژی گیبلینەکان دەکەونە شەڕ و لە ئەنجامدا سەرکەوتنێکی گەورە بەدەست دێنن. ئەو دە ساڵێك لەوە دواتر لە سیاسەتی فلورانسدا ڕۆڵ و دەورێکی گەورە دەبینێ. لە ساڵی ١٣٠٠دا بۆ بالاّترین پایە و مەقامی سیاسی ناوچەیی بەرزدەبێتەوە: دەبێ بە یەکێك لەو شەش ڕابەرەی کە حوکمڕانی شار دەکەن. لەوە دواوە گویلفەکان دەبن بە دوو بەشەوە: سپییەکان (بیانکی)، یان میانڕەوەکان، و ڕەشەکان (نیری)،یان لایەنگرانی پاپا و تەرفدارانی ریفۆرمی بنەڕەتی. دانتی لە بەرەی سپییەکاندا دەبێ. لە ساڵی ١٣٠١دا توندوتیژی زیاد دەکات و ڕەشەکان بەسەر سپییەکاندا سەردەکەون، دانتی و هاوڕێیانی لە فلورانس دوور دەخرێنەوە. دانتی ئیدی هەرگیز بۆ فلورانس ناگەڕێتەوە، و دوا بیست ساڵی تەمەنی لە

شارانی جۆراوجۆردا بە گەشت و گەڕان دەقەتێنێ و لە هەموو شوێنێکدا دۆستان و هەوادارانی بە دڵ و بەگیان خزمەتی دەکەن. ئەنجام لە راڤینا"١٧"دا کۆچی دوایی دەکات و هەر لەوێندەر بە خاك دەسپێردرێ.

بەرهەمەکانی:

ژیانی نوێ (١٢٩١- ١٣٠٠):

ناوەڕۆك و هەوێنی ئەم بەرهەمە لە ئەشقی دانتییەوە بۆ بیاتریچە وەرگیراوە. ئەم بەرهەمە بریتییە لە سی و یەك شیعر –زیاتر لە قاڵبی سانت"١٨" و کنزونە"١٩" -دایە کە ئاوێتەی پەخشانە. لە فەسڵی یەکەمدا (دە شیعرە) باسی یەکتر دیتنی دانتی و بیاتریچە و کاریگەری جوانی و نازداری وی دەکرێ، لە فەسڵی دووەمدا (کە دە شیعرە) باسی ئەو موعجیزاتە دەکرێ کە سام و شکۆی ئەڤینی بیاتریچە دەخولقێنێ، لە فەسڵی سێیەمدا باسی مەرگی بیاتریچە و بیرەوەرییەکانی دانتی دەربارەی وی دەکرێت. دانتی لە بەشی کۆتایی ئەم فەسڵەدا، قۆناغی گۆڕانی ئەشقی دنیایی بیاتریچە بۆ نموونەیەکی ئەشقی ئاسمانی دەست پێ دەکات، ئەو قۆناغەی کە لە کتێبی بەهەشت-ی کۆمیدیای خواییدا کەماڵی پێ دەبەخشێت.

کۆمەڵە شیعری (ژیانی نوێ) بە پاشکوتارێکی (پاشەکییەك) دانتی کۆتایی دێت کە لەوێدا ئاماژە بە بیرۆکەی ئەفراندنی کۆمیدیای خوایی دەکات. دەڵێ لە دنیای خەونـدا هەنـدێ شتی دیتووە کە رێگەیان نەداوە شیعر بە بیاتریچەدا هەڵبڵێ مەگەر کاتێ کە بتوانێ لە شیعر گەورەتری پێدا هەڵبڵێ، یان کاتێك کە بتوانێ بە جۆرێ باسی بکات کە هەرگیز کەسێك نەیتوانی بێ باسی هیچ ژنێك بەو شایستەییە بکات.

(زیافەت- ١٣٠١- ١٣٠٩):

دانتی لەم بەرهەمەدا هەوڵیداوە کە فەلسەفە بۆ خەڵکی ئاسایی و عەوام باس بکات، و زیافەتێك لەپاشماوەی سەر سفرە و خوانی گەورە فەیلەسووفان ساز بدات، جا بۆیە زیافەتەکەی دانتی شتێکی ئەوتۆ نییە جگە لە وەرگێڕانێکی عەوام پەسندی هەندێ بەرهەمی ئالبرتوس ماگنوس"٢٠"، و توماس ئاکویناس"٢١" لەمەڕ حیکمەت و فەلسەفەی ئەرەستۆ بۆ سەر زمانی ئیتالیایی، ئەم بەرهەمەی دانتی لە کاریگەری بوئیتوس"٢٢"-یش بەدەر نییە.

دانتی پێوە بوو هەوەڵجار پێشەکییەکی چڕ و پڕ دەربارەی فەلسەفە بنووسێت، پاشان شرۆڤەی هەر یەکێك لەو ١٤ کنزونەیە بنووسێت کە پێدەچێ پێشتر نووسی بووبێ. بەڵام تەنیا پێشەکییەکە و سێ شرۆڤەی پێ دەنووسرێت.

لێرەدا بیاتریچە بە شێوەیەکی مەجازی لە فەلسەفەی خواییەوە تەجەلی دەکات، و لەم قۆناغەدا بیاتریچە وەکو بوونەوەرێکی خوایی ستایش دەکرێت.

دەربارەی زمانی میللی (١٣٠٤):

ئەم بەرهەمە قەواڵەو بەڵگەنامەیەکە بە پەخشان و بە زمانی لاتینی نووسراوە و، دانتی لێرەدا داکۆکی لە زمانی ئیتاڵیایی لەواری نووسینی ئەدەبیاتدا (لە هەنبەر لاتینی) دەکات، بایەخی ئەم قەواڵەیە تەنیا لەو بەرەڤانی و داکۆکییە زیندووەدا نییە کە لە زمانی خۆماڵی دەکرێ، بەڵکو لەوەش دایە کە زانیاری و روونکردنەوەیەکی دەوڵەمەندیشی دەربارەی شێوەزارە باوەکانی ئیتاڵیا لەخۆگرتووە، هەروەها لەو ئامۆژگارییانەشدایە کە دەربارەی کێش و وەزنی شیعری ئیتالیایی دەیکات. لێرەشدا دانتی لەو چوار کتێبەی کە مەبەستی بووە بیاننووسێت، تەنیا کتێبی یەکەم و هەندێ بەشی کتێبی دووەمی پێ تەواو کراوە.

دەربارەی دەسەڵات و پاشایەتی (١٣١٣):

ئەم بەرهەمە بە پەخشان و بە زمانی لاتینی نووسراوە. کە دانتی بیروبۆچوونی خۆی لەمەڕ جیاوازی قەڵەمڕەوی دەسەڵاتی حکوومەتی دنیایی و خوایی بە دوور و درێژی دەردەبڕێت، ئەم نامەیە بریتییە لە سێ کتێب: لە کتێبی یەکەمدا باسی زەروورەت و پێویستی حکوومەتی دنیایی بۆ جیهان دەکرێت، لە کتێبی دووەمدا، باس باسی ئەوەیە کە قازانجی خەڵکی روم لە پەیڕەویکردنی ویستی خوایی دایە، و لە کتێبی سێیەمدا باس باسی ئەوەیە کە دەسەڵاتی ئیمپراتۆران لە دەسەڵاتی خوداوەیە نەك لە دەسەڵاتی پاپاوە.

کۆمیدیای خوایی (سەرەتای ١٣٠٧- کۆتایی ١٣٢١):

کاریگەری فاکتەرە ژینگەیی و ئەدەبییەکان:

ئەگەر بمانەوێ لە هەر هەموو ئەو فاکتەرە ژینگەییانە بکۆڵینەوە کەکاریگەرییان بەسەر کۆمیدیای خواییەوە هەبووە ئەوا دەبێ مێژووی تەواوی فلورانس-ی سەدەی سیانزەیەم و ژیاننامەی تەواوی دانتی بنووسینەوە. گەندەڵی کڵێسا، شەڕی نێوان کویلفەکان و گیبلینەکان، دابەش بوونی گوییلفەکان بەسەر سپییان و رەشاندا، نەفی کردن و دوور خستنەوەی دانتی، تۆرانی دانتی لە فلورانسا، وەفاداری دانتی دەرهەق بە هەوادارانی خۆی و ئەشقی وی (هەڵبەتە لە هەموو فاکتەرەکانی دی گرنگترە) بۆ بیاتریچە، لە ئاسۆی بەرینی کۆمیدیای خواییدا رەنگیان داوەتەوە.

نێو ئەو نووسەرانەدا کە کاریگەرییان بەسەر ئەم شاکارە مەزنە بەشەرییەوە حاشا هەڵنەگرە، دەکرێ ناوی ئەمانەیان ببرێ: هۆمەر، ئەرەستۆ، سیسرون، ڤیرجیل، ستاتیوس، لوکانوس، بوئتیوس، ئالبرتوس، ماگنوس، توماس ئاکویناس، گوئیدو گوئینیچلی، گوئیدو کاوالکانتی، چینوداپیستویا، و برونتولاتینی.

کرۆك و چەمکی کۆمیدیای خوایی:

کۆمیدیای خوایی، کارێکی مەجازییە دەربارەی سەفەری روح بۆ سێ شوێنی ئەو دنیا، واتە بۆ دۆزەخ، بەرزەخ، و بەهەشت، روح خۆی بە تاقی تەنێ لە جەنگەڵ و بێشەیەکی ترسناکدا دەبینێتەوە. ئەقڵ (لە شێوەی ڤیرجیل-ی گەورە شاعیری رومی)دا بە دیار دەکەوێ و بە کون و کەلەبەر و کۆڵانەکانی دۆزەخیدا دەگێڕێ، و بۆ کێوی ئەعراف-ی (بەرزەخ) دەبات. لەوێدا روح، کە لە دۆزەخدا سزای سامناکی گوناهکاران دەبینێ، پالاوتە و پاکژ دەبێتەوە و شایستەیی ئەوە پەیدا دەکات کە بۆ سەر ئەستێران بچێ، هەنگێ حیکمەتی خوایی (لە شێوەی بیاتریچە)دا دەردەکەوێ، روح بەسێ بورجی بەهەشتیدا دەپەڕێنێتەوە و دەیگەیەنێتە مەلەکوتی بالا. گەلێك لە هێما و رەمزەکان، دوو یان سێ مانای، ئەخلاقی، مەزهەبی، و مێژوویان هەیە، هەندێ لەم رەمزانە هێشتاش هەر ئالۆز و نامەفهوم دیارن. ژمارەیەك کەسایەتی مێژوویی و ئەفسانەییش باس کراون کە هەر یەکێکیان نوێنەری چاکەیەك یان خراپەیەکی تایبەتین، هەندێکیان لە دۆزەخدا یان لە بەرزەخدا لە ئازار و عەزابا دەژین، و ژمارەیەکیان کە بەر لوتف و مەرحەمەتی خوا کەوتوون لە یەکێك لە بورجەکانی بەهەشتدا بە خۆشی و لە ناز و نیعمەتدا دەژین.

لەم بەرهەمەدا ژمارە رازدارەکانی وەکو ٣، ٧، ٩، دە و سەد زۆر بەکار هاتوون.

کۆمیدیای خوایی مەلحەمەیەکی (داستان) ئەدەبییە، بەڵام لە داستانانی وەکو ئیلیاد و سروودی رولان ناچێت، چونکە ئەمانە لەو ئەفسانە و گۆرانی و سروودانەوە وەرگیراون و هەڵێنجراون کە سالانێکی دوور و درێژ دەماودەمیان کردووە و پشتاوپشت لە نەوەیەکەوە بۆ نەوەیەکی دی هاتوون، لێ کۆمیدیای خوایی بەرهەمێکی خالیسەیە و زادە و خەڵقی خەیاڵ و بلیمەتی یەك مرۆڤە، کۆمیدیا، بە پێچەوانەی ئانئید-ەوە، ناچێتە خانەی داستانانەوە، چونکە کەسایەتی یەکەم (خودی دانتی) رەنگدانەوە و بەرجەستەی هەندێ چاکە و فەزیلەتی تەقلیدی و ئاسایی ولات نییە، بەڵام رەنگە لەو رووەوە کە رەنگدانەوەیەکی مامۆستایانە و وەستایانەی پەشێوی و پاشاگەردانییەکانی ئیتالیای سەدەی سیانزەیەمە بە داستانێکی نەتەوەیی بژمێردرێ. رەنگە گونجاوترین سەرناو بۆ ئەم بەیتە (داستانی سەدەکانی ناڤین) بێ، چونکە

ناوەڕۆك و تیمەکەی بریتییە لە زەمینە خۆشکردن بۆ ژیانی دوای مردن، کە مایەی دڵتەنگی و خەمباری مرۆڤی سەدەکانی ناڤین بوو.

<u>بونیاد و کێشی کۆمیدیای خوایی:</u>

دانتی ژمارەی رازداری (٣) هەم لە بونیادی کۆمیدیا و هەم لە قافیە بەندییەکەیدا زۆر بەکار دێنێ. ئەم بەیتە بریتییە لە سێ کتێب یان لە سێ چامە: دۆزەخ، بەرزەخ، بەهەشت، بەرزەخ و بەهەشت هەریەکەیان لە ٣٣ پارچە پێکهاتووە، و دۆزەخ-یش لە سی و سێ پارچە، ئەمە جگە لە پێشەکییەکەش کە لە حوکمی یەك پارچەدایە، بەم پێیە، ژمارەی پارچەکانی ئەم شاکارە سەد پارچەی خشتە. بەیتی کۆمیدیای خوایی چواردە هەزار و دوو سەد و سی دێڕە.

هەر بەیتێکی کۆمیدیا یازدە هیجا یان بڕگەیە، وەستان لەسەر دەنگی بڕگەی پێش کۆتاییە (و هەندێ جار لەسەر دەنگی کۆتایی یان دەنگی بەرلە دەنگی پێش کۆتاییە).

قافیەی شیعرەکان (کە لە داهێنانی خودی دانتییە) (ترزاریما - Terzarima)ی پێ دەگوترێ، (هۆنراوەیەکی سێ خشتەکییە لە ئەسڵدا ئیتاڵییە و قافیەکەی بەمجۆرەیە: Aba، cdc،bcb : "موشح". بەمجۆرە لە شیعری سێ بەند، یا سێ خشتەکیدا، لە ئەسڵدا ئیتاڵییە و قافیەکەی بەمجۆرەیە: cdc، bcb،aba (موشح). بەمجۆرە لە شیعری سێ بەند یان سێ خشتەکەیدا. بەیتی دووەم لە بەندی یەکەم، لەگەڵ بەیتی یەکەم و سێیەم لە بەندی دووەمدا هاوقافیە دەبێ و هەروەها بەیتی دووەم لە بەندی دووەم لەگەڵ بەیتی یەکەم و سێیەم لە بەندی سێیەم هاوقافیە دەبێ. بەمجۆرە:

______ ا
______ ب بەندی یەکەم
______ ا

______ ب
______ ج بەندی دووەم
______ ب

______ ج
______ د بەندی سێیەم
______ ج

زمانی کۆمیدیا:

زمانی کۆمیدیای خوایی دیالێکتی توسکا "٢٣" نییە کە دانتی دەورێکی یەجگار گەورەی لە گۆڕین و چەسپاندنیا وەکو شێوەزاری هەرە زاڵی وڵاتی ئیتاڵیا دیتووە. ئەم دیالێکتە بە بنچینە و بناغەی زمانی تازەی ئیتاڵیایی دەژمێردرێ.

چیرۆکی کۆمیدیا:

دانتی، زەوی بە چەق و ناوەندی جیهان دەزانێ. کاتێ ئەهریمەن و فریشتە لەگەڵ ویدا لە بەهەشتەوە بۆ سەر زەوی دێن، لە ئەنجامی بەرخوردی واندا، بیرێکی شێوە مەخرووتی چێدەبێ، کە سەرەکەی لە خاڵی چەقی زەویدا جێگیر دەبێ. ئەم بیرە هەزار بە هەزارە دۆزەخە، کە نۆ تەبەقەی هەیە و بەرەبەرە تەنگ و تەنگتر دەبێ.

شاری بەیتول مەقدس کەوتووەتە سەر بنکەی مەخروتەکە و بەرزترین خاڵی گۆی زەوی. لەوبەری گۆی زەوییەوە، لە خاڵی بەرانبەری بەیتول مەقدسدا، کێوێکی گەورە سەری بەرزکردۆتەوە کە ئەعراف یان بەرزەخی پێ دەگوترێ و دەکرێ بە حەوت سەکۆی سزاوە. باخی عەدەن یا بەهەشتی زەمینی کەوتۆتە قوللە و لوتکەی ئەم کێوەوە. نۆ بورج یان فەلەکی یەك چەق، یا ئاسمانان دەوری زەمینیان گرتووە، لە پاش بورجی کۆتاییەوە یان لە دوای دوا فەلەکەوە، بورجی بلورین یان عەرش دێ کە جێگەی خوایە.

أ- دۆزەخ:

دانتی لە دنیای خەونەکاندا خۆی لە بێشەیەکی تاریکدا، لەناو مەترسی و خەتەری گیانەوەرانی هۆڤیدا دەبینێتەوە. لەم کاتەدا ڤیرجیل (نوێنەر و نیشانەی ئەقڵ و ئاوەزی مرۆڤانی) پەیدا دەبێ، و ڕێنوێنی دانتی لە سەفەرەکەیدا (کە بیاتریچە بە مەبەستی ئامۆژگاری و پاکژبوونەوەی ئاشقەکەی خۆی ڕای دەسپێرێ) دەکات. بە دوو قۆڵی ڕێگەی سەفەر دەگرنە بەر. یەکەم قۆناغیان دەروازەی دۆزەخ، شوێنی گیانە ترسنۆکەکان و هەلپەرستانە. ئەوجا سەفەرەکە بۆ هەر نۆ بیرەکەی دۆزەخ بەردەوام دەبێ، چەند لە چینەکانی خواری خوارەوە نزیکتر دەبنەوە، سزاکان توندتر دەبێ. بەڵام لە سەرانسەری دۆزەخدا هەر سزایەك بەپێی جۆری خەتا و تاوانەکە دەگۆڕێ. لە چینی یەکەمدا گیانی منداڵانی تەعمید نەکراو و بێ دینان دیدەنی فەزیلەت و بێگەردی دەکەن، و ڤیرجیل بە خۆی یەکێکە لە دانیشتووانی ئەم تەبەقەیە. لە تەبەقەی دووەمدا، سێکس پەروەران، لە تەبەقەی سێیەمدا چڵێس و ورگ پەروەران، لە تەبەقەی چوارەمدا حەسوود و پیسکە و بەغیلان، لە تەبەقەی پێنجەمدا، تەمەڵ و توندە تەبیعەتان، و لە تەبەقەی شەشەمدا زەندیق و خوانەناسان

ئاکنجی و نیشتەجێن. تەبەقەی حەوتەم تایبەتە بە درِندە تەبیعەت و دەست درێژکاران، و هەمرو زۆرداران، پیاوکوژان، خۆ کوژان، توندرِەوان و دەست درێژیکاران بۆ سەر خوا و سروشت و هونەر لەوێندەر خرِبوونەتەوە. تەبەقەی هەشتەم دەکرێ بە دە بەشەوە و لە هەر بەشێکیدا بەریز ئەم سنفانە: ١- قورمساغان و دەغەڵبازان. ٢- ریاکاران. ٣- فرۆشیارانی ماڵ و پایەی روحانی. ٤- فاڵچییان و غەیبگۆیان. ٥- دزان. ٦- مونافقان. ٧- دزان و رێگران. ٨- راوێژکارانی تەزویرچی. ٩- بەدزمانان ١٠- ساختەچی و قەڵپکاران، سزا دەدرێن. تەبەقەی نۆیەم. بۆ شوومترین دۆزەخییان، واتە بۆ مەحکومان بەخیانەت و بەد ئەندێشی، تەرخان کراوە، ئەم تەبەقەیە چوار بەشی هەیە و لە هەر بەشێکیاندا بەریز ئەم سنفە خەڵکانەن: ١- خاینان بە کەسوکاران. ٢- خاینان بە نیشتیمان. ٣- خاینان بە میوانان. ٤- خاینان بە پێشەوایان و خێرخوازان و چاکەخوازان سزا دەدرێن. لە بنکی بەشی چوارەمدا و لە قولایی سەهوڵبەنداندا (زەمهەریر) -لە چەقی زەویدا- شەیتان دەژی، کە بە بەردەوامی بە ددانەکانی یەهودا "٢٤"، بروتوس "٢٥"، و کاسیوس "٢٦" دەجوێ. لە پشت بارەگا و ماڵەکەی شەیتانەوە، رچەرێیەکی پەنهان و ژێرزەمینی بۆ کێوی ئەعراف (بەرزەخ) دەچێ، و ڤیرجیل و دانتی لەم رێگەیەوە دەگەنە بەرزەخ.

ب- بەرزەخ:

دەکاتە بەشی دووەمی چامەی کۆمیدیای خوایی، لە چاو دۆزەخدا، کە بە تۆن و ئەوایەکی ترسناك نووسراوە، زۆر نەرم و خۆشە، گەرچی رەنج و عەزاب بەسەر سەرانسەری بەرزەخدا زاڵە، بەڵام هاماجێکی هەندێ گەشبینانە و ئومێدەوارانەی هەیە، چونکە شوێن و جێگای گوناحکارانی تۆبەکارە -کە لە ئەنجامدا دەچنە بەهەشت. بەرزەخ حەوت سەکۆ و یەك حەوشە و مەیدانە. خەمساردان و بێ موبالاتان و ئەوانەی کە بەبێ ئەڤینی خوا مردوون، لە حەوشە و مەیدانەکەی بناری کێوەکە پاڤژ دەبنەوە، لەو حەوت سەکۆ جیاوازەشدا ئەوانەی کە گوناحی گەورەیان کردووە، واتە خۆپەسندی و لوتبەرزی، حەسوودی، رق، تەمەڵی، چاوچنۆکی و زێدەمەسرەفی، چلێسی و زیادەخۆری، و نەفسپەرستی، هەر سنفەیان لە سەکۆ و خانەیەك دا دەژین. دانتی تازیاتر لە لوتکەی کێوەکە نزیك دەبێتەوە بۆی دەردەکەوێ کە سەختی و دژواری سزاکە بە گوێرەی گەورەیی و بچووکی گوناحەکە کەم و زیاد دەبێ.

کاتێ کە دانتی و ڤیرجیل لە لوتکەی کێوەکە نزیك دەبنەوە، بیاتریچە دەردەکەوێ و وەکو رێنوێن جێی ڤیرجیل دەگرێتەوە، و لەبەر ئەوە سەرزەنشتی دانتی دەکات کە کەسێکی کەم تەقوا و عیبادەتە بەڵام بۆ باخی عەدەن و پاشان بۆ بەهەشت رێنوێنی دەکات.

ج- بەهەشت:

(فیردەوس یان بەهەشت نۆ مەداری هەیە: مانگ، عەتارد، زوهرە، خۆر، مەریخ، مشتەری، زوحەل و مەدار "بورج، فەلەك"ی جێگیران و بورجی بورجان).

دانتی کە بە ڕێنوێنی بیاتریچە دەچێتە سەرێ شکۆ و مەزنایەتی ئەفلاك (بورجان) دەبینێ لە سێ بورجی یەکەمدا، ئەو ڕوح و گیانانە دەبینێ کە لە ڕێگەی خواپەرستی و پارێزکارییەوە چوونەتە بەهەشت، بەڵام ئەوەندە پارێزکار و خواپەرست نەبوونە کە بگەنە باڵاترین پلە. لە بورجی مانگدا ئەو گیانانە دەژین کە درێغیان لە ئەنجامدانی نەزرەکانیان کردووە، لە بورجی عەتاردا ئەو کەسانە دەبینرێن کە لە دادگەریدا کەمتەرخەمییان کردووە، ئەو کەسانە لە بورجی زوهرەدان کە لە ڕێگەی دادپەروەری لایانداوە. لە چوار بورجەکەی دواتردا ئەوانە دەژین کە نموونەی فەزیلەتی بنچینەیین: لە خۆردا زانایان و دووربینان، لە مەریخدا دلاوەران و جوامێران، بەتایبەتی خەباتکاران، لە مشتەریدا دادپەروەران، بەتایبەتی فەرمانڕەوایان، و لە زوحەلدا عیبادەتکاران، بەتایبەتی گیانی چلەکێشان و سۆفییان، بورجی هەشتەم، بورجی جێگیرەکانە کە قەرینە و هاوتای بەهەشتی عەدەنە، لێرەدا دانتی خەونی ڕزگاری ئادەمیزاد، سەرکەوتنی مەسیح، و ئادەمی تازە دەبینێ، لەم بورجەدا فەزیلەتی سییانەی خوایی، واتە ئیمان، ئومێد، و چاکە تەجلی دەکات و بەرجەستە دەبێ، بورجی نۆیەم، بورجی بلورین یا داینەمۆی بنچینەییە کە تەبیعەت، زەمان و جووڵە لەوێندەرەوە دەست پێدەکات. لە دوای ئەوە ئیدی عەرشی باڵایە، واتە (بەهەشتی ڕاستەقینەی بەسیرەت، و یەکپارچەیی و فەڕ و بەرەکەت، کە لەوێدا، خواستی ئادەمی دەگاتە ئارامی لە پاڵ خێری ڕەها و لە خەیاڵ دەردەچێ و حەقیقەتی موتڵەق بە دەست دێنێ). لێرەدا کە یەزدان هەمر هەموو قەدیسان و فریشتە و مەلایەکەتانی لە نور و ڕووناکی بوونی خۆی هەڵکیشاون و جوانی کردوون. ئەمە بەهەشتی ڕاستەقینەی ئەندێشەیە کە هەموو جیهانە مەلەکوتییەکانی دیکە بە یەکترەوە دەبەستێت. دانتی لێرەدا لە ڕاز و نهێنی Trinity"[٢٧] سێینە "تەسلیپ" و یەکبوونی ئادەمیزاد لەگەڵ خوادا حاڵی دەبێ، و مەبەست و ئامانجی بنچینەیی سەفەرەکەی ئەویش هەر ئەمەیە. بەمجۆرە کۆمیدیاکەی تەواو دەبێ و کۆتایی دێت.

کورتەیەکی رەخنەکان:

بەلای کەمەوە یەکێك لە رەخنەگرەکان (چارلز هال گرانجنیت) دانتی بە یەکێك لەو سێ شاعیرە دەزانێ (دووەکەی دی هۆمەر و شکسپیرن) کە گەشەیان بە توانای خەیاڵی مرۆڤ داوە. جگە لە چەند راوبۆچوونێکی دژ، ژمارەیەکی زۆر لە ئەهلی ئەدەب و مێژوونووسانی مێژووی ئەدەبیاتیش دانتی بە یەکێك لەو ٥- ٦ گەورە شاعیرە دەزانن کە تاکو ئێستا لە ئاسمانی شیعر و ئەدەبی جیهاندا دەدرەوشێنەوە. رازی گەورەیی و شکۆی دانتی لە شێوەی پەرداخ و نێوەرۆکی بەرهەمەکانیدایە.

یەکێك لە لایەنە هەرە سەیرەکانی قەریحەی دانتی دەوڵەمەندی خەیاڵە. شێوازی وەسفکاری دانتی دەکرێ بە میلتن بەراورد بکرێت: ئەم شاعیرە ئینگلیزە لە باسی دۆزەخدا پەنا وەبەر هێڵە گشتی و موبالەغە ئامێزەکان دەبات، دانتی بە پێچەوانەی ئەوەوە پابەندی وەسفی ورد و چڕ و پڕە. میلتن لایەنی تەجریدی دەگرێت، دانتی کەسێکی واقیعی و بابەتگەرایە و بایەخ بە وردەکارییان دەدات.

هەندێ لە تایبەتمەندییە ئیجابییەکانی دیکەی شێوازی دانتی بریتییە لە: قەرینەسازی، هاوسەنگی، تیباق و لوتکەی بەرهەمەکانیەتی.

هەڵبەتە عەیب و ئیرادی ئەوەش لە دانتی گیراوە کە بەرهەمەکانی یەك نەوا، پەخشان ئامێز (بەتایبەتی لە کۆپلە و پارچە فەلسەفییەکاندا)، ئاڵۆز و نامۆن.

هەر چەندە دانتی مامۆستای هونەر و شێوازە، بەڵام گەورەترین هونەری وی لەواری شاعیریدا، لە هزر و خەیاڵ، رێچکە و رێباز، راوبۆچون، و دید و گۆشەنیگای ئایینی و ئەخلاقی ئەودا پەنهانە. هەر چەندە هەندێ جار دوژمنانی خۆی دەداتە بەر ئاگری دۆزەخ و بێزاری خۆی لێیان دەردەبڕێ و لەم رووەوە مایەی سەرزەنشت و گازاندەیە، بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا (کومیدیای خوایی)یەکەی بەیتێکی یەجگار ئەخلاقییە. لە سەرانسەری ئەم بەیتەدا کە داستانی ئادەمیزادە، بنیادەم رووبەرووی داوەرێکی دادپەروەرە کە بەپێی یاسائێن بنجبڕ، پاداشت و سزای ئەو (بنیادەم) رادەگەیەنێ. دۆزەخ و بەرزەخ و بەهەشت چەند قۆناغێکن لە گۆڕانی روحی بەشەر، لە داننان بە گوناحکاری و درێوی خەتا و تاوان، لە پەشیمانی و تۆبەکاری، و سەفای روحی و ئەشق و ئەڤین.

هەڵبەتە ئەم بەیتە کاریگەرییەکی جیهانی گەورەشی هەیە، و لەمە پتر چاوەڕوانی چ لە شاعیرێك دەکرێ؟ دانتی هەر هەموو ژیان و سروشت، وەکو چۆن لێی دەگات، دەکات بە شیعر.

خەیاڵی بەرزی وی باڵی بەسەر سەرانسەری جیهاندا کێشاوە، شیعری وی هەر هەموو سنوورێکی بەزاندووە و گەییوەتە هەموو شوێنێك.

بە کورتی، بتەوی و کۆکی پەیڤ و زمان، قوڵی هزر و بیر، راشکاوی، کورتبڕی و جوانی و دلگیری وشە و پەیڤان، و راستگۆیی و دڵسۆزی لە تایبەتمەندی و خەسڵەتەکانی بلیمەتی دانتی-ن.

# پەراوێز:

١- ئوتـوی مـەزن (٩١٢- ٩٧٣ی ز) ئیمپراتـۆری موقەدەسـی روم (٩٦٢- ٩٧٣) و شـای ئـەڵمان (٩٣٦- ٩٧٣).

٢- کاپوا: شارێکە لە باشووری ئیتاڵیا.

٣- ئاپولیا: ناوچەیەك لە باشووری ئیتالیا.

٤- هنری شەشەم (١١٥٦- ١١٩٧): ئیمپراتۆری موقەدەسی روم و شای ئەڵمانی (١١٩٠- ١١٩٧).

٥- پاپا ئینوست-ی سـێیەم (١١٦١- ١٢١٦ی ز) پاپـا بـوو لـە سـاڵانی ١١٩٨- ١٢١٦، و زانایـەکی گەورەی خواناسی و ئیلاهییاتی مەسیحی بوو.

٦- شازادە فردریك (١١٩٤- ١٢٥٠ی ز): پاشان دەبێ بە ئیمپراتۆری موقەدەسی روم، شای ئەڵمان، شای سیسیل، و شای ئورشەلیم و بە فردریکی دووەم ناسراوە.

٧- ئوتـو برونـسویکی (١١٧٤- ١٢١٨ی ز): ئیمپراتـۆری موقەدەسـی روم (١٢٠٩- ١٢١٥)، و شـای ئەڵمان (١١٩٨- ١٢١٥).

٨- گویلف (ویلف): دەستەیەکی سیاسی جەماوەری ئیتاڵیای ئاخر و ئـوخری سـەدەکانی نـاڤین بـوو کـە لایەنگری دەسەڵاتدارێتیی پاپا بوو.

٩- گیبلین: گرووپێکی سیاسی فیودالانی ئیتالیای ئاخر و ئوخری سـەدەکانی نـاڤین بـووە کـە لایـەنگری دەسـەڵاتدارێتی ئیمپراتۆر بوو.

١٠- گوئید گوئینیچلی (١١٣٥- ١٢٧٦ی ز): شاعیرێکی ئیتالیاییە.

١١- گوئیدو دل کولونە (سەدەی سیانزەیەم) شاعیرێکی سیسیلی بووە.

١٢- فرانسیس ئاسیزی (١١٨٢- ١٢٣١ی ز): لە ئاسیزیی ئیتاڵیا لە دایکبـووە، لـە قەشـە گـەورەکانی مەسیحی بووە و دامەزرێنەری فیرقەی فرانسیسیان بووە.

١٣- گوئید و ڤالکانتی (١٢٥٩- ١٣٠٠ی ز): شاعیر و فەیلوسووفێکی ئیتالیاییە و لە فلورانس هاتۆتە دنیاوە.

١٤- چینودا پیستویا (١٢٧٠- ١٣٣٦ی ز): شاعیرێکی ئیتالیاییە.

١٥- برونتولاتینی (١٢٢٠- ١٢٩٤ی ز) : ئەدیب و سیاسەتوانێکی ئیتالیاییە.

١٦- ڤیزیون: "ژانرێکی ئەدەبی رەواجداری سەدەکانی ناڤین بووە و بریتییە لەو شیعرانەی کە شەرحی خەون و خەیاڵ و موکاشەفە دەروونییەکانی شاعیر دەکەن.

١٧- راڤینا: ویلایەتێکە لە باکووری ئیتاڵیا، لە نزیکی دەریای ئادریاتیکە.

١٨- سانت (سونێت- Sonnet): جۆرە قەسیدەیەکی چواردە بەیتییە لەسەر وەزنی ئیامبیك و قافیەدارە، ئەم جۆرە شیعرە لە سەرەتاکانی سەدەی سیانزەیەمدا لە ئیتاڵیادا برەوی سەندووە .

١٩- کنزونە- Canzone: جۆرە شیعرێکی لیریکی ئیتاڵیایی سەدەکانی ناڤینە. ئەم شیعرە بریتییە لە چەند بەندێك، هەر بەندێك بریتییە لە ٧- ٢٠ بەیتی یازدە بڕگەیی.

٢٠- ئالبرتوس ماگنوس (١٢٠٦- ١٢٨٠ی ز): بە مامۆستای هەمووان ناسراوە، لە فیرقەی دومینیکیانە و خەڵکی ئەڵمانیایە.

٢١- ئاکویناس (١٢٢٥- ١٢٧٤): بە حەکیمی ئەڵمانی ناسراوە، فەیلەسووفێکی ئیتاڵیاییە و گەورەترین کەسایەتی فەلسەفەی مەدرەسییە.

٢٢- بوئیتوس: ئانیکیوس مانلیوس سورینوس بوئیتوس (٤٧٥- ٥٢٥): فەیلەسووفێکی رومی و لە وەزیرانی تیودوریك-ی گەورە بوو. بە تۆمەتی خیانەت زیندانی کرا و لەو رۆژگارانەدا کە لە زینداندا چاوەڕوانی مەرگ بوو، کتێبە بەناوبانگەکەی (تەسەلای فەلسەفە)ی نووسیوە.

٢٣- توسکانی: ناوچەیەکە لە ئیتاڵیای ناوەندی کە لە ئاخر و ئۆخری سەدەکانی ناڤیندا و لە سەردەمی رینسانسدا لە مەڵبەندە گرنگەکانی هونەر و زانست بوو.

٢٤- یەهودا: یەکێك بوو لە یاوەرانی مەسیح کە خیانەتی لێکرد.

٢٥- بروتوس: (٨٥- ٤٢ی پ.ز): سیاسەتوانێکی رومی بوو کە لە پیلانی کوشتنی قەیسەردا بەشدار بوو.

٢٦- کاسیوس (- ٤٤ی پ.ز): یەکێکە لەو فەرماندە رومییانەی کە دەستی لە پیلانی کوشتنی قەیسەردا هەبوو.

٢٧- سێینە Trinity: (لە مەسیحییەتدا) سێینەیی خوایە لەڕووی کەسایەتییەوە، کە لە هەمان کاتدا لەڕووی تەبیعەتەوە یەکێکە. ئەم سێ کەسایەتییە بریتین لە: باب، کور، روحی قودس.

## ئەفسانەناسی (Mythology)

دووجۆرە دوو جۆرە ئەفسانە کاریان کردووەتە سەر ئەدەبیات، و هونەر و موسیقای جیهان: ئەفسانانی کلاسیك و ئەفسانانی نورس (جەرمەنی). دیارە ئەم ئەفسانانە پەیوەندییان بە سەرانسەری ئەفسانانی دنیاوە هەیە، و زۆر بۆچوون و تیۆری جیاواز لەمەڕ رەگ و ریشەی ئەفسانان هەیە.

تیۆری سروشت:

بەگوێرەی ئەم تیۆرییە ئەفسانە زادە و بەرەنجامی هەوڵ و تەقەلای مرۆڤە بۆ زانین و ناسینی دیاردە سروشتییەکانی وەکو تۆفان، هەڵهاتنی خۆر، گۆڕانی وەرزەکانی ساڵ و... هتد.

تیۆری سایکولوژی:

بەپێی ئەم تیۆرییە، ئەفسانە هێما و رەمزی ململانێ و کێشمانەکێشە رەگەزی و سۆزدارییەکانە.

تیۆری کۆمەڵناسی:

بەگوێرەی ئەم تیۆرییە، ئەفسانە بۆ ئەوە هاتووەتە ئاراوە کە دیاردە و رووداوەکان بگێڕێتەوە، تۆماریان بکات، ئاراستەیان بکات، و داب و نەریت و خووخدەکان، یاساورێسا عیبادەتکارییەکان، و بەها ئایینی و ئەخلاقییەکان ریشاژۆبکات و بیانچەسپێنێ و بیانپارێزێ. بەگوێرەی ئەم تیۆرییە، ئەفسانە گێڕانەوەیەکی زیندووی رووداوە کۆنەکانە کە لەپێناوی پاراوکردن و رازیکردنی خواستە قوڵە مەزهەبییەکان، ئارمانج و مەبەستە ئەخلاقییەکان، تەبایی کۆمەڵایەتی و تەنانەت پێداویستییە واقعییەکانی بەشەر دەگێڕدرێتەوە. ئەفسانە کارایی یاسا و رێسا مەزهەبییەکان زامن دەکات، زۆر پەندی بە کەڵکی تێدایە بۆ رێنوێنی کردنی بەشەر.

## ئەفسانانی کلاسیك

ئەفسانانی خولقان:

پەیدا بوونی ئاسمان و زەوی.

ئەو ئەفسانانەی کە باسی خولقانی ئاسمان و زەوی و توخم رەگەز و پێکهاتەکانیان دەکەن زۆر ئاڵۆز و جیاوازن لە یەکتری:

أ- ئۆقیانوس دەوری هەموو دەریاکان و وشکایی دەگرێ (هومەر).

ب- شەو و تاریکی هەموو شوێنێ دەگرێت و رووناکی لەوەوە پەیدا دەبێ.

ج- لە زەمانەوە، هەیولای بێ شێوە پەیدا دەبێ، لەم هەیولایەوە، شەو، غوبار، و ئەتیر سەر هەڵدەدەن، زەمان دەبێتە مایەی ئەوەی کە گەرد و غوبار بە دەوری ئەتیردا بگەرێ تا سەرەنجام شێوەیەکی هێلکەیی پەیدا دەکات، و دەبێ بە دوو لەتەوە، واتە ئاسمان و زەوی، ئەڤین لە ناوجەرگەی ئەم ئاوێتە هێلکەییەوە پەیدا دەبێ.

د- هەیولای بێ شەکڵ و شێوە لە بۆشایی و قەوارە و تاریکی پێکهاتووە، کە گایا (زەوی دایك)، ئەڤین، و شەو لەوەوە پەیدا دەبن، لە گایاشەوە ئورانۆس (ئاسمان)و پاشان زەوی دێتە ئاراوە.

پەیدابوونی خودایان:

یەکەمین بنەماڵە: گایاو ئورانوس:

لە ئەنجامی ویساڵی گایاو ئورانوسدا سیانزە تیتان، سێ سیلکوپ، و سێ هکاتونشیر دێنە ئاراوە. تیتانەکان Titans کۆمەڵە دێوێکن نیشانەی هەندێ نێروی سروشتی و بەدەنی یان دیاردەکانن، کە دیارترینیان ئەمانەیە هوپریون Hyperion ئوکیانووسی Occanus، کرونوس Cronus، ئەتلەس Atlas، و پرومتیوس Prometheus. سیلکوپەکان Cyclope کۆمەڵە دێوێکی بنیادەخۆرن و یەك چاویان لە ناوەندی تەوێڵیان دا هەیە و بە هێمای هەورەتریشقە دەژمێردرێن. هکاتونشیرەکان Hecatonchire هەیولای سەد دەستن و هیمای بوومەلەرزەن. بەجۆرە کۆتایی بە دەسەڵاتی گایا و ئورانوس دێت: ئورانوس کە ترس لە توانای منداڵەکانی خۆی، واتە سیلکوپەکان و هکاتونشیرەکان پەیدا دەکات، لەتارتاروس"١" Tartarus دا حەپسیان دەکات. کرونوس لەسەر داوای گایا، بە داسێك ئەندامی ئورانوس دەبرێ و زیندانییەکان ئازاد دەکات. خوێنی ئورانوس دەرژێتە سەر زەوی و لەم خوێنەوە هەندێ دێو پەیدا دەبن کە پێیەکانیان ئەژدیهایە، خواوەندانی تۆڵە پەیدا دەبن کە گیسویان مارە (ئەم خواوەندانە ناویان —ئەرینوس Erinys، و ئومیندس Euminides-ە)، و هەروەها هەندێ حۆریانی ئاوازخوێن پەیدا دەبن (کیژانی جەنگاوەر کە نێزە لە لەشیاندا دەرۆێ). ئورانوس لێدەکەوێ.

دووەمین ماڵبات: کرونوس و راء

لە ئەنجامی ویساڵی کرونوس و راءدا هەندێ زورییەت لە دایك دەبن کە دواتر دەبن بە خواوەندانی ئولەمپی. ئەم خواوەندانە (زیوس- Zeus، پوسیدون- Poseidon، هادیس-

Hades، هیرا- Hera، دمتر- Demeter، و هستیا- Hestia)یان ناوە. کۆتایی دووەمین مالّبات بەم شێوەیە دەگێڕدرێتەوە: کە پێشبینی ئەوە دەکرێ کە کرونوس بە دەستی یەکێك لە فەرزەندەکانی خۆی لێدەخرێ، لە ترساندا پێنج منالّی یەکەمی خۆی دەخوات. شەڕ لە نێوان تیتانەکان و منالاّنی کرونوس و راءدا هەلّدەگیرسێت.

تیتانەکان دەشکێن و کرونوس لە پاشایەتی دەخرێ. هەموو تیتانەکان، جگە لە ئەتلەس (کە دنیای لەسەر شانەکانی خۆی راگرتووە)، پرومتیوس، و ئوکیانوس لە تارتاروسدا حەپس دەکرێن.

سێیەمین مالّبات: زیوس و هرا.

خواوەندە سەرەکییەکانی ئەم بنەمالّەیە ئەمانەن:

| ناوی یونانی | ناوی رومی | دەوروبەری بەرپرسیاریەتی |
|---|---|---|
| زیوس، کوڕی کرونوس و را ** | جوپیتەر | پاشای خودایان و ئاسمان |
| هیرا، خوشك و هاوسەری زیوس | ژونون | مەلیکەی خودایان، پشت وپەنای زەوجین |
| پوسیدون، برای زیوس | نبتون | خواوەندی دەریا |
| ئافرودیتە، کیژی زیوس و دیون | ڤینوس | خواوەندی ئەڤین |
| ئاریس، Ares کوڕی زیوس و هیرا | مارس | خواوەندی جەنگ |
| هادیس، برای زیوس | پلوتون | خواوەندی جیهانی ژێرزەوی (هادیس) |
| هسیتا، خوشکی زیوس | وستا | خواوەندی کوانگی ئاگر، و ژیانی خێزانە |
| خوشکی زیوس | کریس Ceres | خوای بەروبووم و کشتوکالّی |
| هفائیستوس، کوڕی زیوس و هیرا | ڤلکان | خوای ئاگر و ئاسنگەری |
| ئاپولون، کوڕی زیوسو لیتو- Leto | ئاپۆلۆن | خوای خۆر، شیعر، مۆسیقا، پزیشکی |

| هرمس، کوڕی زیوس و مایا- Maia | میرکوری | تەتەری خوایان، خوای دزی، بازرگانی |
|---|---|---|
| دیونوسوس، کوڕی زیوس و سملە Semele | باکوس | خوای فەڕ و شەڕان |
| پرسفونە، کیژی زیوس و دمیتر | پروسرپینا | خواوەندی جیهانی ژێرین، هاوسەری هادیس |
| ئارتیمیس، کیژی زیوس و لیتو | دیانا | خواوەندی مانگ و شکار، پارێزەری داوێن پاکی |
| ئاتینە، کیژی زیوس کە لە تەوێڵی ئەوەوە پەیدا دەبێ | منیرڤا، پالاس | خواوەندی حیکمەت، شەڕ، چنین، رستن و هونەرەکانی ناوماڵ |

خواوەندانی ئۆڵەمپی وەکو ئادەمیزاد وان، زۆر بەتوانا و کەمنەخلاق و بگرە بێئەخلاقن، هەموو سۆزە بەشەرییەکانی وەکو حەسوودی، ئارەزووی سێکسی، و کینەکێشیان تێدایە. خواردن و خواردنەوەی خواوەندان هەنگوین و گیا و سەوزەی بەهەشتییە. شوێنیان کێوی ئولەمپە"٢" Olympes، کە شوێنێکی تەواو یوتوپیاییە، بەڵام کێوی ئولەمپ لە تسالی"٣" Tessaly، تەنیا بە رەمزێکی ئەو بارەگایە دەژمێردرێ.

پەیدابوونی ئادەمیزاد:

زۆر ریوایەتی جیاواز لەمەڕ پەیدابوونی ئادەمیزاد هەیە:

أ- ئادەمیزاد لە گایا (زەوی دایك) دەبێ، و رەنگە هاوتەمەن و هاوساڵی خواوەندانی ئولەمپ بێ.

ب- پرومیتوس، ئادەمیزاد لە ئاو و گڵ دەخولقێنێ، و ئەو و ئیپی میتوس-ی Epimetheus برای هێزوتوانای جۆراوجۆری پێ دەبەخشن (بە ئادەمیزاد).

کەسایەتییە سەرەکییەکانی ئەفسانە بەناوبانگە کلاسیکەکان ئاتالانتە"٤" Atalanta:

ملیاگر Meleager، بەرازەکەی شاری کالیدون"٥" دەکوژێت و پاشان باسی ئەو زەرەر و زیانانە بۆ مامەکانی دەکات کە بەرازی نێوبراو لە ئاتالانتەی داوە. ملیاگر، مامەکانی لەناو دەبات، بەڵام بەخۆیشی دەمرێت، چونکە ئالتیا Altheaی دایکی، ئەو بسۆتەی (سەرەبزووت) کە ژیانی ملیاگر-ی پێوە بەندە، دەخاتە ئاگرەوە. ئاتالانتە، پاشان پێشبڕکێی غاردانێ لەگەڵ هیپومینسدا Hippomenesدا دەکات و دەدۆڕێ و زەماوەندی لەگەڵدا دەکات.

ئادونیس، Adonis:

لاوێکی بەژن و بالاّ رێك و پێکە کە ئافرودێتە حەزی لێدەکات بەلاّم ئادونیس ئەڤینی وی رەتدەکاتەوە. لە ئەنجامدا، ئادونیس لە راوی بەرازە کێوییەکدا دەکوژرێ. ئافرۆدێتە گوڵاڵە سورە لە خوێنەکەی ئەو دەڕوێنێ.

ئیخۆ Echo:

یەکێکە لە حۆرییانی دەنگبێژ کە بە هۆی زۆروێژییەوە بەوە مەحکوم دەبێ کە هەرگیز لێو لەبەر یەکدی هەڵنەیەنێ، تەنیا بۆ وەلاّمدانەوە نەبێ. ئیخۆ ئاشقی نارکیسوس Narcissus دەبێ، بەلاّم نارکیسوس خۆی لێ دەدزێتەوە، ئیخۆ لە سوێی ئەشقدا بە جۆرێ دەتوێتەوە کە جگە لە دەنگێك هیچی تری لێنامێنێتەوە. نارکیسوس-یش کە وێنەی خۆی لە سەرچاوەیەکدا دەبینێ، ئاشقی جوانی خۆی دەبێ، و بە دەم سوێی ئەشقەوە دەمرێت. گوڵی نێرگز لەسەر گۆڕەکەی دەڕوێ.

ئیراخنە، Erachne:

کیژێکی جوانە کە لە واری تەشی رێسیدا دەکەوێتە رکابەری ئاتنە، و ئاتنە غەزەبی لێدەگرێ و دەیکات بە جاڵجاڵۆکە.

ئاکتایون- Actaeon:

بابایەکی راوچییە کە ئارتەمیس بە رووتی لە ئاودا دەبینێ، ئارتەمیس غەزەبی لێدەگرێ و دەیکات بە گا کێوی و تاژییەکانی ئاکتایون-یش لەت و پەتی دەکەن و ورگ و ریخۆڵەی هەڵدەدڕن.

ئورفیوس Orpheus:

فەرزەندی ئاپولون و کالیوپەیە"٦" Calliokpe، شاعیر و چەنگژەنێکی جادووگەرە. ئورفیوس لەگەڵ ئوروودیکەدا، کە لە پەری و حۆرییانە، زەماوەند دەکات. مارێك بە ئوروودیکەوە دەدات و دەمرێت. پلوتون، لەسەر داوا و تکای ئورفیوس، رێگەی دەدا کە ئوروودیکە بۆ سەر زەوی بگەڕێنێتەوە —بەو مەرجەی کە ئورفیوس تا دەگاتە سەر زەوی ئاوڕی پشتەوە نەدا و سەیری ئوروودیکە نەکات. لە رێگەدا تاسە و کەڵکەڵە بەسەر ئورفیوسدا زاڵ دەبێ و ئاوڕی پشتەوە دەداتەوە و دەمودەست ئوروودیکە بۆ جیهانی ژێرین دەگەڕێتەوە. دوای ماوەیەك ئورفیوس-یش بۆ هەمیشە دەچێتە پاڵ وی.

ئیۆ- Io:

ئیۆ، کیژێکە کە زیوس حەزی لێدەکات، و دەیکات بە نوێنگینێك تاوەکو لە خەشم و غەزەبی هیرا بە دوور بێ، لێ خەرەنگێزێك تێی دەئاڵێ و بەردەوام ئازاری دەدات. سەرەنجام زیوس، پشتگوێی دەخات، و ئیۆ دیسان شێوەی مرۆڤ پەیدا دەکاتەوە.

پاندورا- pandora:

(خواوەندان پاندۆرا بە باوڵێکەوە بۆ ئیپی متیوس بە دیاری دەنێرن).

پاندۆرا هوشیار دەکرێتەوە کە سەری باوڵەکە نەکاتەوە، بەڵام پاندۆرا لەڕووی فوزوڵیەتی ژنانەوە باوڵەکە دەکاتەوە و هەر هەموو ئەم بەڵایانەی کە تا ئێستا یەخانگیری مرۆڤ بووە، لەو باوڵەوە دێنە دەرێ. (تاقە ئومێدێك کە بۆ سوکنایی بەشەر مابێتەوە لە بنی باوڵەکەدا دایە).

پرومتیوس- Prometheus:

یەکێکە لەو تیتانانەی کە ئاگری لە رۆژ دزی و بۆ بەشەری هێنایە سەر زەوی. زیوس، سزای دەدات و لە کێوی قەوقازدا کۆت و زنجیری دەکات. داڵاشێکیش بەردەبێتە گیانی پرومتیوس و ئەندامەکانی بەدەنی دەخوات (و شەوانە ئەندامەکان دەڕوێنەوە). پرومتیوس ئاگای لەم سڕەیە کە هەرکول-ی کوڕی زیوس، بە تەمایە بابی خۆی لە دەسەڵات بخات، بەڵام ئەم نهێنییە دەپارێزێ. لە ئەنجامدا هەرکول، پرومتیوس ئازاد دەکات و داڵاشەکە دەکوژێت.

تانتالوس- Tantalus:

پاشای لیدیایە، راز و نهێنی خوداوەندان ئاشکرا دەکات. گەنجەفە بە توانای رەهایان دەکات، و گۆشتی ئادەمیزادیان، واتە گۆشتی کوڕەکەی خۆی، دەرخوارد دەدات، زیوس بەوە حوکمی دەدا کە تینوو و برسی لە تار تاروسدا بژی، بە جۆرێ کە هەموو بەدەنی تا گەردنی لە ئاوا غەرق بێ بەڵام نەتوانێ ئاو بخواتەوە، بەسەر سەرییەوە میوە بە لق و پۆپی درەختانەوە شۆڕ بووبێتەوە بەڵام نەتوانێ بیانکاتەوە.

تسیوس- Theseus:

پاڵەوانێکی ئەتینییە. بە کۆمەکی ئاریادنە"٧" - Ariadne، مینوتاور"٨" - Minotaur، (گا بنیادەم) لە ملەکانی کریتدا دەکوژێ، پاشان تسیوس، ئاردیانە بەجێدێڵێ. تسیوس کەمتەرخەمی دەکات و مژدە و هەواڵی سەرکەوتنی خۆی لە شەڕی پڕخەتەری مینوتارو، بە بابی نادات. بابیشی خۆی دەکوژێت. تسیوس-یش دەبێ بە پاشای ئاتین.

دافنی Daphne:

یەکێکە لە حۆری و پەرییەکان کە ئاپولون حەزی لێدەکات، لێ دافنی خۆی لێ دەدزێتەوە. دافنی بۆ ئەوەی لە تاقیب و سۆراخی ئاپۆلون بە دوور بێ، دەبێ بە دار سەرووبەك (غار) کە ئاپۆلون بەداری خۆیی هەڵدەبژێرێ.

سورینکس- Syrnix:

کیژێکە کە پان "٩" Pan ئاشقی دەبێ، و ئەویش بۆ ئەوەی لە تاقیب و تاقیبکاری پان بە دوور بێ دەبێ بە قامیش. لەوە بە دواوە قامیش بۆ دروستکردنی نای و شمشاڵ بەکار دەهێنرێ.

فیلوملا- Philomela:

دۆتشایەکی (کیژە شا) ئاتینییە. تریوس Tereusی مێردی پروکنی Procne خوشکی، تەفرەی دەدات و دەستدرێژیی دەکاتە سەر. فیلوملا بە هاودەستی پروکنی خوشکی، ئیتولوسی Itylosای کوڕی تریوس و پروکنی دەکوژێت و دەرخواردی تریوس-ی دەدا. فیلوملا و پروکنی هەڵدێن و تریوس دەکەوێتە تاقیبیان خواوەندان-یش فیلوملا دەکەن بە بولبول و پروکنی بە پەرەسێلکە، و تریوس دەکەن بە باز.

میداس- Midas:

شای ئەفسانەیی لیدیایە کە پێداویستییەکانی میوانداری و پەزێرایی سیلنوس-ی Silenus هاونشینی دیونوسوس فەراهەم دەکات. دیونوسوس-یش لە بری ئەوە بەهرەیەکی دەداتێ کە دەست بەرهەرچییەکەوە بدات ببێ بە زێڕ.

لە ئەنجامدا خواردنەوە و خواردنی میداس-یش دەبێ بە زێڕ. ئیدی ناچار داوا دەکات کە لەم بەهرەیە رزگار بێ و داواکەی پەسند دەکرێ. پاشان میداس دەڵێ نەوا و دەنگی شمشاڵەکەی پان لە نەوا و ئاوازی چەنگەکەی ئاپولون خۆشترە، و لە سزای ئەمەدا گوێی گوێدرێژی لێدەڕوێت.

نیوبە- Niobe:

کیژی تانتالوس-ە، و دایکی چواردە منداڵە، نیوبە زۆر بە خۆی و بە ژمارەی منالەکانیەوە دەفشێ و پرکێشی ئەوە دەکات کە خۆی بەسەر لیتۆدا Leto، کە دایکی دوو منداڵە، واتە — ئارتیمیس و ئاپولون- با بدات و خۆی لەو بەگەورەتر بزانێ. لە سزای ئەم پرکێشییەدا هەموو منالەکانی نیوبە بە خواستی خواوەندان دەکوژرێن. نیوبە سەری خۆی هەڵدەگرێ و دەکەوێتە

کێوان و لە خەمباریدا هێندە بە کوڵ و بە دڵ دەگری دەبێ بە تاوێر. کانییەکی روون و هەمیشە رەوان لەم تاوێرەوە هەڵدەقوڵێ کە بە رەمز و هێمای فرمێسکەکانی نیوبە دا دەنرێ.

هرکولس (هراکلس) – Heracles،Hercules :

کوڕی زیوس و ئالکمیون-ە، هرکول رق و بەغیلی هیرا هەڵدەستێنێ، و هیرا دەیخاتە ژێر فەرمانی ئوریستیوس Eurystheusەوە، ئوریستیوس، دوانزە ئەرك و ماموریەتی سەخت و دژوار بەسەر هرکولدا دەدات:

١- کوشتنی شێری نیمە "١٠" Nemea.
٢- کوشتنی ئەژدیهای نۆسەر Hyera "١١".
٣- راوکردنی بەرازی ئارکادیا Arcadea "١٢"
٤- راوکردنی مامزی سرینی Cerynea "١٣"
٥- کوشتنی مەلانی دەریاچەی ستومفالیس "١٤" - Stymphalian.
٦- پاککردنەوە وماڵینی تەویلەکانی ئاوگیاس Augeas "١٥".
٧- راوکردنی گای کریت- Cretan buil "١٦".
٨- راوکردنی ماینەکانی دیومد Diomedes "١٧"
٩- هێنانی پشتێنەکەی هیپولیتە "١٨" - Hippolyta.
١٠- راوکردنی گایەکانی گریون "١٩" - Geryon.
١١- دزینی سێوە زێڕینەکانی هسپریدەکان Hesperides "٢٠".
١٢- هێنانی کربروس – Cerberus "٢١".

هیاکینتوس- Hyacinthus:

لاوێکی جوانە کە ئاپۆلون ئاشقی دەبێ. رۆژێك ئاپۆلۆن ئەڵقەیەکی ئاسنین تووڕ دەدات کە بەرێکەوت بەسەر هیاکیتوس دەکەوێ و دەیکوژێ، کە خوێنەکەی دەڕژێتە سەر زەوی، گوڵی سنبلی لێ دەڕوێ.

یاسۆن- Jason:

قارەمانێکی یونانییە کە بە یارمەتی و کۆمەکی ژنێکی جادووباز بە نێوی میدیا Medea، دەتوانێ خۆری "٢٢" زێڕین Golden fleece بە دەست بێنێ، و کە بە مەرامی خۆی دەگات ئەوسا میدیا بەجێدێڵێ.

## ئەفسانانی نورس (جەرمەنی)

ئەفسانانی خولقان:

پەیدا بوونی ئاسمان و زەوی

بە گوێرەی ئیداکان Eddas "٢٣"، بەرلەوەی کە ئاسمان یا زەوی دروست بن و بخولقێن، تەنیا یەك بیری بێ پایانی قوڵ، گینونگاگاپ- Ginungagap،... دنیایەکی تاریك و غوباراوی (نیفلهیم Niflheim)و دنیایەکی ئاگرین (موسپلهیم – Muspelheim) هەبووە. لە قوڵایی و جەرگەی نیفلهیم-ەوە، سەرچاوەیەك (ڤیرگلمیر- Vergelmir) هەڵدەقوڵێ، کە دوانزە ڕووباری لێ دەبێتەوە. ئەم ڕووبارانە دەڕژێنە ناو گینونگاگاپەوە، دەبن بە سەهۆڵ و بیرەکە پڕ دەکەنەوە. بای گەرمی موسپلهیم سەهۆڵەکان دەتوێنێتەوە، و تەم و مژێکی یەجگار زرۆ بەرپا دەبێ، ئەم تەمومژە ئیمیر Ymirی دێوە بەفرینە و ئەدهومبلا Audhumblaی مانگای لێ دەکەوێتەوە کە خواردنی سەهۆڵی سوێرە.

ڕۆژێك کاتێ کە ئەدهومبلا سەهۆڵەکان دەلێسێتەوە، بوری Bori دەردەکەوێ، بوری خواوەندێکە کە پاشان ژنێکی دێو نەژاد دەخوازێ و کوڕێکیان دەبێ بەناوی بور Bor، بور بابی ئودن Odin، ڤیلی Viliو ڤە Veیە، ئەم خواوەندە لاوانە ئیمیر دەکوژن. زەوی لە جەستەی ئەو دروست دەکەن، لە خوێنەکەی ئۆقیانوسان، لە ئێسکەکانی کێوان، لە مووەکانی درەختان، لە کاسەی سەری ئاسمانان، و لە مێشکی هەوران، و لە برۆکانیشی دیوارێك بە دەوری دەڤەری نێوان موسپلهیم و نیفلهیم دروست دەکەن، ئەم دەڤەرە شوراداره میدگارد Midgard، واتە پانتایی زەوییە، کە شوێنی ئایندەی ئادەمیزادە.

یگدراسیل – ygdrasil:

درەختێکی گەورەی زمانە چۆلەکەیە کە لە جەستەی ئیمیر-ەوە دەڕوێت و بەکۆڵەکەی جیهان دادەنرێ. ریشەیەکی ئەم درەختە بە میدگاردا ڕۆ دەچێ، ڕەگێکی دیکەی دەچێتە سەر بوتونهیم _ jotunheim ( مەڵبەندی دێوان)، و ڕەگی سێیەمی لە نیفلهیم-ەوە دەچێت بەو هیل helی ئارامگەی مردووان.

ڕێك لە ترۆپکی یگدراسیلدا، ئەسگارد Asgard واتە بارەگای خواوەندان هەیە. ئەم دەڤەرە بەسەر دوو ناوچەدا دابەش دەبێت: گلادسهیم Glad sheim (بارەگای یەزدانان) و ڤینگولف Vingolf (بارەگای ئیزەد خانمانە).

کۆشکانی ئاسمانی خودایان، تەنیا لە ڕێگەی بیفروست Bifrostەوە واتە لە ڕێگەی پردی پەلکە ڕەنگینەوە دەگاتە سەر زەوی. ئەم کۆشك و بارەگایانە هەر هەموویان لە زیو و زێڕ دروست کراون، و ڤالهالا Volhallaی کۆشکی ئودن لە هەر هەموویان جوانترە.

پەیدا بوونی خودایان:

میژووی ئەفسانانی نورس لە باسی بنچینە و ڕەنگ و ڕەگەما و ماڵباتی خودایاندا، نە تێروتەسەلی و نە ڕاشکاوی ئەفسانانی کلاسیك-یان نییە. خواوەندە سەرەکییەکانی نورس ئەمانەن:

ئودن- Odin(ودن Woden، ئەلفادور- Alfadun):

کوڕی بورو دێوەمێچکەیەکە، شای خواوەندانە.

فریگا- Frigga (فریکا Fricka): هاوسەری ئودن و مەلیکەی خواوەندانە.

تور- Thor:

کوڕی ئودون، بەهێزترین خوداوەندە. گورزێکی ئەفسوناویی هەیە کە پاش هەڵدانی بۆ سەر دوژمن دووبارە دەگەڕێتەوە، هەروەها کەمەربەندێکی هەیە کە هێز و توانای دوو چەنانە دەکات، هەروەها جووتێك دەستکێشی ئاسنینی هەیە کە کارایی گورزەکەی زیاد دەکات.

ڤیدار- Vidar:

کوڕی ئودونە، بەهێزترین خواوەندە لە دوای تور.

براگی- Bragi:

کوڕی ئودونە، خوای شیعر و شاعیرییە.

ئیدونا- Iduna:

هاوسەری براگییە، پاسەوانی ئەو سێوانەیە کە خواردنیان مایەی گەنجێتی هەمیشەیی خواوەندانە.

بالدر- Balder:

کوڕی ئودنە، خواوەندی ڕووناکی، بەهاران و شادییە.

هودر- Hodur:

هاوسەری ئودنە، خوای نابینای زستانە.

فریر-Feryr (فری-Frey): خواوەندی باران و فەڕ و بەرەکەت

فرییا- Freyia (فریا- Freya):

خوشکی فریرە، ئیزە[ خانی ئەڤینە، دۆستداری موسیقا، گوڵان، بەهاران و حۆری و پەرییانە.

تیر- Tyr (زیو- Ziu):

خواوەندی شەڕە.

هیمدال- Heimdall:

پاسەوانی خواوەندانە، پارێزەری سنوورەکانی سگاردە بۆ رێگەگرتن لە هێرشی ناگەهانی و کتوپڕی دێوان.

ڤالگیرەکان- Valkyries:

کیژانی ئودنن، چەکدار، جەنگاوەر، پاکیزە و ئەسپ سوارن،

ئەوانە بەردەوام بە مەیدانەکانی شەڕدا دەگەڕێن تا دلێرترین کوژراوان بۆ ڤاهالا ببەنەوە. ئەم قارەمانە کوژراوانە هەموو شەوێك لە گوشتی سریمنیر – Serimnir (ئەو بەرازەی کە هەموو بەیانییەك لێدەنرێ، بەڵام شەوێ زیندوو دەبێتەوە و وەکو خۆی لێدێتەوە). دەخۆن، قارەمانان بە رۆژەوە دەجەنگن و یەکدی بریندار دەکەن، بەڵام شەوێ برینەکانیان سارێژ دەبێتەوە.

پەیدابوونی ئادەمیزاد:

ئودن، ڤیلی و ڤیە، بەماوەیەکی کەم پاش دروستبوونی جیهان، پیاوێك لە درەختی زمانە چۆلەکە دروست دەکەن و ناوی دەنەن ئەسك- Ask. ئەوجا ژنێك لە داری نارەوەن دروست دەکن ناوی دەنەن ئیمبلا- Embla ئودن ژیان و گیان بەم بوونەوەرە تازانە دەبەخشێت، ڤیلی، ئەقڵ و جوڵەیان پێدەبەخشێت، ڤیە بەهرەی هەستەکان و توانای قسەکردنیان دەداتێ. میدگاردیش دەبێ بە مەیدانی ژیانیان. ئەم ژن و مێردە بە سەرچاوە و بنەچەکی نەژادی بەشەر دەژمێردرێن.

## ئەفسانانی بەناوبانگی دیکە

لوکی- Loki و منداڵەکانی:

بە گوێرەی ئەفسانانی نورس، لوکی لە نەژادی ئەهریمەنە و سەرچاوەی شەڕ و تاوانکارییە، ئەمە سێ فەرزەنی هەیە. یەکەمیان فنریس- Fenrisە، ئەمە گورگێکە کە لە ئەنجامدا خواوەندان بە زنجیرەی گلیپنر "٢٤" دەیبەستنەوە. دووەمیان میدگارد سرپنت Midgard

Serpentـە (حەزیا)یە کە ئودن توری دەداتە نـاو ئوقیانووسـی دەوری زەوی، ئـەم هەیولایـە هێندە زل و زەبەلاحە کە بە دەوری جیهاندا ئەلقە دەبەستێ.

سـێیەمیان هـیلا Helaیـە (مـەرگ)ە کـە ئـودن تـوری دەداتـە هـل-ەوە (ئارامگـەی مردووان)ـەوە.

دیواری سگارد:

خواوەندان بەڵێنی بەخشینی خۆر و مانگ و هەروەها زەوجینی فرییا بە کرێکارێـك دەدەن کە دیوارێك بە دەوری سگاردا دروست بکات و بەرلە هەوەڵی هاوین تەواوی بکات. خواوەنـدان کە هەستدەکەن کابرای کرێکار دەتوانێ کارەکە تـەواو بکـات، پـەنا وەبـەر لـوکی دەبـەن تـا فێڵێکی لێبکات. لوکی-ش ماینێك دێنێتـە بەرانبـەر سـڤادیلفاری- Svadilfariی ئەسـپی کابرای کرێکار، و ئەسپەکە یاخی دەبێ و کۆمـەکی کـابرای کرێکـار ناکـات و دەسـتبەرداری کارەکە دەبێ. ئەوجا کابرای کرێکار خۆی ئاشکرا دەکات و دەردەکەوێ کـە دێـوە، و دووبـارە دەچێتەوە پێستی دێو. لێ بە دەستی تور دەکوژرێ. گورزەکەی تور سەری دێوەکە پان دەکاتەوە و داغانی دەکات.

دزینی گورزەکەی تور:

تریم-ی Thrymی پاشای دێوە بەفرینان، گورزەکـەی تـور دەدزێ و دەیبـات لـە هەشـت مەتری قوڵایی یوتونهیم، واتە لە بارەگای دێواندا دەیشارێتەوە و دەڵـێ بـە مـەرجێ گورزەکـە دەداتەوە کە فرییا شووی پێ بکات. تور بە ئاماژەیەکی لوکی دەچـێتە پێـستی فرییـاوە و بـۆ یوتونهیم دەڕوات، و گورزەکە بە دەست دێنێتەوە و دیسان دەگەڕێتەوە پێستی خۆی، و تـریم و پەیڕەوەکانی دەکوژێت.

چوونی تور بۆ یوتونهیم:

تور، لوکی و تیالفیی –Thialfi پێشکاری تور، بە پیادە دەچن بۆ دیتن و سـەردانی بارەگـای دێوان. لە ڕێگەدا تووشی سکریمیر- Skrymir دەبن، پرخە پرخی ئەم دێوە بە جۆرێ تور پەریـشان و نارەحەت دەکات کە سێ جاران بە گورزەکەیـەوە پـەلاماری دێوەکـە دەدا تـا بیکوژێـت، بـەڵام گورزەکە کار لە دێوەکە ناکات. تور و هاوڕێکانی دەگەنە یوتگـارد Utgardی مەڵبەنـدی دێـوان. یوتگارد- لوگی شای دێوان، تور و هاوڕێکانی ناچار دەکات کـە بێتـە مەیـدانی چـەند شـەڕێکی تەنبەتەنەوە. لوکی لە پێشبڕکێیەکی خواردندا لە بەرانبەر لوگی دێودا دەبـەزێ، و تیـالفی-ش لـە پێشبڕکێی غاردانێدا لەبەردەم هوگی- Hugiی دێودا دەبەزێ. تور-یش هەوڵدەدات کە ئامـانێکی

پڕ لە خواردنەوە بە سێ قوم بخواتەوە، بەڵام ئەم کارەی پێناکرێ، پاشان دەیەوێ گورپەیەك لەسەر زەوی بەرز بکاتەوە، بەڵام تەنیا یەك پێی گورپەکەی پێ بەرز دەکرێتەوە. لە ئەنجامدا تور لە پێشبڕکێیەکی زۆرەبانیدا بە پیرەژنێك بە نێوی (ئیلی- Elli) دەدۆڕێ.

ئەوسا یوتگار- لوگی خۆی ئاشکرا دەکات، تومەز سکریمیرە و خۆی لێگۆڕیون و لەڕاستیدا گورزەکە بەر قەدپاڵی کێوەکە کەوتووە نەك بەر سەری ئەو، پێشبڕکێیەکانیش کۆمەڵە فەند و فێڵێك بوون و بەس. لوگی ئاگر بووە، هوگی بیر و ئەندێشە، ئامانەکەش دەریا بووە. گورپەکە میدگارسرپنت، و ئیلی-ش رۆژگار بووە. تور کە لەم فەند و فێڵانە تووڕە دەبێ، لێدەبڕێ گورزەکە بسرەوێنێتە لوکی، بەڵام پاشا و پەیڕەوانی پاشا و شارەکە هەموو لەبەرچاو ون دەبن.

شمشێرەکەی فرێر:

فرێر خاوەنی شمشێرێکی جادووییە کە لە مەیدانی شەڕدا رۆژی رووناك لە دوژمن دەکا بەشەو و خەرمانی جەستەی کوژراوان هەڵدەداتەوە. رۆژێك فرێر کە لەسەر تەختەکەی ئودن دادەنیشێت لە دووری دوورەوە و لە یوتونهیمدا، گیردا- Gerda کە کیژێکی جوانە دەبینێ، گیرۆدەی ئەشقی ئەو دەبێ و ئۆقرەی لەبەر دەبڕێ، فرێر بەڵێن بە پەیکەرەکەی خۆی، واتە سکرنیر- Skirnir دەدات کە ئەگەر بەو کیژەی بگەیەنێ شمشێرە جادووییەکەی دەداتێ، پەیکەکە ئەو کارە ئەنجام دەدا و شمشێرەکە بەدەست دێنێ.

مەرگی بالدر- Baldur:

بالدر لە نێو خواوەنداندا بڵاوی دەکاتەوە کە خەونی ترسناکی دیتووە و بەو زووانە کۆمەڵێك نسیبەت و بەڵای بەسەرا دێت، فریگا وەعد و بەڵێن لە هەموو بوونەوەرانی دنیا وەردەگرێ کە چ ئاسیوێك بەبالدر نەگەیەنن- تەنیا مویزك هیچ قەولێکی نەدا. ئەوسا خودایان هەرچییەکیان بەردەست دەکەوێ دەیسرەوێننە بالدر و دەکەونە کایە و گەمان، و بالدر-یش هیچ ئازارێکی ناگاتێ. هودر کە نابینایە لەم گەمەیەی خوایاندا بەشداری ناکات و قاییل دەبێ کە لوکی لە جیاتی ئەو مویزەکەکەی بهاوێ. لوکی سەری بالدر دەکا بە نیشانە. مویزەکەکە بەر نیشانەکە دەکەوێ و بالدر دەمرێ، هیرمود- Hermod کە لە هەموو خواوەندەکان گورج و گۆڵترە، بە سواری ئەسپەکەی ئودن، واتە بە سواری سلیپ نیر- Sleip nir بۆ هەل دەڕوا تا داوا لە هیلابکات کە رێگە بدات بالدر بۆ سگارد بگەڕێتەوە. خواوەندی مەرگ داواکە قەبووڵ دەکات- بەومەرجەی کە هەموو بوونەوەرانی دنیا بۆ بالدر بکەونە شین و گرین. هیرمود واریقاتی سەفەرەکەی خۆی بۆ خواوەندان دەگێڕێتەوە، هەر هەموو گیانداران و بێ گیانان شین و

گرین بۆ بالدر قەبووڵ دەکەن، تەنێ توك- Thokی پیرەژنی سیحرباز نەبێ (کە لە بنچینەدا لوکییە و خۆی گۆڕیوە).. بالدر لە هلدا دەمێنێتەوە، جەنازەکەی بالدر بە کەشتییەکەی ئەو، واتە بە هرینگهام- Heringham دەبەن و ئاگری تێ بەردەدەن.

خواوەندان لوکی سزا دەدەن و کۆت و زنجیری دەکەن و مارێکی بەر دەدەنە گیان کە تا ئەبەد هەر بەسەروچاوییەوە بدات. سیگونای- Siguna هاوسەری لوکی، بەردەوام ژەهری مارەکەی لێدەگرێ و دەیکاتە فینجانێکەوە، بەڵام کە فینجانەکە خاڵی دەکاتەوە، ژەهرەکە دەچێتەوە سەروچاوی لوکییەوە، لوکی-ش لە تاو ئازار و ژان بە جۆرێ دەتلێتەوە کە زەوی دێنێتە لەرزە.

راگناروك (ئاوابوونی خودایان):

خەڵکی نورس-ی کۆن باوەڕیان وابوو کە ئاقیبەت رۆژێك دێت کە هەموو دنیا نابوت دەبێ و نامێنێ، پاش شەش زستانی تووش، زەوی دەکەوێتە لەرزە، دەریا وشك دەکات، ئاسمان دەبێ بە دوو لەتەوە، زۆربەی هەرە زۆری بنیادەمان دەمرن. لوکی و فنریس کۆت و زنجیرەکانیان دەپچڕێنن، و لەگەڵ میدگاردسرپنت، دێوە بەفرینان، و دانیشتووانی هیل و موسپلهیم، بەسەر پردی بیفروستدا ((پەلکە رەنگینە)) دەپەڕنەوە بۆ مەیدانی شەڕی ڤیگرید- Vigridو لەگەڵ خودایاندا دەست بە دوا شەڕ و جەنگی یەکجارەکی دەکەن. فنریس، ئودن دەکوژێت و بە خۆشی بە دەستی ڤیدار- Vidar دەکوژرێ.

تور و میدگاردسرپنت یەکتر دەکوژن، و لوکی و هیمدال-یش یەکدی لە ناو دەبەن. سرتور- Surtur، فریر-ی پێشەوای دانیشتووانی موسپلهیم دەکوژێت و ئەوجا سەرانسەری جیهان لە بڵێسەی ئاگردا غەرق دەکات. خۆر تاریك دەبێ، زەوی غەرقی دەریا دەبێ، ستێران رادەخوشن و دەکەون و زەمەن و کات دەوەستێت. ئەوسا بە فەرمانی ئیلفادرۆ (خوای باڵا دەستی ئودن) ئاسمان و زەوییەکی تازە لە دەریاوە پەیدا دەبن، و سەردەمی شادی و نیعمەت، بەدەر لە هەژاری و گوناه دێت، بنیادەمان و خودایان بە خۆشی و شادی دەژین.

# زێدەران:

١- تارتاروس- Tartarus: بە گوێرەی ئەفسانانی یونانی بیرێکی زۆر قوڵ و تاریکە لە ژێر هادیسدا.

٢- ئولەمپ- Olympus:

زنجیرە چیایەکە لە باکووری یونان کە لوتکەکەی بەرزترین شوێنە لە یوناندا.

٣- تسالی- Thessaly:

ناوچەیەکە لە بەشی باکووری یۆناندا.

٤- ئاتالانتە- Atalanta:

مەرجی شووکردنی ئاتالانتە ئەوە دەبێ کە خوازبێنی کەرەکەی لە پێشبڕکێی غاردانێدا براوە بێ. هیپومنس سێ سێوی زێڕین لەسەر رێگەی پێشبڕکێیەکە دادەنێ، ئاتالانتە بەهۆی سەرقاڵی بە هەڵگرتنەوەی سێوەکانەوە دوا دەکەوێ و پێشبڕکێیەکە دەدۆڕێنێ.

٥- کالیدون- Calydon:

شارێکە لە باشووری یونان، کە خەڵکی شار لە رێورەسمی قوربانیدا درێغی دەکەن، ئارتیمس بەرازێك رادەسپێرێ بۆ وێرانکردنی شارەکە.

٦- کالیوپە- Calliope:

بە گوێرەی ئەفسانانی یونانی، خواوەندی شیعری حەماسییە.

٧- ئاریادنە- Ariadne:

شازادە خانمێکی کریتییە، کیژی مینوس و پاسیفائییە.

٨- مینوتاور- Minotaur:

هەیولایەکی سەیرە کە بە بەدەن ئادەمی و بەسەر گایە.

٩- پان- Pan:

بە گوێرەی ئەفسانانی یونانی خواوەندی شوانکاران و راوچییانە.

١٠- نیمە- Nemea:

شارێکە لە یونانی کۆندا کە هیرا شێرێکی پۆلایین بۆ وێرانکردنی دەنێرێ.

١١- ئەژدیهای نۆ سەر- Hydra:

ئەژدیهایەکی سەیرە کە نۆ سەری هەیە، و ئەگەر سەرێکی ببڕی، دوو سەری دیکەی لە شوێن دەڕوێتەوە.

١٢- ئارکادیا- Arcadea:

ناوچەیەکە لە یۆنانی کۆندا، کە بەرازێکی ترسناك لە کەنار رووبارەکەیدا دەژیا.

١٣- مامزی سرینی- Cerynea:

ئەم مامزە (ئاسکی مێچکە) لە زۆزانەکانی سرینیدا دەژیا و وەقفی ئارتیمیس بوو، بۆیە کوشتنی ئەو مامزە بەکوفر دەژمێردرا.

١٤- ستومفالیس- Stymphalian:

دەریاچەیەکە لە ئارکادیا کە لە بێشەکانی دەوروبەریا مەلانی بنیادەخۆر دەژیان.

١٥- ئاوگیاس- Augeas:

پاشایەك بوو کە ٣ هەزار جوانەگای هەبوو و تەویلە و گەوڕەکانی بۆ ماوەی سێ ساڵان پاك نەکرابوونەوە.

١٦- گای کریت- Cretan Bull: –

گایەکی سەیرە کە رۆژێ لە دەریاوە دێتە دەرێ و مینوس بەڵێن دەدات کە لە رای پوسیدوندا بیکات بە قوربانی، پاشان ژێوان دەبێتەوە و گایەکە دەنێرێ بۆ ناو گاگەلەکەی خۆی. پوسیدون تۆلە دەکاتەوە و گایەکە دەکا بە گایەکی سەرکێش و تورە.

١٧- دیومد- Diomedes:

یەکێکە لە شاهانی تراکیە، کە ئەسپەکانی خۆیان لە گۆشتی بنیادەم ئالیك دەدا.

١٨- هیپولیتە- Hippolyta:

مەلیکەی دەڤەری ئامازۆنییەکان بووە، ئارس کەمەربەندێکی ئەفسوناوی دەداتێ تا نیشانەی توانا و دەسەڵاتی وی بێ بەسەر خەلکی وڵاتەکەیدا.

١٩- گریون- Geryon:

یەکێکە لە دێوە سێ سەرەکان و خودان چەندین گەلە گاگەلەکە جگە لە گاوان سەگێکی گەورەش پاسەوانییان دەکات.

٢٠- هسپریدەکان- Hesperides:

سێ خواوەندی شەون کە بە کۆمەکی ئەژدیهایانی سەد سەر، پاسەوانی باخی سێوی زێرینی هیرا، لە بناری کێوی ئەتڵەسدا دەکەن.

٢١- کربروس- Cerberus: سەگێکی سێ سەری کلك ئەژدیهایە، کە پاسەوانی دەروازەی هادیس دەکات.

٢٢- خوری زێرین- Golden fleece

خورییەکی سیحرناسای بەرانێکە کە لەبەر دەستی ئایتس-ی شای کولخیسدایە و ئەژدیهایەك نیگابانی دەکرد.

٢٣- ئیداکان- Eddas:

کۆمەڵە سەرچاوەیەکی ئەفسانانی ئەسکەندیناڤی و ئیسلەندین بۆ سەدەی سیازدەیەم دەگەڕێنەوە.

٢٤- گلیپنر- Gleipner:

زنجیرێکە لە دەنگی پێی گوربە، کاکڵەی بەرد، هەناسەی ماسی، هەستیاری ورچ، و تفی مەلان دروستکراوە.

## سەرچاوە:

* تاریخ ادبیات جهان (جلد اول) بوکنر، ب- تراویك/ عربعلی رضائي/ و يراستار: سعيد حميديان
* چاپ اول: ١٣٧٣، تیراژ: ٣٠٠٠ نسخه.

## حەمە کەریم عارف

- کەرکووکییە و لە ساڵی ١٩٥١دا لەدایك بووە.
- لە ساڵی ١٩٧٥ کۆلێژی ئەدەبیاتی بەغدای تەواو کردووە.
- یەکەم بەرهەمی شیعرێکە بەناوی (هەڵبەستێکی هەتیو کەوتوو) کە لە ژمارە (١٧٠) ڕۆژنامەی هاوکاری ساڵی ١٩٧٣ بڵاوبووەتەوە.
- لە ساڵی ١٩٧٦ەوە بە بەردەوامی نووسین و بەرهەمی ئەدەبی بڵاو دەکاتەوە.
- سەرنووسەر یان بەڕێوەبەری نووسین یان سکرتێری نووسین یان ئەندامی دەستەی نووسەرانی ئەم گۆڤار و بڵاوکراوانە بووە: گۆڤاری گزنگی نووسەرانی کەرکووك، نووسەری کوردستان، کەلتوور، نووسەری کورد، گوڵانی عەرەبی، ئاڵای ئازادی تا ژمارە ٢٢٢٠٠، گۆڤاری نەوشەفەق.
- جگە لە ناوی خۆی، بە تایبەتی لە گۆڤاری گزنگی نووسەرانی کەرکووك، نووسەری کوردستان، کەلتوور، ڕۆژنامەی ئاڵای ئازادی تا ژ: ٢٢٢ بەناوی گۆڤەند، زنار، سیپان، پاکزاد، محەمەدی حاجی، سیروان عەلی، دیدار هەمەوەندی، هێژا، ح. ع بەرهەمی بڵاو کردۆتەوە.
- جگە لە پارتی دیموکراتی کوردستان و یەکێتیی قوتابیانی کوردستان ئیدی ئەندامی هیچ حیزب و ڕێکخراوێکی سیاسی نەبووە، لە ساڵی ١٩٧٤ – ١٩٧٥دا پێشمەرگەی شۆڕشی ئەیلوول بووە، لە هەشتاکاندا بۆ ماوەی نۆ ساڵ، بێ وابەستەگی حیزبی، پێشمەرگە بووە و وەکو بەشدارییەکی مەیدانی و ویژدانی لە خەباتی ڕەوای نەتەوەی کورددا شانازی پێوە دەکات و منەت بەسەر کەسدا ناکات، چونکە باوەڕی وایە کە ڕۆڵەی میللەتی مەزلوم مەحکومە بە پێشمەرگایەتی.
- لە هەشتاکانەوە تا ئێستا ڕاستەوخۆ سەرپەرشتی و سەرۆکایەتی لقی کەرکووکی یەکێتیی نووسەرانی کوردی کردووە.

• زۆر بەرهەم و کتێبی چاپ و بڵاو کردۆتەوە، لێ زۆربەی هەرە زۆریان، بە تایبەتی ئەوانە لە چیادا چاپ بوون بە نوسخەی هێندە کەم بڵاو بوونەتەوە، لە نرخی نەبوو دان و هەر ئەوەندەیە کە لە فەوتان رزگار بوون. هەندێك لە وانە:

١- تیرۆژ، کۆ چیرۆك، چاپی یەکەم ١٩٧٩.
٢- کۆچی سوور، رۆمان، چاپی یەکەم ١٩٨٨.
٣- بەیداخ، چیرۆك، ١٩٨٨.
٤- داوەتی کۆچەرییان، کۆ چیرۆك چاپی دووەم ٢٠٠٥.
٥- لە خۆ بێگانە بوون، کۆمەڵە چیرۆك، چاپی یەکەم (١٩٩٩) دەزگای گوڵان.
٦- کوچ سرخ، کۆ چیرۆك، بە فارسی، وەرگێران چاپی یەکەم ١٩٨٧ شاخ.
٧- نینا، رۆمان، سابت رەحمان، دوو چاپ، شاخ، شار ٢٠٠٢.
٨- نامۆ، رۆمان، ئەلبێر کامۆ، دوو چاپ، شاخ، شار ٢٠٠٣ دەزگای ئاراس.
٩- رێبەر، رۆمان، مەهدی حسین، یەك چاپ (شاخ) .
١٠- شکست، رۆمان، ئەلکساندەر فەدایەف، چاپی شاخ (راە کارگر) .
١١- هاوماڵەکان، رۆمان، ئەحمەد مەحمود، دوو چاپ، شاخ، شار ٢٠٠٠ گوڵان.
١٢- بێناسنامەکان، رۆمان، عەزیز نەسین، ٣ چاپ شاخ، شار ٢٠٠٣.
١٣- قوربانی، رۆمان، هیرب میدۆ، چاپی یەکەم ٢٠٠٤ دەزگای شەفەق.
١٤- دوورە وڵات، رۆمان ع. ڤاسموف، چاپی یەکەم ٢٠٠٠ دەزگای گوڵان.
١٥- ئازادی یا مەرگ، رۆمان، کازانتزاکیس، چاپی یەکەم ٢٠٠٣ کتێبخانەی سۆران.
١٦- چیرۆکەکانی سەمەدی بیهرەنگی، دوو چاپ، شاخ، شار ٢٠٠٤ کتێبخانەی سۆران هەولێر.
١٧- ئامانجی ئەدەبیات. م. گۆرکی، چاپی شاخ ١٩٨٥.
١٨- دلێریی خۆراگرتن، ئەشرەفی دەهقانی، چاپی شاخ.
١٩- مەسەلەی کورد لە عێراقدا، عزیز شەریف.
٢٠- مێژووی رەگ و رەچەڵەکی کورد، ئیحسان نوری پاشا، یەك چاپ.
٢١- خەباتی چەکداری هەم تاکتیکە هەم ستراتیژ، مەسعودی ئەحمەد زادە، چاپی شاخ.
٢٢- کورد گەلی لە خشتەبراوی غەدر لێکراو، د. کوینتەر دیشنەر، چاپی سێیەم ٢٠٠٤ دەزگای ئاراس.
٢٣- لە مەهابادی خوێناوییەوە بۆ کەنارێن ئاراس، نەجەف قولی پسییان.
٢٤- گوزارشتی مۆسیقا، د. فؤاد زەکەریا.

٢٥- دەربارەی شیعر و شاعیری، رەزا بەراهەنی.
٢٦- ڤنسنت ڤان گوگ، شانۆنامە، باول نایز لەر.
٢٧- بە دوعا شاعیرەکان، شانۆنامە، جەلیل قەیسی (گزنگ ژ:١٢) .
٢٨- جولەکەکەی مالّتا، شانۆنامە، مالرۆ.
٢٩- دادپەروەران، شانۆنامە، ئەلبیر کامۆ.
٣٠-بەد حالّی بوون، شانۆنامە، ئەلبیر کامۆ.
٣١- چاو بە چاو، شانۆنامە، گەوهەر مراد (غولاّم حوسەینی ساعیدی) .
٣٢- ریچاردی سێیەم، شانۆنامە، شەکسپیر.
٣٣- گەمەی پاشا و وەزیر، شانۆنامە، عەبدوللاّئەلبوسێری.
٣٤- کورد لە ئەنسکلۆپیدیای ئیسلام دا، چاپی یەکەم ١٩٩٨ وەزارەتی رۆشنبیری.
٣٥- هونەر و ژیانی کۆمەلاّیەتی، پلیخانۆڤ، چاپی یەکەم ٢٠٠٥ دەزگای موکریانی.
٣٦- پێکهاتەی بەدەنی و چارەنووسی ئافرەت، ئیڤلین رێید.
٣٧- لێکدانەوەیەك لە مەرِ نامۆ، لویس ربی.
٣٨- مندالّە دارینە، چیرۆکی درێژ بۆ مندالاّن.
٣٩- فاشیزم چیی؟ کۆمەلّە چیرۆك بۆ مندالاّن، یەلماز گونای.
٤٠- شوانە بچکۆلەکە، چیرۆکێکی درێژی چینییە بۆ مندالاّن.
٤١- زارۆکستان (چوار شانۆنامە بۆ منالاّن).
٤٢- لە گەنجینەی حیکایەتی تورکمانییەوە.
٤٣- کۆمەلّێك ئەفسانەی جیهانی (٢٣ ئەفسانە).
٤٤- زیندە خەون کۆمەلّە چیرۆکی چیخوف، چاپی یەکەم (٢٠٠١) دەزگای موکریانی.
٤٥- ئەفسانەێن گریکی و رۆمانی، چاپی یەکەم (٢٠٠٤) کتێبخانەی سۆران، هەولێر.
٤٦- جیّ پیّ، کۆمەلّێك چیرۆکی فارسی چیرۆکنووسان: (سادقی هیدایەت، جەلال ئال ئەحمەد، بوزرگی عەلەوی، سادقی چوبەك، مەنسوری یاقوتی).
٤٧- چیرۆکستان، کۆمەلّێك دەق و رەخنە، چاپی یەکەم ٢٠٠٥ نووسەرانی کەرکووك.
٤٨- چۆنیەتی فێربوونی زمانی فارسی، چاپی یەکەم (٢٠٠٠) حەمە کەریم عارف.
٤٩- گۆڤەند و زنار (فەرهەنگی فارسی- کوردی) حەمە کەریم عارف.
٥٠- پەلکە رەنگینە، حەمە کەریم عارف، چاپی یەکەم (٢٠٠٤) وەزارەتی رۆشنبیری.
٥١- کۆمەلّێك چیرۆکی بێگانە.

٥٢- چزیشفسکی، فەیلەسووف و زانای گەورەی میللەتی روس.
٥٣- چایکۆفسکی، ژیان و بەرهەمی.
٥٤- ئیدگار ئالین پۆ، ژیان و بەرهەمی.
٥٥- جاك لەندەن، ژیان و بەرهەمی.
٥٦- گوگول، نووسەری ریالیست.
٥٧- یەڵماز گونای، ژیان و بەرهەمی.
٥٨- سادقی هیدایەت، ژیان و بەرهەمی.
٥٩- خاتو فروغ لە شیعر دەدوێ، ژیان و بەرهەمی.
٦٠- ڕێبازە هونەرییەکانی جیهان
٦١- ریالیزم و دژە ریالیزم لە ئەدەبیات دا، چاپی یەکەم (٢٠٠٤) دەزگای سپیرێز.
٦٢- راگەیاندن لە پەراوێزی دەسەڵاتدا (بە شەریکی) چاپی یەکەم (٢٠٠١) دەزگای گوڵان.
٦٣- راگەیاندن لە نێوان حەقیقەت بێژی و عەوام خەڵەتێنی دا، حەمە کەریم عارف
٦٤- دیدار و دەق و رەخنە.
٦٥- دیداری چیرۆکڤانی.
٦٦- قوتابخانە ئەدەبییەکان، رەزا سەید حوسەینی.
٦٧- ناودارانی ئەدەب، حەمە کەریم عارف.
٦٨- هەزار تۆپی شیعری نوێخوازی و چەند باسێکی دی، حەمە کەریم عارف.
٦٩- کورد لە سەدەی نۆزدە و بیستدا، کریس کۆچرا، چاپی یەکەم ٢٠٠٣ کتێبخانەی سۆران.

* لە راپەڕینەوە تا ئەوو چالاکانە بەشداری بزاڤی ئەدەبی و رۆشنبیریی کوردی دەکات و بەرهەمی هەمە جۆر (نووسین و ئامادە کردن و وەرگێڕان) بڵاو دەکاتەوە..

* ئەو بەرهەمانە و زۆری دیکەی ئامادەن بۆ چاپ و چاپکردنەوە و هەر کەس و گرووپ و لایەن و دەزگایەك تەماحی بڵاو کردنەوەی هەبن، ئامادەیە بە خۆڕایی پێشکەشیان بکات و...

٧٠- مێژووی ئەدەبیاتی جیهان (لە کۆنەوە تا سەدەکانی ناڤین).
٧١- مێژووی ئەدەبیاتی جیهان (لە سەردەمی رینیسانسەوە تا ئێستا).
٧٢- مێژووی ئەدەبیاتی جیهان (ئەدەبیاتی ئینگلیزی زمان- ئەمریکا و ئینگلیستان لە سەرەتاوە تا ئێستا).